# ڕەوتی ئیسلامی

## لە باشووری کوردستان

## ١٩٤٦-١٩٩١

توێژینەوەیەکی مێژوویی لە کارو چالاکیی
پارت و کۆمەڵە ئیسلامییەکان

ئیدریس سیوەیلی

چاپی دووەم

بۆی زیاد کراوە





# ڕەوتی ئیسلامیی
# لە باشووری کوردستان
# ١٩٤٦ - ١٩٩١

توێژینەوەیەکی مێژوویی لە کارو چالاکیی پارت و
کۆمەڵە ئیسلامییەکان

ئیدریس سیوەیلی

چاپی دووەم

بۆی زیادکراوە

٢٠٠٩ زایینی ١٤٣٠ کۆچی

ناوی کتێب: ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان ١٩٤٦ ـ ١٩٩١
نووسەر: ئیدریس سیوەیلی
نەخشەسازی بەرگ: شێرکۆ خانزادی
نەخشەسازی ناوەوە: نووسەر
ژمارەی سپاردن: ١٥٥٧ ساڵی ٢٠٠٩
ساڵی چاپ: ٢٠٠٩
چاپ: دووەم

بسم الله الرحمن الرحيم

(( فَبَشِّرْ عِبَادِ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ))

الزمر (١٧ - ١٨)

**پێشکەش بێت بە:**

نەوەی نوێ بەڵکو پەند لە ڕووداوو ئاڵوگۆڕەکانی مێژوو وەرگرن.

# سوپاس و پێزانین

- سوپاس بۆ (م. سەلاح كانەبی، د. یاسین سەردەشتی، م. ئاكۆ شوانی، م. نەریمان عەبدوڵڵا) مامۆستا لە بەشی مێژوو لە زانكۆی سلێمانی.

- سوپاس بۆ (كاك تۆفیق كەریم) هاوكاری و كارئاسانی زۆری بۆ كردم.

- سوپاس بۆ (هەژار حاتەم، ئارام عەلی سەعید، موحەممەد شارباژێڕی، ئیبراهیم موحەممەد عەزیز، م. ئەبوبەكری سدیقی، ئەكرەم فەرەیدون، حەیدەر جەمیل جاف، ئەحمەد ڕەنجیار، كامیل مەحمود، كامەران بابان زادە، سدیق ساڵح، سۆران عیزەت، شەریف وەرزێر، ڕێبوار حەمەد خدر، سەلاح سالار، هێرش عومەر، ئەنوەر سەنگاوی، ڕێدار ئەحمەد، ماجد عەبدوللەتیف، جەمال موحەممەد ڕەشید) هەریەكەو بە جۆرێك هاوكاریان كردم.

- سوپاس بۆ بەڕێزان ( م. موحەممەد ڕەئوف، م. ئەحمەد كاكە مەحمود، م. عەلی عەبدولعەزیز، م. عەبدولستار مەجید، م. جەعفەر مستەفا، كاك مەسعود عەبدولخالق، م. مەولود باوەموراد، م. هیوا میرزا سابیر، م. سوبحی داودی، شێخ موحەممەد بەرزنجی، م. حەسەن بابەكر، م. سدیق عەبدولعەزیز، م. حەسەن شەمێرانی، م. بورهان موحەممەد ئەمین، حاجی ئەحمەد عەبدوڵڵا دەلاك م. عەلی باپیر، م. سەلاحەددین موحەممەد) بە چاوپێكەوتن و زانیاریەكانیان توێژینەوەكەیان دەوڵەمەند كرد.

# پێڕست

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

## لیستی نیشانه و هێما کورتکراوه بەکارهێنراوەکانی توێژینەوەکە

ب. ش = بێ شوێنی چاپکردن

ب. م = بێ مێژوی چاپکردن

ل = لاپەڕە

ز = زاینی

ك = کۆچی

هـ = کۆچی ( له سەرچاوه عەرەبییەکاندا)

ئا = ئامادەکردنی

لە = وەرگیراوه له

# قسەیەك بۆ مێژوو

چاپکردنەوەی کتێبی رەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان لە کاتێکدایە کە زیاتر لە سێ ساڵ بەسەر چاپی یەکەمیدا تێدەپەڕێت، هەڵبەتە لەو ماوەدا وێڕای ئەوەی بووە سەرچاوەیەکی رەسەن بۆ چەندین توێژینەوەی مێژوویی‌و نامەی ماستەر، هاوکات لەلایەن خوێنەرانیشیەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکراو هەر زوو کتێبەکە لە بازاڕدا نەماو داوا دەکرا چاپ بکرێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لەو ماوەدا لە چەندین رۆژنامەو گۆڤار خوێندنەوەی بۆ کراو سەرنج و تێبینی لەبارەوە خرایە ڕوو، لە ناو ئەوانەشدا خوێندنەوەکەی مامۆستا کامەران بابان زادە کە لە رۆژنامەی میدیا بە چوار ئەڵقە سەرنج‌و تێبینیەکانی خستەڕوو، لە هەمووان چڕوپڕتر بوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بە تەلەفۆن و نامە چەندین دەستخۆشیم پێگەیشت، کاك عەبدوڕڕەحمانی مامۆستا مەلا عوسمان نامەیەکی درێژی (٣٤) لاپەڕەیی بۆ ناردم کە تێیدا کۆمەڵێك سەرنج‌و رەخنەی لەخۆگرتبوو. هەرچەندە بەڕێزیان لە نامەکەیدا ئاماژەی بە هەندێ جومگە دابوو ئاماژەشی بەوە دابوو کە لەو بارەوە بەڵگەنامەی لایەو هاوکاریم دەکات، منیش داوام لێکرد بەڵگەنامەم بداتێ و هەر زانیاریەکی هەڵەش لە چاپی یەکەمدا تۆمار کرابێت ئامادەم راستی بکەمەوە، بەڵام بەداخەوە سەرەڕای چاوەڕوانیەکی زۆر دواجار کاك عەبدوڕڕەحمان ئاگاداری کردم کە بەهۆی نۆژەنکردنەوەی خانوەوە بەڵگەنامەو کەرەستەکانی بەردەست نین و ناتوانێت هاوکاریم بکات.

هەڵبەتە لەو ماوەشدا بەردەوام سەرقاڵی پێداچوونەوەو پەیداکردنی بەڵگەنامەو سەرچاوەی نوێ بووم تا لە چاپی نوێدا کتێبەکە تەواوترو دەوڵەمەندتر بێت، بەخۆشحاڵیەوە بەرهەمی ئەو هەوڵانە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێك بوو لەگەڵ مامۆستا سەلاحەددین موحەممەدو پەیداکردنی (٢٠) بەڵگەنامەی نوێ کە لەم چاپەدا بڵاوکراونەتەوە، لەگەڵ چەند کتێب‌و نامەی ماستەرو تێزی دکتۆرای زانکۆکانی عێراق، کە تێکڕا بوونە سەرچاوەیەکی یارمەتیدەر بۆ چاپی نوێی ئەم کتێبەو پڕکردنەوەی بەشێکی زۆری کەموکورتییەکان‌و راستکردنەوەی هەندێك ناتەواوی.

له سەرەتای ساڵی (٢٠٠٩)شدا له ڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنییەوە پەیوەندیم کرد بە مامۆستا کرێکارەوە، داوام لێکرد دەربارەی چەند مەسەلەیەکی مێژوویی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا بکەم، دیاربوو مامۆستا کرێکار کتێبەکەی خوێندبوویەوە، بۆیە له وەڵامی نامەکەمدا سەرەڕای ئەوەی وەسفێکی زۆری کتێبەکەی کردبوو ئامادەیی تەواوی نیشاندا بۆ چاوپێکەوتن، منیش ڕۆژی (٢٠٠٩/٢/٣) بە پۆستی ئەلیکترۆنی پرسیارەکانم بۆ نارد، بەڵام دوای تێپەڕبوونی سێ مانگو نیوو بەسەر ناردنی پرسیارەکاندا مامۆستا نامەیەکی بۆ ناردم کە وەڵامی پرسیارەکان ناداتەوە، هەڵبەتە له ماوەی ئەو سێ مانگو نیوەدا چەند جارێك پەیوەندیم بە مامۆستاوە کردو داوای وەڵامدانەوەم لێدەکرد، مامۆستاش هەموو جارێك دووپاتی دەکردەوە کە بە دڵنیاییەوە وەڵامم دەداتەوە، بەڵام بەهۆی سەرقاڵیەوە دوای خستووە، دیارە بەلای منەوە ئەو پاساوە زۆر لاوازە چونکە لەو ماوەدا زیاتر له (٢٠) چاوپێکەوتنی مامۆستا کرێکار له ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردستان بڵاوکراوەتەوە، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی دوو کاتژمێریش دابنێ بۆ وەڵامی پرسیارەکانی ئێمە، پێموایە ناوەڕۆکی پرسیارەکانم ناوبراوی ئیحراج کردبوو، بۆیە وەڵامی نەدەدامەوە، چونکە ئەو ئێستا هەڵوێستێك دەنوێنێت کە تەواو پێچەوانەی رابردووی خۆیەتی، وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی منیش زیانی بۆ هەڵوێستە سیاسییەکانی ئێستای هەبوو. بەڵام نەیدەزانی چۆن وا له من بکات دەستبەرداری وەڵامەکەی ببمو گلەیشی نەچێتەسەر.

هەروەکو پێشتریش جارێك چوومە لای مامۆستا عەبدوڕڕەحمان نەورەسیو داوای چاوپێکەوتنێکم لێکردبوو، دوای چاپی یەکەم جارێکی تر هەمان داوام له ناوبراو کردەوە، بەڵام ئەمجارەش بە بیانووی ئەوەی سوێندی خواردووە کە هیچ باس نەکات ئامادەنەبوو هیچ زانیاریەکمان بداتێ، هەڵبەتە نەورەسی یەکێکە له دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی پەیوەندیو له نزیکەوە ئاگاداری ڕووداوەکان بووە، بۆیە خۆدزینەوەی له پێدانی زانیاری دەربارەی ئەو قۆناغە هەستیارە دەیخاتە بەردەم بەرپرسیاریەتیەکی مێژووییەوەو ناکرێت هەروا بە سادەیی لێی بڕوانێت.

له چاپی یەکەمدا، بە هۆی کۆنی بەڵگەنامەکان‌و خراپی چاپەوە بەڵگەنامەکان زۆر کاڵ دەرچوو بوون، کە زۆر جار نەدەخوێندرانەوە، بۆیە لەم چاپەدا تەواوی ئەو بەڵگەنامانەی کاڵن و بە باشی ناخوێندرێنەوە تایپکراون، بۆ پارێزگارکردن لە ئەمانەتی زانستی‌و بەهای مێژوویی بەڵگەنامەکانیش دەستکاری ڕێنووس‌و خاڵبەندی نەکراوەو بە هەمان ئەو شێوازەی بەڵگەنامەکەی پێ نووسراوە تایپکراون، بە ئومێدی ئەوەی توانیبێتمان ئەرکی سەرشانمان لە پاراستنی ڕووی ڕاستەقینەی مێژوو بەجێهێنابێت‌و خزمەتێکمان کردبێت.

**ئیدریس سیوەیلی**

**سلێمانی**

**٢٠٠٩/٦/٢**

# پێشەکیی

ئەمڕۆ لە باشووری کوردستان چەندین تەوژمو پارتی ئیسلامیی بوونیان هەیە، وێڕای چەندین خەسڵەتی هاوبەش لە نێوان ئەو تەوژمو پارتانەدا، هاوکات هەریەکەیان خاوەن تایبەتمەندیو دیدو تێڕوانینی خۆیەتی، ئەو بزووتنەوانە لە ماوەی چەند ساڵی رابردوو بەشێك بوون لە رەوشی رامیاری باشووری کوردستان، زۆرجاریش ئەو پرسیارە دەوروژێنرێ کە ئاخۆ ئەم گروپە ئیسلامییانە لە چ قۆناغێکی مێژوویی باشووری کوردستان سەریان هەڵداوە؟ سەرچاوەی فکریو پەروەردەییان چییە؟ پێگەیان لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا چییە؟ دیدو تێڕوانینیان لەمەڕ دۆزی نەتەوەی کورد چییە؟ ئەمانەو گەلێ پرسیاری دی لە واقیعی ئەمڕۆی کوردستان ئامادەییان هەیەو پێویسیان بەوەلامە.

بێگومان ئامادەیی رەوتی ئیسلامیی تایبەت نییە بە گۆرەپانی کوردستان، بەڵکو ئەو دیاردەیە کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی تێپەڕاندوەو تەواوی جیهانی گرتۆتەوە، لە سەرانسەری جیهاندا دەیان زانکۆو پەیمانگاو دامەزراوەی ئەکادیمی گرنگی تایبەت بەو دیاردەیە دەدەنو توێژینەوەی لەبارەوە دەکەن، بەلام لە کوردستان تا ئێستا گرنگی بەو دیاردەیە نەدراوە، دامەزراوەی ئەکادیمی تایبەت بەو بوارە نەکراوەتەوە، توێژینەوەی بابەتیو زانستی لەبارەوە ئەنجام نەدراوە، ئەمەش ئەوە دەخوازێت ناوەندە زانستیەکان چیدی ئەو بوارە پشتگوێ نەخەنو ئاوڕی لێبدەنەوە، ئەم توێژینەوەش هەوڵێکە لەو بوارەداو تێیدا باس لە قۆناغێکی هەستیاری مێژووی رەوتی ئیسلامیی دەکاتو دەگونجێت بکرێتە سەرەتایەك بۆ ئاوڕدانەوە لەو بوارە.

گەورەترین گرفتی بەردەم ئەم توێژینەوەیە نەبوونی ژێدەری پێویستە دەربارەی رەوتی ئیسلامیی، هۆکاری ئەمەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی تایبەتی کوردستان لەو کاتەدا کە بە قۆناغی شەڕو پشێویو ئاژاوەو ستەمو چەوساندنەوەی حکومەتی عێراقدا تێدەپەڕی، ئەمەش ئەوەی لە نەیارانی ئەو حکومەتە دەخواست کە زۆر نهێنی پارێزنو زانیاری دەربارەی خۆیان نەخەنەڕوو، رەوتی ئیسلامییش بەشێك بووە لەو حاڵەتە، لەلایەکی ترەوە بەشێکی سەرەکی ئەو رەوتەی ئێمە باسی لێوە

دەکەین لەو قۆناغەدا سەرقاڵی کاری نهێنی بوو، ئەمەش هێندەی دی توێژینەوە دەربارەی ئەو قۆناغە قورس دەکات.

هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێدا، نەبوونی دەزگاری ئەکادیمی تایبەت بە توێژینەوەی دیاردەی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان، دەبێتە گرفت بۆ هەر توێژەرێك کە لەو بارەوە توێژینەوە بکات، هاوکات خودی ئیسلامییەکانیش لەو ڕووەوە کەمتەرخەمن‌و تا ئێستا گرنگیان بە مێژووی خۆیان نەداوە، لەلایەکی ترەوە، هەندی لەو کەسانەی لە سەرەتای کاری ئیسلامییەوە لە باشووری کوردستان بەشداربوون لە ژیاندا نەماون، یاخود لە هاندەران یان لە شارەکانی تری کوردستان دەژین، ئەمەش تارادەیەك گرفت بۆ توێژەر دروست دەکات، لە پاڵ هەموو ئەم گرفتانەشدا سەرەنجام ئەو توێژینەوەیە هاتە بوون.

توێژینەوەکە جگە لە پێشەکی‌و دەرەنجام‌و پاشکۆی بەڵگەنامەو وێنەکان، لە دەروازەو پێنج بەش پێکهاتووە، دەروازە بەسەر دوو باسدا دابەشکراوە، لە باسی یەکەمدا باس لە چەمك‌و زاراوەی ڕەوتی ئیسلامیی کراوە، وێڕای خستنەڕووی چەند بۆچوونی جیاواز دەربارەی ئەو چەمك‌و زاراوانەی بۆ ناولێنانی دیاردەکە بەکاردێن، یەکێك لەو زاراوانە هەڵبژێردراوەو لەم توێژینەوەدا بەکارهاتووە، کە لە چاو زاراوەکانی دیکەدا زیاتر ڕەهەندی مێژوویی تیا دەخوێندرێتەوەو لەگەڵ ناوەڕۆکی توێژینەوەکەدا دەگونجێت. باسی دووەم تەرخانکراوە بۆ خستنەڕووی ڕیشەی کاری ئیسلامیی لە باشووری کوردستان‌و تێیدا بە پشت بەستن بە سەرچاوە مێژووییەکان کارو چالاکی ئەو ڕەوتە خراوەتەڕوو.

بەشی یەکەم، تایبەتە بە مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی لە نێوان ساڵانی (١٩٤٦ – ١٩٧١)، ئەو بەشە بەسەر چوار باسدا دابەشکراوە، لە باسی یەکەمدا باس لە بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان موسلمین لە عێراق کراوە، بە شێوەیەکی چڕو پوخت باس لە سەرەتاکانی گەیشتنی بیری ئیخوان بە عێراق کراوە. لە باسی دووەمدا باس لەکارو چالاکی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان لە سەردەمی پاشایەتیدا کراوە، هەر لەو باسەدا زانیاری ورد دەربارەی سەرەتاکانی گەیشتنی بیری ئیخوان بە کوردستان

خراوەتەڕوو. باسی سێیەمیش تایبەتە بە کارو چالاکی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان لە سەردەمی کۆماریدا، هەروەها بە وردی باس لە شێوازی کاری ڕەوتی ئیسلامیی لەو قۆناغەدا کراوە. باسی چوارەمیش تایبەتە بە شەنو کەو کردنو خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی سێ دەیەی کاری ئیخوان لە عێراقو باشووری کوردستان، دەبێت سەرنج لەوەش بدرێت کە لەو باسەدا تەنها باس لە سلبیات کراوە، بە گشتی بەشی یەکەم گەلێك زانیاری وردی لەخۆگرتووە کە تا ئێستا بڵاونەکراونەتەوە.

بەشی دووەم، بەسەر سێ باسدا دابەشکراوەو تایبەتە بە قۆناغێکی نوێ لە کاری ئەو ڕەوتە، کە لە کاری تاکەکەسییەوە دەستپێدەکات بۆ ڕێکخراوبوون، لە باسی یەکەمدا باس لە کاری ئیسلامیی لە حەفتاکانو نیوەی یەکەمی هەشتاکانی سەدەی بیست کراوە، شێوازی دەستپێکردنەوەی کاری ئیسلامیی لە ناوچە جۆراو جۆرەکاندا خراوەتەڕوو، لە باسی دووەمدا خەسڵەتو تایبەتمەندی ئەو قۆناغەی کاری ئیسلامیی خراوەتەڕوو، لە باسی سێیەمدا باس لە هۆکاری سەرهەڵدانەوەو بەهێزبوونی ڕەوتی ئیسلامیی وەکو دیاردەیەکی مێژوویی کراوە، تێیدا هۆکارە ناوخۆییو دەرەکییەکان بەهەند گیراونو باسیان لێوەکراوە.

بەشی سێیەم، لە سێ باس پێکهاتووەو تایبەتە بە ڕەوتی ئیخوان موسلمین لە نێوان ساڵانی (١٩٧٩ – ١٩٩١)، لە باسی یەکەمدا سەرهەڵدانو کارو چالاکیو دیدو تێڕوانینی باڵی سدیق عەبدولعەزیز باسکراوە. لە باسی دووەمدا کارو چالاکی باڵی سەلاحەددین موحەممەدو هەوڵی ئەو باڵە بۆ دروستکردنی پارتێکی ئیسلامیی ئاشکرا خراوەتەڕوو. پاشان لە باسی سێیەمدا کارو چالاکی هەردوو باڵ لە دوای ساڵی (١٩٨٥)و یەکگرتنیان لەگەڵ ئیخوانەکانی عێراقو پاشان ئاشکرابوونی ڕێکخستنو هەڵاتنیان، دواتر کاری هەردوو باڵ لە ئێران خراوەتەڕوو، ئەم بەشە گەلێك زانیاری نوێ لەخۆ دەگرێت کە لە ڕووی مێژووییەوە بەهایەکی گەورەی هەیە.

بەشی چوارەم، تایبەتە بە چەند پارتو ڕێکخراوێکی ئیسلامیی کە لە نێوان ساڵانی (١٩٧٨ – ١٩٩١) کارو چالاکیان هەبووە، لە باسی یەکەمدا دروستبوونو کارو چالاکی

بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق شیکراوەتەوە. لە باسی دووەمدا لەشکری ئیسلامیی کورد هەر لە دروستبوونییەوە پاشان کارو چالاکیو دیدو تێڕوانینو هەڵوەشاندنەوەی خراوەتەڕوو. باسی سێیەم تایبەتە بە کۆمەڵی جیهادو کۆمەڵەی ئیسلامیی، باس لە چۆنێتی دروستبوونی ئەو دوو پارتە کراوە. باسی چوارەم تایبەتە بە پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان لە کوردستان کە ڕێکخراوێکی پیشەییەو هەر لە دروستبوونییەوە تا ڕاپەڕینی (ئازاری ١٩٩١) ڕۆڵو کاریگەری خۆی هەبوو، هەڵبەتە ئەم باسە تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە بەوەی کە تایبەتە بە ڕێکخراوێکی پیشەییەوە نەك ڕێکخراوی سیاسیی، دیارە لەبەر چالاکبوونی ئەو ڕێکخراوە ئەو باسەی بۆ تەرخانکراوە. لەم بەشەدا بەشێوەی بەشەکانی پێشوو گەلێك زانیاری ورد خراوەتەڕوو، هاوکات ڕووداوو هەڵوێستەکان هەڵسەنگێنراونو بۆچوونی توێژەر لەو بارەوە خراوەتەڕوو.

بەشی پێنجەم، بەسەر سێ باسدا دابەشکراوەو تەرخانکراوە بۆ بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق، لە باسی یەکەمدا چۆنێتی ڕاگەیاندنو ڕەوشی ناوخۆی بزووتنەوە باسی لێوەکراوە. باسی دووەم تایبەتە بە پێگەی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، کارو چالاکی ڕامیاریو سەربازیو ڕاگەیاندنو کۆمەڵایەتی بزووتنەوە باسی لێوەکراوە. لە باسی سێیەمدا پەیوەندییەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە ئاستی کوردستانو دەرەوەدا خراوەتەڕوو.

گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە کە یەکەمین توێژینەوەی ئەکادیمییە لەسەر بنەمای شێوازی زانستی توێژینەوەی مێژوویی ئەنجامدراوە، لەم توێژینەوەدا، سەرەڕای پشت بەستن بە دەیان بەڵگەنامە، تا ڕادەیەك شێوازێکی مەیدانی بەخۆوە گرتووەو چەندین چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانەدا ئەنجامدراوە کە بەشێك بوون لەو ڕەوتەو لە ناوەندی بڕیاردابوونو لە نزیکەوە ئاگاداری کاری ئەو ڕەوتەن، بێگومان کارێکی لەو شێوە توێژینەوەکەی دەوڵەمەند کردووە.

وێڕای چەندین بەڵگەنامەو چاوپێکەوتن کە لە ڕیزبەندی ژێدەرەکاندا پلەی یەکەمی وەرگرتووە، سوودمان لە ژمارەیەك ژێدەری دی وەرگرتووە، هەوڵماندواوە بگەڕێینەوە

سەر ئەدەبیاتی ڕەوتی ئیسلامیی‌و ئەو گۆڤارو بڵاوکراوانەی لەو قۆناغەدا دەرچوون کە ئێمە توێژینەوەی لەبارەوە دەکەین، لەو بارەوە گۆڤارەکانی ( الهدایة، لسان الهدایة، ئالای ئیسلام، ئاسۆی ئیسلام، دەنگی باوەڕ، بانگەواز، النفیر) سوودێکی ڕێژەیی باشیان پێگەیاندین، هەروەها لەو بابەتانەی دەربارەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کورد لەو قۆناغەدا نووسراون سوودمەند بووین، دەربارەی ڕەگ‌و ڕیشەی کاری ئیسلامیی، ئەوا وێڕای دوو ماستەرنامە سوودمان لە (الدلیل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦) وەرگرتووەو سەبارەت بە کردنەوەی لقی کۆمەڵە ئیسلامییەکان زانیاری وردی تێدایە.

لە هەندی جێگەشدا سوودمان لە ماستەرنامەی (مستقبل الحرکة الإسلامیة في کوردستان العراق) وەرگرتووە، بەڵام ماستەرنامەی ناوبراو لە هەندێ شوێندا کەوتۆتە هەڵەی مێژووییەوە. هەروەها سوودمان لە کتێبی (کاروانی ڕێ، هاڵەکۆك) وەرگرتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی سوود وەرگیراوە لە کتێبی (الحیاة الحزبیة في الموصل ١٩٢٦ ـ ١٩٥٦، الحرکة الإسلامیة في کردستان العراق واقع وأمل، رؤى في مسار العمل الإسلامي في کوردستان).

بەشێکی دیکەی ژێدەری ئەم توێژینەوەیە ئەو وتارو بابەتانەن لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی دوای ڕاپەڕینی (ئازاری ١٩٩١) بڵاوکراونەتەوە، بەڵام ئەو وتارانە زۆر کورتن‌و لایەنگری یان دژایەتیان پێوە دیارە، لەبەر ئەوە ناچنە خانەی توێژینەوەی ئەکادیمی، لە پاڵ هەموو ئەمانەشدا سوودمان لە چەند کتێب‌و بڵاوکراوەی دی وەرگرتووە کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێدراوە.

بێگومان هیچ کارێکی مرۆڤ بێ هەڵەو کەموکورتی نییە، دەبێت بەو چاوەش لەم توێژینەوەیە بڕوانرێت‌و ئەوەش بەهەند بگیرێت کە ئەم توێژینەوەیە بەرهەمی ماندوبوونی دوو ساڵی توێژەرەو گەلێك لاپەڕەی مێژووی لە فەوتان ڕزگارکردووە، هاوکات ئەم توێژینەوە دەبێتە سەرچاوەیەکی ڕەسەن بۆ هەر توێژینەوەیەکی دیکە کە دەربارەی ڕەوتی ئیسلامیی یاخود بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کورد لەو قۆناغەدا ئەنجامبدرێت.

# باسی یەکەم: چەمك و زاراوەی ڕەوتی ئیسلامیی

دیاردەی گەڕانەوە بۆ ئایین لە سەدەی بیستەمدا بۆتە دیاردەیەکی جیهانی، ئەم دیاردەیە تەنیا تایبەت نییە بە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، بەڵکو بە ئاستو تینی جیاوازەوە لە دونیای مەسیحیو یەهودیشدا ئامادەیی هەبووەو هەیە. کە دەڵێین گەڕانەوە بۆ ئایین مەبەستمان ئەوە نییە تاکەکانی کۆمەڵگە بێ ئایین بووینو لە ساتەوەختێکی دیکەدا هەستیان کردبێت کە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئایین، بەڵکو ئەم گەڕانەوەیە جیاوازە لە ئاینداریی تەقلیدی پێشوو، ئەم دیاردەیە شوێنکەوتنو پابەندبوونێکی هۆشیارانەترە بە ئایینەوە[1].

کاتێکیش دەمانەوێت لە دیاردەی گەڕانەوە بۆ ئایین بکۆڵینەوە، هەر لەسەرەتاوە ڕووبەڕووی گرفتی ناولێنانی دیاردەکە دەبینەوە، چونکە ناولێنانەکە پێویستی بە ڕاڤەو شیکردنەوە هەیەو ئەوەش کۆمەڵێك دەلالەت لەخۆ دەگرێت، حاڵەتێکی لەو جۆرەش وادەکات ناولێنانەکە بەدیقەت نەبێت. بە واتایەکی دی، هەر ناولێنانێکی ئەو دیاردەیە، دەبێتە بەشێك لەو مەبەستەی توێژەری بۆ لێکۆڵینەوە لەو دیاردەیە هانداوە.

تا ئێستا زاراوەگەلێك بۆ ئەم دیاردەیە لە ناوەندە ئەکادیمییو ڕۆشنبیرییو ڕامیارییەکاندا بەکارهاتووە، ناکۆکی توندیش لە نێوان لایەنگرانو نەیارانی ئەو دیاردە سەبارەت بە بەکارهێنانی ئەو زاراوانە لەئارادایە، لەو ناوانەی کە زۆر بڵاونو بەرگوێ دەکەون: بوژاندنەوەی ئیسلامیی، ڕابوونی ئیسلامیی، ئیسلامیی سیاسی، ئوسوڵیەتی ئیسلامیی، ڕیفۆرمی ئیسلامیی، ڕەوتی ئیسلامیی، ئیسلامەوی، ڕادیکاڵی ئیسلامیی، بزاڤی ئیسلامیی، نوێگەری، ...هتد[2]، بەمەش ناولێنانەکە بۆتە جێگای مشتومڕی زۆر.

(ئەلیاس یونس) ئەم دیاردەیە بە ئوسوڵیەت ناودەباتو لە پێناسەی ئوسوڵیەتدا دەڵێت: "هەڵوێستو کۆششو بزاڤێکە کە دەیەوێت یان هەوڵ دەدات خۆی بەبنەماکان

---

[1] موسڵیح ئیروانی: ئیسلامو ناسیونالیزم لە کوردستاندا، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٤، ل٦٢.

[2] هەمان سەرچاوە، ل٦٢؛ د. حيدر إبراهيم علي: التيارات الإسلامية وقضية الديمقراطية، الطبعة الثانية، بيروت ١٩٩٩، ل٢٤.

ببەستێتەوە"[١]. (ڕاشد ئەلغەنوشی) وەکو بیریارێکی ئیسلامیی لەگەڵ ئەوەی ئەم دیاردەیە بە نوێگەریی ئیسلامیی ناودەبات، خەسڵەتی گەڕانەوە بۆ بنەڕەتو بنچینەکانی ئیسلام دەکاتە بەشێك لە تایبەتمەندی دیاردەکەو دەڵێت: هەموو بزووتنەوەیەکی نوێگەری لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە گەڕانەوە بۆ بنەچەو بنەڕەت، ئەمە تایبەت نییە بە ئیسلامەوە، تەنانەت نوێگەریی لە ئەورووپا بریتی بوو لە گەڕانەوە بۆ بنچینە یۆنانیو ڕۆمانیەکان[٢]. لە وتەکەی ئەلغەنوشی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە دیاردەی گەڕانەوە بۆ ئایین خەسڵەتی ئوسوڵیەتی تێدایە، نەك خودی دیاردەکە ئوسوڵیەت بێت، ئەمەش حاڵەتێکی دینامیکی گۆڕانە.

بە بۆچوونی (نەجدەت ئاکرەیی)، ڕەوتی سیاسیی ئیسلامیی داوای گەڕانەوە بۆ ئەسڵی دینو شەریعەت لە حوکمو ژیانی سیاسییو ئابووریی و کۆمەڵایەتییدا دەکات، هەر بۆیە زاراوەی ئوسوڵیەتی ئیسلامیی لە ئیسلامیی سیاسیی بەدیقەتترە[٣].

ئوسوڵیەت، تەنیا خەسڵەتێکی ڕەوتی ئیسلامییە، ئەگەر بە تەنها خەسڵەتێك بکەینە ناسنامەی ڕەوتی ئیسلامیی، ئەوا بایەخی ئەکادیمی لێکۆڵینەوەکە کەمدەبێتەوە، گومانی تێدا نییە پێشەنگی ڕەوتی ئیسلامیی هاوچەرخ، ئەو بزووتنەوە چاکسازییە ئایینیەیە، کە جەمالەدینی ئەفغانی(١٨٣٩ - ١٨٩٦ز)و موحەممەد عەبدە(١٨٤٩ - ١٩٠٥ز)و موحەممەد ڕەشید ڕەزا(١٨٦٥ - ١٩٣٥) ڕێبەرایەتی دەکەن، ئەوان دەیانویست، بنچینەو بنەماکانی ئیسلام، لەگەڵ کەژاوەی پێشکەوتنی ئەورووپا بگونجێنن، تا ناکۆکی لە نێوان کولتووری هاوچەرخبووندا دروست نەبێت[٤]. بەمەش ڕەوتی ئیسلامیی هەمیشە خەسڵەتی ئوسوڵیەت تێیدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەکو چۆن خەسڵەتی گشتگیری(شمولی)و پیرۆزی (تقدیس) تێیدا ڕەنگی داوەتەوە،

---

[١] لە: موسڵیح ئیروانی: هەمان سەرچاوە، ل٦٣.

[٢] لە: د. حیدر ابراهیم علي: هەمان سەرچاوە، ل٢٥.

[٣] لە: کۆمەڵێك نووسەر: دینو سیاسەت، ئا: سەرۆ قادر، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٠ز، ل٩٩.

[٤] د. حیدر إبراهیم علي: هەمان سەرچاوە، ل٢٦.

هەموو ئەمانە خەسڵەتن و ناگونجێت بە تەنیا خەسڵەتێکیان بکرێتە ناسنامەی ئەو ڕەوتە.

بیریاری ئیسلامیی (د. یوسف ئەلقەرزاوی )، ئەم دیاردەیە بە ڕابوون (الصحوة) ناودەبات، بەلای ئەوەوە ئەم زاراوەیە ئاماژەیە بۆ بێداربوونەوە، هەستانەوە لە خەوو مەستی، ڕابوون بریتییە لە گەڕانەوەی هۆش و بەئاگاهاتنەوە لە بێ هۆشی[1].

(شێرکۆ کرمانج) زاراوەی ئیسلامیی سیاسیی و سەرجەم زاراوەکانی دی وەلا دەنێت، لە دیدی ئەودا زاراوەی (ئیسلامیزم) بۆ ناولێنانی ئەو دیاردەیە پەسەندو گونجاوە، لەو بارەوە دەڵێت:" مەبەستمان لە ئیسلامیزم ئەو تیۆرە یان ئایدۆلۆجییە سیاسییەیە کە لە ئاکامی ئەو هەوڵانەی لەلایەن کەسێك یان ڕێکخراوێك یان بزوتنەوەیەك وەبەرهەمدێت بە خوێندنەوەی سەرچاوە سەرەکییەکانی ئیسلام. بە واتایەکی دیکە دانانی هەرسێ سەرچاوە سەرەکییەکانی ئیسلام: قورئان و سوننەو فیقهی ئیسلامی بە تاکە سەرچاوەی یاساو سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات و پەیوەندیە ناوخۆیی و دەرەکییەکان. جا ئەو هەوڵانە چ لە سەرەتاکانی مێژووی موسڵمانان بووبن چ لە سەردەمی ئەمرۆکەمان"[2].

بە پێچەوانەی بۆچوونی شێرکۆ کرمانج، هەندێك لە توێژەرانی عەلمانی بەکارهێنانی زاراوەی ئیسلامیی سیاسیی بە ئەکادیمی دەزانن، پێیان وایە ڕەوتی ئیسلامیی تەوزیفی ئاین بۆ مەسەلە سیاسییەکان دەکات، لەو ڕووەوە (د. ئەحمەد بەلقاوی) دەڵێت: "مەبەست لە ئیسلامیی سیاسی ئەو بزاڤە سیاسیانەیە کەلە ئیسلام سەرچاوە دەگرن و پێیان وایە بۆ کارکردنە سەر ئەم واقعە دەبێت دەسەڵاتی حوکمڕانی بگرنەدەست"[3].

هەر لەو بارەوە (نیاز سەعید عەلی ) بەکارهێنانی زاراوەی ئیسلامیی سیاسیی بە گونجاو دەزانێت و لە پێناسەی ئەو زاراوەدا دەڵێت:"بریتییە لە بەکارهێنانی

---

[1] الصحوة الإسلامية وهموم الوطن العربي والإسلامي، ب.ش، ب. م، ل١١.

[2] بەسیاسییکردنی ئیسلام دیاردەی ئیسلامیزم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٥ز، ل ١٥ ـ ١٦.

[3] لە: کۆمەڵێك نووسەر: هەمان سەرچاوە، ل٢٩٧.

سیاسیانەی ئایینی ئیسلام، یان بریتییە لە پرۆسەی بە سیاسی کردنی ئایینی ئیسلام بۆ ئامانجو دەسەلاتو بەرژەوەندیە سیاسیەکان"[1].

لە هەردوو پێناسەکەدا، مەسەلەی مومارەسەکردنی کاری سیاسیی لەلایەن ڕەوتی ئیسلامییەوە بەهەند گیراوە، بە بڕوای ئێمە زاراوەی ئیسلامیی سیاسیی تەواو بەدیقەت نییە، چونکە ڕەوتی ئیسلامیی بە تەنها کاری سیاسیی ناکات، خەسڵەتێکی ئەو ڕەوتە گشتگیریە، ئەمەش بەو مانایەی ئەو ڕەوتە لەسەر ئەوە پێدادەگرێت کە ئیسلام ئایینێکی گشتگیرەو بە تەنیا پەیوەست نییە بە پەیوەندی نێوان تاکو خوا، بەڵکو ئەرکێکی تری ئایین، ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەو دەسەلاتە، ڕەوتی ئیسلامیی دەخوازێت ئایین ڕۆڵی زیاتر لەکۆمەڵگەدا بگێڕێتو لەو ڕووەوە سەرەڕای دەیان دەق، کولتووری سەدان ساڵەی دەسەلاتی ئیسلامیی بە نموونە دەهێننەوە.

(بەرنار لویس) توێژەرانی خۆرئاوا لە بەدحاڵیبوون لە ڕەوتی ئیسلامیی ئاگادار دەکاتەوە، بە بڕوای ئەو، دەبێت لە کاتی بەکارهێنانی وشەی ئیسلامییدا، ئەوەمان لەبەرچاوبێت کە لە ئیسلامیی کلاسیکیدا سنوورێکی جیاکەرەوە لە نێوان مزگەوتو دەوڵەتدا نەبووە، ئەو حاڵەتەش بۆتە خەسڵەتێکی دیاری ئیسلام، بەمەش ڕەخنەگرتن لە سیاسیبوونی ئەو گروپانە کارێکی نابەجێیە[2].

لەلایەکی ترەوە، خودی ڕەوتی ئیسلامیی، دابەش دەبێت بەسەر چەند ڕەوتێکی جیاواز لە شێوازی کارکردن، (کۆمەڵەی نوور)* پێڕەوی کاری سیاسیی ناکەن، بەلام

---

[1] لێکۆڵینەوە لە ئیسلامی سیاسی، بلاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی. ن. ك)، سلێمانی ٢٠٠٤ز، ل٤.

[2] لغة السياسة في الإسلام، ترجمة: د. ابراهيم شتا، الطبعة الاولى، دار قرطبة للنشر والتوثيق والابحاث، ١٩٩٣، ل١٠.

* کۆمەڵەی نوور: کۆمەڵەیەکی ئیسلامییە سەعید نورسی (١٨٧٣ ـ ١٩٦٠ ز) دامەزرێنەریێتی، بڕوایان بەکاری سیاسیی نییەو زیاتر گرنگی دەدەن بە پاکردنەوەی دەروونو بابەتە ئیمانیو ڕۆحییەکان. بڕوانە: الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة، الطبعة الخامسة منقحة وموسعة، رياض ٢٠٠٣، ل ٣٢٤.

بەشێکن لە ڕەوتی ئیسلامیی، ئەگەر ڕەوتی ئیسلامیی بە ئیسلامیی سیاسیی ناوزەد بکەین ئەی کۆمەڵەی نوورو هاوشێوەکانی لە ژێر کام خانەدا پۆلێن بکەین؟!

ئێمە کۆمەڵێك پێناسەی جیاوازمان بە نموونە وەرگرت، مەبەستمان ئاماژەکردنێك بوو بەو جیاوازیانەی لە نێوان توێژەراندا دەربارەی ئەو دیاردەیە هەیە، هاوکات ویستمان تا ڕادەیەك ئاشنایەتی لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو چەمکەدا پەیدا بکەین، ئەم توێژینەوەیە تایبەت نییە بە لێکۆڵینەوە دەربارەی چەمك و زاراوەی ڕەوتی ئیسلامیی، بەڵکو تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە لایەنی مێژوویی ئەو دیاردەیە، لە کات و شوێنێکی دیاری کراودا، بۆیە ئامانج لە تەرخانکردنی ئەم باسە بۆ ئەو چەمکە، دیاریکردنی مەودای توێژینەوەکە و بەرچاو ڕۆشنییە لەسەر ئەو دیاردەیەی توێژینەوەی لەبارەوە دەکەین.

ئێمە لەڕووی مێژووییەوە ڕەوتی ئیسلامیی بە گونجاو دەزانین و لەم توێژینەوەدا بەکاری دێنین، مەبەستیشمان لێی دیاردەی گەڕانەوەیە بۆ ئایینی ئیسلام بەشێوەیەکی نوێ، کە تێیدا هەڵگری ئەم بیرە دیدو تێڕوانینی لە ئیسلامەوە سەرچاوە دەگرێت و لەسەر ئەوە پێدادەگرێت، کە ئایین بەرنامەیەکی گشتگیرە بۆ ژیان، یەکێکیش لەو ئامانجانەی ئەم ڕەوتە هەوڵی بۆ دەدات دەسەڵات گرتنەدەستە، بە شێوەیەك کە تێیدا بەپێی شەریعەتی ئیسلام پەیڕەوی ئەو دەسەڵاتە دەکات. ئەو زاراوەیەش لە بەرامبەر ئیسلامیی تەقلیدی بەکاردەهێنین، کە بریتییە لەو جۆرە ئیسلامەتییەی لە چوارچێوەی پەیوەندی تاك و خوداو هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی دەرناچێت.

کاتێکیش وشەی (ئیسلامیی) دەخەینە پاڵ ڕەوت، وشەی (ئیسلامیی) دەبێتە ئاوەڵناو بۆ ڕەوت، ئەمەش بەو مانایە دێت کە ئەو ڕەوتە هەڵگری ئایدۆلۆژیای ئیسلامە، هەر وەکو چۆن ئەگەر کەسێك هەڵگری ئایدۆلۆژیای مارکسیزم بێت پێی دەوترێت (مارکسی).

## باسی دووەم: ڕیشەی کاری ئیسلامیی لە باشووری کوردستان

ئەگەر بمانەوێت باس لە سەرهەڵدانو ڕیشەی مێژوویی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان بکەین، زەحمەتە بتوانین سەرەتایەکی بۆ دیاری بکەین، دەبێت بۆ شارەزابوون لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانی، سەرنجی دوو هۆکاری گرنگو کاریگەر لەسەر ڕەوتی ئیسلامیی لە تەواوی جیهانی ئیسلامییو کوردستان بدەین. کاریگەری یەکەمیان ئەوەیە کە پێشەنگی ڕەوتی ئیسلامیی هاوچەرخ، ئەو بزووتنەوە چاکسازییە ئایینیەیە کە جەمالەدینی ئەفغانی(١٨٣٩ - ١٨٩٦ز)و موحەممەد عەبدە(١٨٤٩ – ١٩٠٥ز)و موحەممەد ڕەشید ڕەزا(١٨٦٥- ١٩٣٥ ز) ڕێبەرایەتی دەکەن[١].

کاریگەری ئەو بیرمەندانە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم گەیشتۆتە کوردستان، (مەلای گەورەی کۆیە[*]) کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەم بیرە نوێیانەو بانگەشەی چاکسازیی ئایینی دەکرد، تەنانەت ئاواتی خواستووە کە خوا لەگەڵ جەمالەدینی ئەفغانیو موحەممەد عەبدەو موحەممەد ڕەشید ڕەزا کۆیان بکاتەوە، تا ڕێنماییەکانی ئیسلام بۆ خەڵکی بنووسنەوە[٢]. مەلای گەورەی کۆیە لەگەڵ ئەو بیرمەندانە لە چەند مەسەلەیەکدا هاوڕابووە:

١. بانگەشەی گەڕانەوە بۆ قورئانو سوننەتو تێگەیشتن لە ئایین بە هەمان تێگەیشتنی پێشین.

---

[١] د. حیدر ابراهیم علي: هەمان سەرچاوە، ل٢٦.

[*] مەلای گەورەی کۆیە: موحەممەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەسعەد جەلی کۆیی، ساڵی (١٨٧٦ز) لە کۆیە لە دایك بووە، دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی لە جێگەی باوکی دەبێتە پێشنوێژو وتاربێژ، ساڵی (١٩١٢ز) دەبێتە موفتی کۆیە، چاکسازێکی گەورەی ئایینی بووە، ساڵی (١٩١٥ز) ئەندامی ئەنجومەنی ویلایەتی موسڵو ساڵی (١٩٢٥ز) ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق بووە، نزیکەی (٢٣) بەرهەمی چاپکراوو دەستنووسی هەیە لە بوارەکانی تەفسیر، زانستی ئوسوڵ، فیقهی ئیسلامی، بیروباوەڕ، چیرۆکو هۆنراوە. لە (١١ تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ز) کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو کەسایەتییەو توانای زانستیو بەرهەمە بەپێزەکانی بڕوانە: جواد فقي علي الجوم حيدري: محمد بن عبدالله الجلي وجهوده العلمية، رسالة ماجستير، كلية الشريعة، جامعة بغداد، سنة ١٩٩٠.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥.

٢. هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ڕەوشی دواکەوتوویی‌و پاشکۆیەتی جیهانی ئیسلامیی.

٣. بانگەشەی یەکڕیزیی موسڵمانان‌و دوورکەوتنەوە لە مەزهەبگەرایی‌و شوێنکەوتنی کوێرانە.

٤. پێویستی ئاراستەکردنی هەوڵەکان بۆ پارێزگاریی لە ئیسلام‌و موسڵمانان‌و بەرەنگاربوونەوەی ئیستعمار[١].

بە هەمان شێوە، (شێخ موحەممەدی خاڵ[*]) کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو بیرمەندانەو سەرەڕای ئەوەی چەندین وتاری دەربارەی جەمالەدینی ئەفغانی‌و موحەممەد ڕەشید ڕەزا نووسیوە، بە گوتەی خۆی لە نووسینی تەفسیرەکەیدا بە پلەی یەکەم سوودی لە بۆچوونەکانی ئەو بیرمەندانە وەرگرتووە[٢].

کاریگەری دووەمیان هەڵوەشاندنەوەی خیلافەتی ئیسلامییە لە (١٩٢٤ز)دا. هەر چەندە لەسەر شەرعیەتی خیلافەتی عوسمانی بۆچوونی جودا هەبووە، بەڵام هەڵوەشاندنەوەی بە گورزێکی کاریگەر ئەژمار دەکرێت، چونکە خیلافەت ڕەمزێکی ڕۆحی موسڵمانان بوو[٣].

---

[١] سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.

[*] شێخ موحەممەدی خاڵ: موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەمین خاڵ کوڕی مەلا موحەممەد خاڵ کوڕی ئیسماعیل کوڕی مەلا مستەفا، ساڵی (١٩٠٤ز) لە گەڕەکی گۆیژەی سلێمانی لەدایک بووە، لای باوکی‌و کۆمەڵێك زانای ئەو سەردەم خوێندویەتی‌و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان دەستی داوەتە ولەوتنەوەو نووسین، موفەسیرو ئەدیب بووە، ماوەی بیست‌و هەشت ساڵ قازی بووە، سەرەڕای پانزە بەرهەمی چاپکراو کە هەندێکیان لە چەند بەرگێك پێکهاتوون‌و چەندجارێك چاپکراونەتەوە، دەیان وتاری لە گۆڤارەکانی (گەلاوێژو کۆڕی زانیاری کورد)دا بلاوکردۆتەوە، لە (١٥/ ٧/ ١٩٨٩ز) کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عمر علي محمد بهاءالدين: الشيخ محمد الخال مفسرا، رسالة ماجستير، كلية الشريعة والدراسات الإسلامية، جامعة صلاح الدين، سنة ٢٠٠٣.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.

[٣] د. حيدر ابراهيم علي: هەمان سەرچاوە، ل٥٥.

هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت هەلێکی نموونەیی بوو بۆ بانگەشەکارانی "هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت بنچینەی مەترسی سەر ئیسلامە لەلایەن بێ باوەڕییەوە"، لەپاڵ ئەمەشدا بیری ئەو نوێگەرانە برەوی بەم بۆچوونە دەدا، ئەمەش ئەو بیرەیە کە بووە سەرچاوەی ئیلهامی حەسەن بەننا (١٩٠٦ ـ ١٩٤٩ن) لە دامەزراندنی ئیخوان موسلمین لە (١٩٢٨ن)[1].

لە دوای شەڕی دەربەندی بازیان‌و دەستگیرکردنی شێخ مەحمودی حەفید[*] لەلایەن ئینگلیزەوە، دوو پارت لە سلێمانی دروست بوو کە لە بەرەیەکی یەکگرتوودا یەکیان گرت، ئەو دوو پارتەش (پارتی نیشتمانیی کوردی، پارتی ئیسلامیی کوردی) بوون. پارتی ئیسلامیی دژی ئینگلیز بوو، حەزی دەکرد لەگەڵ تورك پێکبێن، بە مەرجێك دان بە سەربەخۆیی کوردستاندا بنێن[2].

دروشمەکانی بەرەی یەکگرتوو خۆی لە دوو خاڵدا دەبینییەوە:

١– بەردانی شێخ مەحمودو دیلەکان.

٢– دەرچوونی سوپای ئینگلیز لە کوردستان‌و دامەزراندنی حکومەتێکی نیشتمانی[3].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦.

[*] شێخ مەحمودی حەفید: کوڕی شێخ سەعید کوڕی سەید موحەممەد کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ، ساڵی (١٨٨١) لە سلێمانی لەدایك بووە، زانستە ئایینیەکانی لای زانایانی ئەو سەردەم خوێندووە، لەگەڵ بنەماڵەکەیدا تووشی ئاوارەیی‌و دەربەدەری زۆر بوون، دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی‌و لە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرەنگاری ئینگلیزەکان بۆتەوە، سێ جار لە سلێمانی حوکمداری کوردستانی دامەزراندووە، بەڵام بەدەستی ئینگلیزەکان رووخاوە، رۆڵی بەرچاوی بینیوە لە رووداوە سیاسیەکانی ئەو دەمەی سلێمانی‌و کوردستانی عێراق، دوا ساتەکانی ژیانی لە گوندی داریکەلی بەسەر بردووە، لە (٩/١٠/١٩٥٦) کۆچی دوایی کردووە. جمال بابان: أعلام كرد العراق، مطبعة شفان، سليمانية ٢٠٠٦، ل٧٩٤– ٨٠٢.

[2] شێخ لەتیفی حەفید: یادداشتەکانی شێخ (لەتیف)ی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید، کەمال نووری مەعرووف ساغیکردۆتەوە، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی رۆشنبیری‌و راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، چاپی یەکەم ١٩٩٥، ل٧٨.

[3] سەرچاوە پێشوو، ل٧٩.

ئەندامانی پارتی ئیسلامیی کورد، لە کەسایەتیی ئایینیو عەشایەری دۆستی شێخ مەحمودو ژمارەیەك ئەفسەری کوردی نێو سوپای تورك پێکهات، لەوانە: عەباسی مەحمود ئاغا، سەید عەبدوڵلای حاجی سەید حەسەن، سەید موحەممەد موفتی، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، ئەحمەد بەگی سەعید بەگ، ئەحمەد تەقی، تاهیر ئەفەندیو ئەمین ئەفەندی. بە گوتەی شێخ لەتیفی حەفید لە لایەن حەپسەخانی نەقیبەوە* کۆمەکی ماددی دراوەتە هەردوو پارتەکە تا دژایەتی ئینگلیزی پێ بکەن[1].

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە دە ساڵ بەسەر دامەزراندنی پارتی ئیسلامیی کورد، ساڵی (١٩٣٤ز) لە هەڵەبجە (عەبدوڵڵا بەگی ئەحمەد بەگی تاپۆو شاهۆی شاعیر** و موحەممەد سەعید بەگی سەلیم بەگی یار ئەحمەد بەگی جاف «١٩٠٤ ـ ٢٠٠٢ز») پارتێکی ئیسلامییان بەناوی (حزبی ئیسلامیی کورد) دامەزراند[2].

ماوەیەك دوای دامەزراندنی پارتەکە، عەبدوڵڵا بەگ دەگەڕێتەوە سلێمانیو موحەممەد سەعید بەگیش دەگوێزرێتەوە سلێمانیو هەردووکیان لەوێ دەکەونە چالاکیو خەڵکی دی دەبنە ئەندامی ئەم پارتە، لەوانە: نەجمەدینی حاجی مەلا

---

* حەپسەخانی نەقیب: کچی شێخ مەعروفی نەقیبەو لە نەوەی کاك ئەحمەدی شێخە، ساڵی (١٨٩١) لە سلێمانی لەدایك بووە، ئافرەتێکی بەخشندەو خێرخواز بووە، حەزی بە بڵاوکردنەوەی زانستو زانیاری کردووە، بەشداری چالاکییە سیاسییەکانی ئەو دەمەی کوردستانی عێراقی کردووە، بەهۆی دژایەتیکردنی ئینگکلیزەکانەوە لەگەڵ بنەماڵەکەیدا تووشی ناڕەحەتیو چەرمەسەری زۆر هاتوون؛ لە (١٥/٤/١٩٥٣) کۆچی دوایی کردووە. جمال بابان: هەمان سەرچاوە، ل٢٦٨– ٢٧٠.

[1] شێخ لەتیفی حەفید: هەمان سەرچاوە. ل٧٩.

** شاهۆی شاعیر: مەلا حەسەن قازی کوڕی مەلا عەبدولقادر کوڕی مەلا ئەوڕەحمانە، ساڵی (١٨٨٢ز) لە بیارە لە دایك بووە، دوای خوێندنی زانستە شەرعییەکانو زمانی فارسیو عەرەبی، چەند ساڵێك دەبێتە قازی، شیعری بە زمانی کوردیو فارسیو عەرەبی هەیە، کەسێکی زیرەکو بلیمەتو قسەخۆش بووە، لە (٢٣ حوزەیرانی ١٩٧١) کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دیوانی شاهۆ، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی: محمد امین کاردۆخی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی ١٩٧٦، ل٣ ـ ٦.

[2] چاوپێکەوتنی (سدیق سالح) لەگەڵ (موحەممەد سەعید بەگی سەلیم بەگی جاف)، سلێمانی، ٧/ ٥/ ٢٠٠٠ز.

ڕەسوڵو مەحمودی فەقێ موحەممەدی هەمەوەند. هەروەها لە هەولێر (گیوی موکریانی*)و لە کەرکوك (خەلیفە عەلی بەسێ "مەنمی")و لە کرماشان (ئەسکەندەر بەگی ئێناخی) دەبنە ئەندام، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو پارتە لە هەڵەبجەو پێنجوێنو تەوێڵەو بیارەو کەلار ئەندامی هەبوو[1].

سەبارەت بە ئامانجی ئەو پارتە، موحەممەد سەعید بەگی سەلیم بەگی جاف دەڵێت:"وشەی ئیسلامیی خرابوە ناوی حزبەکە، چونکە ئەو وەختە دینداریی زۆر بڵاوو زاڵ بوو، جا ویستمان لەڕێگەی ئیسلامەتییەوە هانی خەڵك بدەین لێمان کۆببنەوەو بێنە ناومان، تا ڕێکیان بخەینو ئاگاداریان بکەین لە کێشەی کوردو فێری کوردلیەتیان بکەین، چونکە ئامانجمان بەدیهێنانی داواو مافەکانی کورد بوو"[2].

پارتی ناوبراو، تەنها ماوەی دوو ساڵو نیوێك لەکار بەردەوام بوو[3]، لەدوای ئەو مێژووە چارەنووسی نادیارە، وتەکانی موحەممەد سەعید بەگی سەلیم بەگی جاف تاکە سەرچاوەی زانیارییە دەربارەی ئەو پارتەو لەوە بترازێ هیچمان دەربارەی ئەو پارتە لەبەردەستدا نییە، پێدەچێت لە ئەرشیفی ئەو کاتەی حکومەتی ئینگلیز زانیاری دەربارەی ئەو پارتە هەبێت.

دامەزراندنی هەردوو پارتی ئیسلامیی کوردو حزبی ئیسلامیی کورد لەو قۆناغەدا، کۆمەڵێ پرسیار دەورووژێنێت، لەو بڕوایەدام دروستکردنی ئەو دوو پارتە بەدەر لە هەر کاریگەرییەکی دەرەکی، دەرەنجامی واقیعی سیاسییو کۆمەڵایەتیی ئەو دەمەی باشووری کوردستانە، دامەزرێنەرانی ئەو دوو پارتە خوازیاری ئەوەبوون بە کەڵك وەرگرتن لە ئیسلام خزمەت بە نەتەوەکەیان بکەنو نەهامەتییەکانی لەسەر لابەرن.

---

* گیوی موکریانی: ناوی عەبدەڕەحمانەو برای حسێن حوزنی موکریانییە، ساڵی (١٩٠٣) لەدایك بووە،شارەزای بواری ئەدەبو زمان بووە، چەند فەرهەنگو بەرهەمی چاپکراوی هەیە، ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کردووە. جمال بابان: هەمان سەرچاوە، ل٦٤٣– ٦٤٥.

[1] چاوپێکەوتنی (سدیق سالح) لەگەڵ (موحەممەد سەعید بەگی سەلیم بەگی جاف)، سلێمانی، ٧/ ٥/ ٢٠٠٠ز.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

ئەوەی بۆ ئێمەش گرنگە دەتوانین بڵێین دامەزراندنی هەردوو پارتە ئیسلامییەکە دەبێتە سەرەتایەك بۆ رەوتی ئیسلامیی کوردستان.

دوابەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، چەند کۆمەڵەی ئیسلامیی لە عێراق دامەزران، زۆرێك لەوانە لە شارەکانی کوردستان لقیان کردۆتەوەو چالاکیان نواندووە، ئەوان زیاتر لە بواری بانگەوازی ئیسلامیی‌و خێرخوازیی‌و پەروەردەو بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری ئیسلامیی کاریان دەکرد. کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان (جمعية الشبان المسلمين)[١] یەکەم کۆمەڵەی ئیسلامییە لە زۆربەی شارەکانی عێراق لقی کردەوەو کەوتە چالاکی، لەو چوارچێوەدا لە دهۆك لقی کۆمەڵە کراوەتەوە[٢].

ساڵی (١٩٢٩ن) کۆمەڵەی رێنمایی ئیسلامیی (جمعية الهداية الإسلامية)[٣] لە بەغداد دامەزرا[٤]، مەلا موحەممەد قزڵجی[*] یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ئەم

---

[١] کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان (جمعيه الشبان المسلمين) ساڵی (١٩٢٨ن) لە بەغداد لەلایەن (موحەممەد بەهجەت ئەلئەسەری، حاجی کەمالەدین، رەشید روشدی، موسا ئالوسی، سەید عەبدورەئوف، کەمال موحسین)ەوە دامەزرا. بڕوانە: الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ل٨٣٧.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣٨.

[٣] دامەزرێنەرانی بریتیی بوون لە (ئیبراهیم ئەلراوی ـ سەرۆك، بەهائەدین شێخ سەعید ـ جێگری سەرۆك، حەمدی ئەعزەمی، حاجی موحەممەد رەشید، کەمالەدین تائی، موحەممەد نافع، عەبدولحەمید شێخ عەلی، نوعمان ئەلئەعزەمی، خەلیل ئەلراوی، تەها ئەلراوی، نەجمەدین مودەریس،...هتد). بڕوانە: دليل المملكة العراقية تأريخي اداري تجاري صناعي زراعي مصور لسنة ١٩٣٥ ـ ١٩٣٦، مطبعة الأمين، بغداد ١٩٣٥، ل٨٨٢.

[٤] الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ل٨٨٠.

[*] مەلا موحەممەد قزڵجی: شێخ موحەممەد کوڕی شێخ حسێن کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی قزڵجی، ساڵی (١٨٩٧ن) لە قزڵجە لەدایك بووە، لای زانایانی ئەو سەردەمە خوێندویەتی‌و پاشان خوێندنی لە ئەزهەر تەواو کردووە، دوای گەڕانەوەی لە کۆلێجی شەریعەی بەغداد بۆتە مامۆستا، لە بواری ئەدەب‌و فیقهو زمان‌و مێژوو زۆر شارەزا بووە، لە چەند کۆمەڵەی ئیسلامییدا بۆتە ئەندام‌و دامەزرێنەری کۆمەڵەی رێنمایی موحەممەدی (جمعية الهدى المحمدي) بووە، جگە لە کتێبی (التعريف بالمساجد السليمانية) پەراوێزو لێکدانەوەی بۆ چەندین دەستنووس داناوە، ساڵی (١٩٥٩ن) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: محمد زكي حسن أحمد: اسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية، الطبعة الاولى، دار ئاراس للطباعة والنشر، أربيل ١٩٩٩، ل٢١٩.

کۆمەڵەیە[١]، هەروەها نەجمەدین واعیز[*] و شێخ ئەمجەد زەهاوی[**] بوونەتە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە[٢]. پێدەچێت بەشداری ئەم زانایانە ڕێخۆشکەر بووبێت بۆ زێتربوونی چالاکی کۆمەڵەی ڕێنمایی ئیسلامیی لە کوردستان.

ئەم کۆمەڵەیە لە زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستان چالاکی هەبوو، لەو چوارچێوەدا ساڵی (١٩٣٣ز) لقی کەرکووکی کۆمەڵە کرایەوە[٣]، هەفتەنامەی (الهدایة) زمانحاڵی کۆمەڵە بە گرنگیو بایەخی زۆرەوە هەواڵی کردنەوەی لقی ناوبراوی بڵاوکردۆتەوە[٤].

---

[١] سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٩.

[*] نەجمەدین واعیز: نەجمەدین عەبدوڵلا واعیز، ساڵی (١٨٨٠) لەدایك بووە، هەر لە منداڵیەوە دەستی داوەتە خوێندنو لای زانایانی ئەو دەمەی بەغداد ئیجازەی زانستی وەرگرتووە، دواتریش ئیجازەی زانستی فەرمودەناسی وەرگرتووەو لە کرلێجی شەرعە بۆتە مامۆستا، ئەندامی دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەی ڕێنمایی ئیسلامییو سەرۆکی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی بووە، ماوەیەك موفتی عێراق بووە، ساڵی (١٩٧٦) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٦.

[**] شێخ ئەمجەد زەهاوی: ئەمجەد موحەممەد سەعید موحەممەد فەیزی زەهاوی، ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر بابانەکان، ساڵی (١٨٨٣ز) لە بەغداد لەدایك بووە، باوكو باپیری موفتی بەغداد بوون، سەرەتا لای باوکی خوێندویەتی، پاشان چۆتە ئەستەمبوڵو خوێندنی تەواو کردووە، دوای گەڕانەوەی چەندین پۆستی جۆراوجۆری وەرگرتوەو لە کۆلێجی شەریعەو حقوقو چەندین قوتابخانە وانەی وتۆتەوە، لە دامەزراندنی زۆربەی کۆمەڵەو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی سەردەمی پاشایەتی بەشداری کردوەو پۆستی سەرۆکی (٦) لەو کۆمەڵانەی وەرگرتووە، لە (١٦ / ١١/ ١٩٦٧ز) کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کاظم أحمد المشایخي: الإمام أمجد بن محمد سعيد الزهاوي، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، فيرجينيا ١٩٩٦. مجول محمد محمود جاسم العكيدي: الشيخ امجد الزهاوي (١٨٨٣– ١٩٦٧) دراسة تاريخية، اطروحة الدكتوراه غير منشورة تقدم الى كلية التربية في جامعة الموصل، سنة ٢٠٠٤.

[٢] الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ل٨٤٨. بۆچوونی ئەوەش هەیە کە شێخ ئەمجەد زەهاوی یەکێك بووە لە دامەزرێنەران، بەڵام مەلا موحەممەد قزڵجی لە دامەزرێنەران نییە. بڕوانە: ايمان عبدالحميد محمد الدباغ: جمعية الاخوة الاسلامية في العراق ١٩٤٩– ١٩٥٤ دراسة عن نشأة حركه الاخوان المسلمين في العراق، ب.ش، ب.م، ل٤٤.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣٣.

[٤] العدد (١٣١)، السنة الرابعة، ٢٧ محرم ١٣٥٢ ه، ل٧.

سەبارەت بە چالاکیو ناوی دەستەی گشتی لقی کەرکووکی کۆمەڵە، هەفتەنامەی (لسان الهدایة) نووسیویەتی: دەستەی گشتی لقی کەرکووکی کۆمەڵەی ڕێنمایی ئیسلامیی کۆبویەوەو ئەم کەسانە بۆ دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردران: موحەممەد ڕەزا واعیز - سەرۆك، حاجی حەسەن ئومی زادە - جێگری سەرۆك، سابر حافز - نهێنگر، شێخ ڕەئوف مودەڕیس - ئەمین سندوق [1].

بە هەمان شێوەی کەرکوك، لە (٩ تەمموزی ١٩٣٤ن) لە دهۆك[2] و (٢٠ ئاب ١٩٣٤ن) لە سلێمانی لقی کۆمەڵە کراوەتەوە[3]. ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە هەولێرو ئامێدیو خانەقین لقی کۆمەڵە کراوەتەوە[4].

کۆمەڵەی ڕێنمایی ئیسلامیی لە ڕێگەی وتاردان لە بۆنەو ئاهەنگە ئیسلامییەکانو چاپکردنو بڵاوکردنەوەی کتێبو گۆڤارو ئەنجامدانی گەشتو جەختکردنەوە لەسەر مەسەلە ڕەوشتییەکانو بواری خێرخوازی توانیبووی ژمارەیەکی زۆر ئەندام لەخۆی کۆبکاتەوە[5]، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی کۆمەڵە چەند لیژنەیەك دروستکرابوونو کارەکانیان ڕادەپەڕاند[6].

---

[1] العدد (١٩٢)، السنة السادسة، ٩ جماد الاخرة ١٣٥٤ هـ ل٢١.

[2] الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ل٨٣٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٣٢.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤٧.

[5] سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤٧؛ لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەدا جەخت لەسەر (٦) ئامانجی سەرەکی کراوەتەوە کە بریتین لە:

أ- بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام بەشێوەیەك لەگەڵ گیانی سەردەم بگونجێت.

ب- کارکردن بۆ لێك نزیککردنەوەی گەلانی موسڵمانو بەهێزکردنی پەیوەندی لە نێوانیاندا.

ت- بەرەنگاربوونەوەی ئیلحادو پڕوپاگەندەی ناحەزانی ئیسلام.

پ- بڵاوکردنەوەی زانستە ئیسلامییەکانو چاکسازی لە پرۆگرامی خوێندن.

ج- بنبڕکردنی فەسادو ڕەوشت نزمی.

ح- هاندانی دەوڵەمەندان بۆ بەخشینو ئەنجامدانی پرۆژەی خێرخوازی.

بڕوانە: لسان الهداية، العدد(٢٠٠)، السنة السادسة، ٢١ شعبان ١٣٥٤هـ، ل١

[6] ئەو لیژنانە بریتی بوون لە: لیژنەی وتاربێژیو ئامۆژگاری، لیژنەی زانستی ، لیژنەی ئاوەدانکردنەوە. بڕوانە: الدليل العراقي الرسمي لسنة ١٩٣٦، ل٨٤٨.

گۆڤاری (الصراط المستقیم) باس لە چالاکییەکی کۆمەڵە دەکات لە سلێمانیو لەو بارەوە نووسیویەتی: بە مەبەستی هاوکاریکردنی لێقەوماوان کە بە هۆی باران بارینو لافاوەوە زیانیان لێکەوتبوو، وەفدێك بە لێپرسراوێتی حاجی نوعمان ئەفەندی ئەعزەمی ئەندامی ئەنجومەنی کۆمەڵەی ڕێنمایی ئیسلامیی سەردانی سلێمانی کردو بڕی (٢٥٠) دینار بەمەبەستی هاوکاریکردنی لێقەوماوان تەرخان کرا، ناوبراو لە سلێمانی وتاریداو ژمارەیەکی زۆر خەڵك لەدەوری کۆبویەوەو پەرۆشی خۆیو عێراقییەکانی بۆ خەڵکی سلێمانی دەربڕی[١].

چالاکییەکانی کۆمەڵەی ڕێنمایی ئیسلامیی مایەی ڕەزامەندی حکومەتی پاشایەتی نەبوو، هەر ئەمەش وای لە حکومەت کردووە چەند جار هەفتەنامەکەیان پێدابخاتو چالاکییەکانی کۆمەڵە سنووردار بکات[٢]، هەر چۆنێك بێت چالاکی جۆراوجۆری ئەو کۆمەڵانە بوونە سەرەتایەك بۆ چەندین کۆمەڵەی تر، بە تایبەتیش لە دوای جەنگی دووەمی جیهانو بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان موسلمین، ئیخوان لە ئەزموونی ئەو کۆمەڵانە سوودمەند بوونو شوێن پێیان هەڵگرتن.

---

[١] العدد (١١٥)، السنة الثالثة، ١٠ شعبان ١٣٥١ هـ، ل١٤.

[٢] هەفتەنامەی (لسان الهدایة) لە وتارێکیدا لە ژێر ناونیشانی (للتاریخ) گلەیی کۆمەڵە بەرامبەر حکومەت دەردەبڕێت لەوەی چەند جار هەفتەنامەکەی پێداخستون، ئەمەش وای لە کۆمەڵە کردووە هەر جارەو لە ژێر ناوێکی نوێ درێژە بە هەفتەنامەکە بدات، لەو ڕووەوە گۆڕانی ناوی هەفتەنامەکە لە (الهدایة) بۆ (صدی الإسلام، تنویر الافکار، الصراط المستقیم، لسان الهدایة، ...) بەڵگەی ئەو ڕاستییەیە. بڕوانە: لسان الهدایة، العدد(١٨٨)، السنة السادسة، ٣ جماد الاولی ١٣٥٤ هـ، ل٢ ـ ٣.

## باسی یەکەم: بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان لە عێراق

دوای دامەزراندنی ڕێکخراوی ئیخوان موسلمین لە میسر ساڵی (١٩٢٨ز) لەسەر دەستی حەسەن بەننا (١٩٠٦ ـ ١٩٤٩ز)[1]، کارو چالاکی ئەو ڕێکخراوە فراوان بوو، بیری ئیخوان لە ڕێگەی نێردراوە تایبەتییەکانی ئیخوانو ئەو خوێندکارانەی دەچوونە میسر بۆ خوێندن بەزۆربەی جیهانی ئیسلامییدا بڵاوبووەوە، بڵاوکراوەکانی ئیخوان بە تیراژێکی زۆر چاپ دەکرانو دەگەیەنرانە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی عەرەبیو ئیسلامیی، ئەمەش بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوانی فراوانتر کرد.

سەرەتای گەیشتنی بیری ئیخوان بە عێراق، لە ڕێگەی چەند مامۆستایەکی میسرییەوە بوو، کە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بیری ئیخوان هاتبوونە عێراق، سەرەتای ساڵی (١٩٤٠ز) کۆمەڵێك مامۆستای میسری هاتنە عێراق، لە ناویاندا شێخ ئەلئەحمەر لە ناوچەی بەسرەو زوبێر کەوتە بڵاوکردنەوەی ئەو بیرە[2]، بە هەمان شێوە ساڵی (١٩٤٢ز) لەسەر ڕاسپاردەی سەرکردایەتی ئیخوان، (حسێن کەمالەدینو موحەممەد عەبدولحەمید ئەحمەد) هاتنە عێراق تا بیری ئیخوان بڵاوبکەنەوە[3]، حسێن کەمالەدین لە کۆلێجی ئەندازیاریو موحەممەد عەبدولحەمید ئەحمەد لە پیشەسازی بەغداد بوونە مامۆستا[4]. ئەحمەد کامیل مەنوفی یەکێکی دی بوو لە مامۆستا میسرییەکانو لە موسڵ نیشتەجێ بوو، ناوبراو بیری ئیخوانو بڵاوکراوەکانی بڵاودەکردەوەو هانی گەنجەکانی دەدا بۆ خوێندنەوەیان[5]. هەر لەو ماوەدا عەلی عەبدولحەفیز لە کۆلێجی ئەندازیاری، مەحمود یوسف مامۆستای

---

[1] حسن البنا: مذكرات الدعوة والداعية، مطبعة أنوار دجلة ، بغداد٢٠٠٤، ل٨٣.

[2] الدكتور عثمان علي: مقابلة ولقاء هام بين مجلة ئالای ئیسلام والدكتور طه جابر العلواني، مجلة ئالای ئیسلام، العدد (٣)، السنة السابعة، أيلول ١٩٩٣، ل١٢.

[3] د. عبدالفتاح علي البوتاني: الحياة الحزبية في الموصل ١٩٢٦ ـ ١٩٥٦، الطبعة الأولى، مطبعة وزارة التربية، أربيل ٢٠٠٣، ل٢٧١. بۆچوونی ئەوەش هەیە ئەو دوو کەسە ساڵی (١٩٤٤) هاتبنە عێراق. بڕوانە: د. محسن عبدالحميد: تاريخ جماعة الاخوان المسلمين في العراق ١٩٤٥– ١٩٦٦، ب. ش، ب. م، ل٦١.

[4] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٣٦٧.

[5] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦٨.

زمانی عەرەبی، مەحمود نوحاس‌و مەمدوح ئەزەل لە ئامادەیی پیشەسازی بەغداد بوونە مامۆستا[1].

حسێن کەمالەدین مامۆستایەکی چالاك بوو، هەر لە سەرەتاوە خۆی بۆ بڵاوکردنەوەی بیری ئیخوان یەکلاکردەوە، ناوبراو لە ڕێگەی وتاردان‌و بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی حەسەن بەننا بەسەر خوێندکارانداو ئەنجامدانی گەشتی قوتابخانە، کاریگەری کردە سەر خوێندکاران‌و دواتر ئەم چالاکییانە گۆڕا بۆ کۆبوونەوەی حەفتانە لە ماڵێکی گەڕەکی ئەعزەمییە، پاش زۆربوونی ژمارەی بەشداربووان کۆبوونەوەکان گواسترانەوە بۆ باخچەو هۆڵی کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان، دەرەنجامی ئەم کۆبوونەوانە یەکەم شانەی ڕێکخستن لە بەغداد لە ناو خوێندکارانی کۆلێجی ئەندازیاری پێکهات لە: ئیحسان شێرزاد*، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، عەدنان ڕانیەیی، تەحسین عەبدولقادر، عەبدوڵڵا حاجی سەلیم، تۆفیق وەتاری، نافع حمودات، حامد حسێن‌و چەند کەسێکی تر، کۆبوونەوەکانیش لە ماڵی عەدنان ڕانیەیی‌و مەلا مەعتوق بەڕێوە دەچوون[2].

وردە وردە سنووری ڕێکخستن فراوان بوو، هەر لەو ماوەدا چەندین خوێندکاری تر لە کۆلێجەکانی دیکە بوونە ئەندامی ئیخوان، لەوانە: یاسین مەسعودی – کۆلێجی ماف، عەبدوڵڵا عەنیزی – کۆلێجی پزیشکی، نەشئەت موحەممەد – خانەی مامۆستایان، عادل شاکر –خانەی زانست، سلێمان ئەلقابلی – کۆلێجی ماف، نیزامەدین عەبدولحەمید –خانەی زانست[3].

---

[1] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٦٢.

* ئیحسان شێرزاد: ساڵی (١٩٢٥) لە هەولێر لەدایك بووە، ساڵی (١٩٤٦) کۆلێجی ئەندازیاری تەواو کردووە، ساڵی (١٩٥٠) ماستەری لە زانکۆی میشگان وەرگرتووە، ساڵی (١٩٨٧) لە زانکۆی کالیفۆرنیا دکتۆرای وەرگرتووە، لە نێوان ساڵانی (١٩٦٧– ١٩٧٤) پێنج جار بۆتە وەزیری ئەشغال‌و نیشتەجێکردن‌و شارەوانی، لە (١٩٧٢– ١٩٧٦) سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد بووە. جمال بابان: هەمان سەرچاوە، ل٣٦– ٣٨.

[2] د. محسن عبدالحمید: تاریخ جماعة الاخوان، ل٦١–٦٤؛ ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٦٢– ٦٤.

[3] جاسم محمد عبدالله نجم اللهیبي: محمد محمود الصواف (١٩١٥ – ١٩٩٢) دراسة في سیرته ودوره الدیني والسیاسي، رسالة ماجستیر غیر منشورة تقدم الی کلیة الاداب في جامعة الموصل، سنة ٢٠٠٥، ل٦٤– ٦٥.

هەر لەسەرەتای چلەکانیشەوە گۆڤاری (الإخوان المسلمون)و بڵاوکراوەکانی تری ئیخوان دەگەیشتنە عێراق‌و تەنانەت لە شاری موسڵ بە ئاشکرا دەفرۆشران[1].

لە سەرەتای چلەکانەوە بیری ئیخوان لە ناوچەکانی ناوەڕاست‌و باشووری عێراق بڵاوبویەوە، گۆڤاری (الاخوان المسلمون) دەستاو دەستی دەکردو لە ناو ژمارەیەك گەنجدا دەخوێندرایەوە، بە تایبەتیش لە بەسرە چەند کەس بەو بیرە کاریگەر بوون[2]. سەوافیش لە دوای گەڕانەوەی لە میسر، چەند جار سەردانی ئەو شارەی کردوو وتاری دەدا، ئەمەش هێندەی تر کاریگەری لەسەر دروست کردن، زۆرێك لەو گەنجانەش بوونە ئەندامی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی‌و لە بۆنەکاندا ئاهەنگیان سازدەداو زەهاوو سەواف‌و عەبدوڕڕەحمان خزر دەچوون وتاریان دەدا[3].

لە ساڵی (١٩٤٥)ەوە لە عەممارە بیری ئیخوان بڵاوبویەوە، لە زوبێریش کتێبخانەی ئیخوان موسلمین کرایەوەو سەوافیش چەند جار سەردانی کردوەو وتاری تێدا داوە[4]، لە سەرەتای پەنجاکانیشدا بیری ئیخوان گەیشتە رووماددی‌و جموجۆڵ‌و چالاکییان هەبوو[5].

هەر وەکو پێشتر ئامازەمان پێدا، کەناڵێکی بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان ئەو خوێندکارانە بوون کە بۆ خوێندن دەچوونە میسر، ساڵی (١٩٣٩ز) کۆمەڵێك خوێندکاری

---

[1] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧١.

[2] لەو کەسانەی لە بەسرە کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیری ئیخوان، عەبدولهادی باحسێن، یەعقوب باحسێن، عەبدوسەمەد رەدینی، عەبدوڵلا زەکیر، موحەممەد فازیل لەفتە، تەها ئەلبەسری، عەبدولعەزیز ئەلمەناسیر، عەبدولحەمید رەدینی، خەلیل عەقرەب، عەبدولعەزیز عەبدولجەبار وەتلر، جاسم موحەممەد ساڵح، مەهدی سامەڕائی، قەیس قیرتاس. بڕوانە: ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٧٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

[5] لەو کەسانەی لە رووماددی کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیری ئیخوان: فازیل مەحمود، عەبدولنەبی شەبیب، یوسف دووری، عەبدولعەزیز عەواد ئەلکوبەیسی، حەسەن عەلی عەبدولناسر ئەلساتوری، خەلەف عەبید ئەلفەراجی،... هتد. د. محسن عبدالحميد: تاريخ جماعة الاخوان، ل١٠٩

عێراق نێردران بۆ ئەزهەر بۆ خوێندن[1] ، موحەممەد مەحمود سەواف* (١٩١٥ – ١٩٩٢ز) یەکێك بوو لەو خوێندکارانەو لەوێ بە بیری ئیخوان ئاشنابوو، بەلام بە هۆی هەلگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانی سەواف گەڕایەوە عێراق[2] .

دوای گەڕانەوەی سەواف بۆ موسڵ، ویستی بە هاوکاری (عەبدوڕڕەحمان سەید مەحمود، عەبدوڕڕەحمان مەحمود ئەلئەڕحیم) کە دوو بازرگانی شارەکە بوون لقێکی ئیخوان بکاتەوە، بەلام حکومەت داواکەی ڕەت کردەوە[3] .

---

[1] ئەو کۆمەڵە خوێندکارە بریتی بوون لە: موحەممەد مەحمود سەواف، ئەحمەد جەرجیس خەیات، موحەممەد عەلی عەزیز، جەلال حەنەفی، شاکر بەدری، موحەممەد تۆفیق خەیات، موحەممەد حەبیب هاشمی، عەبدولموحسین حەبیب هاشمی، عەبدوللا عەبدوڕڕەحمان قزلجی، عەبدولوەهاب موحەممەد ئەمین سالحی. جاسم محمد عبدالله نجم اللهیبي: هەمان سەرچاوە، ل٢٠.

* موحەممەد مەحمود سەواف: موحەممەد مەحمود عوسمان بەگی تائی، لە (١٢ ئاب ١٩١٥) لە موسڵ لەدایك بووە، لای زانایانی موسڵ دەستی داوەتە خوێندن‌و پاشان چۆتە قوتابخانەی فەیسەلیە، ساڵی (١٩٤٦) لە ئەزهەر ماستەری بەدەستهێناوە، پاشان گەڕاوەتە عێراق‌و لە کۆلێجی شەریعە بۆتە مامۆستا، چەندین ساڵ چاودێری گشتیی ئیخوان موسلیمن بووە لە عێراق، ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە بلاوکردنەوەی بیری ئیخوان لە عێراق، لە دامەزراندنی چەندین کۆمەڵەی ئیسلامیی بەشدار بووە،،ساڵی (١٩٥٩) چۆتە دەرەوەی عێراق‌و لە سعودیە نیشتەجێ بووە، لەوێش چەندین پۆستی بالای وەرگرتووە. لە (٩ تشرینی یەکەمی ١٩٩٢) لە هۆلی فڕۆکەخانەی ئەستەنبوڵ گیانی لەدەستدا. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ژیان‌و کارو چالاکی سەواف بڕوانە: جاسم محمد عبدالله نجم اللهیبي: هەمان سەرچاوە.

[2] محمد محمود الصواف: من سجل ذکریاتي، دار الاعتصام للطبع والنشر والتوزیع، الطبعة الاولی، القاهرة ١٩٨٧، ل٩٣.

[3] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧١. سەواف لە بیرەوەرییەکانیدا ناوی کەسەکان ناهێنێ‌و تەنها باس لەوە دەکات کە لەگەڵ کۆمەڵێك گەنج ویستیان لقێکی ئیخوان لە موسڵ بکەنەوە. بڕوانە: محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل٩٦. هەندێ سەرچاوە باس لەوە دەکەن، کە ئەو دوو بازرگانە بە هاوکاری سەواف ساڵی (١٩٤٠) کۆمەڵەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە (جمعیة الامر بالمعروف والنهي عن المنکر)یان لە موسڵ دامەزراندووە، بۆچوونی ئەوەش هەیە ئەم کۆمەڵەیە لە سییەکاندا بەر لە ڕۆیشتنی سەواف بۆ ئەزهەر دامەزراوە. بڕوانە: ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٥٣. سەواف لە بیرەوەرییەکانیدا باسی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە دەکات کە لەگەڵ عەبدوڕڕەحمان سەید مەحمودو عەبدوڕڕەحمان مەحمود ئەلئەڕحیم دایانمەزراندووە، بەلام هیچ ئاماژەیەك بە ساڵی دامەزراندن ناکات. بڕوانە: محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل٦٣.

ساڵی (١٩٤٣ز) جارێکی تر سەواف لەسەر خەرجی (مستەفا سابونچی) کە دەوڵەمەندێکی موسڵە نێردرایەوە میسر بۆ خوێندن، سەواف ئاشنایەتی لەگەڵ حەسەن بەننا پەیدا کرد بوو، ئەویش وەکو ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری ئیخوان لە میسر ناساندی[1]. لەو ماوەدا کە سەواف لە ئەزهەر دەیخوێند، مامۆستا میسرییەکان لە عێراق چالاکانە هەڵدەسوڕانو بیری ئیخوانیان بڵاودەکردەوە، لەو ڕووەوە لە (٢٤ مایسی ١٩٤٥ز) حسێن کەمالەدینو موحەممەد عەبدولحەمید ئەحمەد سەردانی موسڵ دەکەنو بە هۆی عەبدوڕڕەحمان سەید مەحمود ئاشنایەتی لەگەڵ ژمارەیەك زانای شارەکە پەیدا دەکەنو چەندین دیدارو کۆبوونەوە ئەنجام دەدەن، بەمەش ژمارەیەك گەنج لە دەوری بیری ئیخوان کۆدەبنەوە، لەپاڵ ئەمەشدا بڵاوبوونەوەی گۆڤاری ئیخوان موسلمین لە موسڵ زەمینەیەکی زیاتری بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوانی سازدا، بەم شێوە بیری ئیخوان لە چەندین شارو شارۆچکەی تری عێراق لایەنگرو هەواداری پەیداکردو تەنها لە هۆنینەوەو ڕێکخستنێکی فەرمی کەم بوو[2]. هەردوو حسێن کەمالەدینو موحەممەد عەبدولحەمید لە (ئەیلولی ١٩٤٥) جارێکی تر سەردانی موسڵیان کردو چەند ڕۆژێك مانەوە، لەو سەروبەندەشدا عەبدوڕڕەحمان سەید مەحمودو ژمارەیەك دەوڵەمەندو کەسایەتی موسڵ بڕی (٥٠٠٠) جونەیهی میسریان بەخشی بۆ کڕینی بینایەك بۆ بارەگای گشتیی ئیخوان موسلمین لە مەیدانی حلمیە لە قاهیرە[3]. بێگومان بیری ئیخوان لە موسڵ لەچاو شارەکانی دیکەی عێراق زیاتر برەوی هەبوو لایەنگری پەیداکرد[4].

---

[1] محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل٩٦.

[2] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٢؛ جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل٥٨.

[3] ايمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٥٧- ٥٨.

[4] دووخاڵ لە بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان لە موسڵ ڕۆڵیان بینی، یەکەم: لە کۆتایی سەدەی نۆزدە بزووتنەوەیەکی سەلەفی لە شاری موسڵ سەریهەڵدا، (شێخ عەبدوڵلا ئەلنعمە) زانایەکی شارەکە بوو، ڕێبەرایەتی ئەم بزووتنەوەی دەکرد، بەمەش زەمینەی بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان لەباربوو. دووەم: تایبەتمەندیی پێکهاتەو پێگەی جوگرافی موسڵو بوونی چالاکی موژدەدەرەکان لەو شارەدا وای کرد

سەواف لە میسر خوێندنی تەواوکرد،ساڵی (١٩٤٦) گەڕایەوە عێراق و دەستی کردە بانگەشەکردن بۆ بیری ئیخوان[١]، ئەمەش بەکردەیی کردنی ئەو بەڵێنەبوو، کە دابووی بە حەسەن بەننا بۆ بڵاوکردنەوەی بیری ئیخوان لە عێراق[٢]. بەر لە گەڕانەوەی سەواف لە میسر، حەسەن بەننا ئاهەنگێکی ڕێزلێنانی بۆ ڕێکخست، لەو ئاهەنگەدا حەسەن بەننا وتاریداو ستایشی زۆری سەوافی کرد، لە کۆتایشدا سەواف وەکو چاودێری گشتیی ئیخوان لە عێراق دەستنیشان کرا، ئەویش بەیعەتی بە حەسەن بەننا دا[٣].

لە دوای گەڕانەوەشی، سەواف لەگەڵ کۆمەڵێك گەنج داوایەکیان پێشکەشی وەزارەت کرد بۆ دروستکردنی کۆمەڵەیەك بە ناوی ئیخوان موسلمین، بەڵام حکومەت داواکەیانی ڕەتکردەوە[٤].

---

بیری ئیخوان وەکو پەرچەکردارێك زیاتر خۆی بنوێنێ. د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧١؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

[١] کۆمەڵێك نووسەر: هەمان سەرچاوە، ل٦٥.

[٢] سەواف لە بیرەوەرییەکانیدا باس لە دوا دیداری خۆی لەگەڵ بەننا دەکات و دەڵێت: موحەممەد عەبدولحەمید ئەحمەد ئامادەی دانیشتنەکە بوو، موحەممەد دەربارەی ئەزموونی خۆی لە عێراق دەدواو ئەوەی دەربڕی کە عێراق کەڵکی بانگەوازی نییەو گونجاو نییە. سەواف بەمە نیگەران دەبێت و دەکەوێتە سەرزەنشت کردنی موحەممەد، پاشان بەڵێن بە حەسەن بەننا دەدات بگەڕێتەوە عێراق و لقی ئیخوان بکاتەوەو ببێتە جێگری بەننا لە عێراق. بڕوانە: محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل١٠١– ١٠٢. دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی دەربارەی دیداری سەواف لەگەڵ حەسەن بەننا دەڵێت: سەواف لە میسر چاوی بە حەسەن بەننا کەوت و پێشنیازی کرد چالاکی ئیخوان بۆ عێراق بگوێزرێتەوەو لقێکی ئیخوان بکرێتەوە، حەسەن بەننا بەگومانەوە لەم پێشنیازەی ڕوانی و وتی: وای دەبینم عێراق دوا وڵات بێت بانگەوازی ئیخوانی تێدا بڵاوبێتەوە، بەڵام ئەی شێخ کە تۆ دەبینی زەوییەکە بەپیتە لەسەر بەرەکەتی خوا دەستپێبکە. بڕوانە: الدکتور عثمان علي: مقابلة ولقاء هام بين مجلة ئالای ئیسلام والدکتور طه جابر العلواني، ل١٢.

[٣] ئەم زانیارییە لە وتارێکدا بڵاوکراوەتەوە کە ئەحمەد عەبدولغەفور عەتار لە ستایشی سەوافدا نووسیویەتی و لە بیرەوەریەکانی سەوافدا وەکو پاشکۆیەك بڵاوکراوەتەوەو ساڵی ئاهەنگەکەشی بە ساڵی (١٩٤٣) نووسیوە کە ئەمە هەڵەیە. بڕوانە: محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل٤٦٨.

[٤] عبدالجبار حسن الجبوري: الأحزاب والجمعیات السیاسیة في القطر العراقي ١٩٠٨ ـ ١٩٥٨، بغداد ١٩٧٧، ل١٩٩.

هەر لەو ساڵەدا سەواف لە کۆلێجی شەریعەی بەغداد بووە مامۆستا، ناوبراو لەوێ کەوتە چالاکیو بە هاوکاری (ئەمجەد زەهاوی، کەمالەدین تائی، مەلا مەعتوق، پارێزەر عەبدوڕڕەحمان خزر، ناجی مەعروف، عەبدولوەهاب سامەڕائی) داوایەکیان پێشکەشی وەزارەتی ناوخۆ کرد، بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی (جمعية الآداب الإسلامية)و لە (٢٢ ئابی ١٩٤٦ن) وەزارەت ڕەزامەندی لەسەر داواکەیان نواندو کۆمەڵە بە فەرمی دامەزرا[١].

دوای دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل، مەسەلەی ڕزگارکردنی فەلەستین لە تەواوی جیهانی ئیسلامیی دەنگۆی هەبوو، هەر ئەمەش وای کرد کۆمەڵەی ڕزگاری فەلەستین (جمعية إنقاذ فلسطين) لە (١٩٤٨ن) لە عێراق دامەزرا[٢]، بە ناوی ئەم کۆمەڵەوە کۆمەکو یارمەتی کۆدەکرایەوەو خۆبەخشەکان دەنێردران بۆ فەلەستین. بەڵام هەر زوو بارەگای کۆمەڵە بووە شوێنی چاوپێکەوتنو کۆبوونەوەو دیداری ئەندامانی ئیخوان[٣]. پاشان لە (٢٢ ئاب ١٩٤٩) مۆڵەت درایە کۆمەڵەی پەروەردەی ئیسلامیی (جمعية التربية الاسلامية) و شێخ ئەمجەد زەهاوی بووە سەرۆکو گۆڤاری (التربية الاسلامية) بووە زمانحاڵی کۆمەڵە[٤].

---

[١] کاظم أحمد المشايخي: الامام امجد، ل١٨٩. بۆچوونی ئەوەش هەیە جگە لەوانەی ناومان بردوون چەند کەسێکی دیکەش لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی بەشدار بوون، لەوانەش: موحەممەد تەها فەیاز، عەبدولعەزیز بەغدادی، فوئاد ئەلوومەری، ئیبراهیم عەتارباشی، عەبدوڕڕەحیم کوردی، دکتۆر سەبری موراد. بڕوانە: جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل٤٢- ٤٣. هەروەها زانای کورد نەجمەدین واعیز سەرۆکی کۆمەڵە بووە. بڕوانە: محمد زكي حسن أحمد: هەمان سەرچاوە، ل١٣٢؛ ايمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٦٧، پەراوێزی ژمارە (٣).

[٢] دوای ڕەزامەندی وەزارەتی ناوخۆ، کۆمەڵە بە فەرمی دامەزراو دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردرا کە پێکهاتبوو لە: (ئەمجەد زەهاوی – سەرۆک، حسێن فەوزی – جێگری سەرۆک، پارێزەر عەبدوڕڕەحمان خزر – ژمێریار، موحەممەد مەحمود سەواف – ئەمینداری گشتی". کاظم أحمد المشايخي: الامام امجد، ل١٩١؛ محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل١٧٤.

[٣] د. طه جابر العلواني: أضواء على تاريخ الحركة الإسلامية في العراق، مجلة ئالای ئیسلام، العدد (٩)، السنة التاسعة، إبريل ١٩٩٥، ل١٢.

[٤] کاظم احمد المشايخي: الامام امجد: ١٩٣- ١٩٧.

سەواف لە ناو ئەو کۆمەڵانەدا چالاکانە هەڵدەسوڕا، بەلام هەر زوو لەگەڵ ژمارەیەك ئەندامی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی، ناکۆکی بۆ دروست بوو، ئەمەش وای لە سەواف کرد دەستبەرداری کۆمەڵە بێتو لەگەڵ ئەمجەد زەهاوی لە (١٣ ئەیلول ١٩٤٩)ن کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی (جمعية الاخوة الإسلامية) دامەزراند[١].

کۆمەڵەی برایەتی، چالاکترین کۆمەڵەی ئیسلامیی ئەو سەردەم بوو، ببوە ڕووکارێك بۆ کاری ئیخوان لە عێراق، لە چەندین شارو شارۆچکە لقی کردەوە، لەناو زانکۆو پەیمانگاکان ئەندامو لایەنگری پەیدا کرد، گۆڤاری (الاخوة الإسلامية) زمانحاڵی کۆمەڵە، بە تیراژێکی زۆر بیرو بۆچوونو چالاکی کۆمەڵەو وتاری بلاودەکردەوە[٢].

هەر لەو ماوەشدا، ئیخوان گرنگی بە چالاکی ئافرەتان داو کۆمەڵەی خوشکی موسڵمان (جمعية الاخت المسلمة) دامەزرێنرا[٣].

---

[١] بە پێی ماددەی چواردەی یاسای بنەڕەتی کۆمەڵە، دامەزرێنەرانی بریتین لە: (ئەمجەد زەهاوی - سەرۆك، موحەممەد عاسم ئەلنەقیب - جێگری سەرۆك، موحەممەد مەحمود سەواف - سکرتێر، ئیبراهیم مستەفا ئەلئەیوبی - ئەمین سندوق، دکتۆر تەقیەدین هیلالی، پارێزەر عەبدوڕڕەحمان خزر- ئەندام، موحەممەد تەها فەیاز- ئەندام، مەلا موحەممەد قزڵجی). ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٩٠- ٩٣. سەواف لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی: لەگەڵ عاسم نەقیبو دکتۆر تەقیەدین هیلالیو مەلا موحەممەد قزڵجیو ئیبراهیم ئەیوبیو شێخ ئەمجەد زەهاویو چەند کەسێکی تر کۆمەڵەی برایەتیمان دامەزراند. بڕوانە: محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل١١٠.

[٢] کاظم أحمد المشایخي: الامام امجد، ل١٩٨ ـ ١٩٩.

[٣] دامەزرێنەرانی بریتی بوون لە:( نەهال ئەمجەد زەهاوی ـ سەرۆك، فاتمە پاچەچی، بەهیرە خوجە، نەزیرە خوجە، خەیریە زەهاوی، عەدەویە شەواف، سەفیە ئەترەقچی، زوهرە خزر، نەجیبە خزر، ئامینە موحەممەد عەلی). محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل١٢٠؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٧. لە سەرەتادا ئافرەتان وەکو لقی ئافرەتان لە ناو کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی کاریان دەکرد، بەلام لە (١٩٥٥) مۆڵەتیان لە حکومەت وەرگرتو لە ژێر ناوی (کۆمەڵەی خوشکی موسڵمان) دەستبەکار بوونو تا ئێستاش لە بەغداد بارەگایان هەیەو لە ژێر ئەو ناوەدا کاری خۆیان دەکەن. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کارو چالاکی ئەو ڕێکخراوە بڕوانە: ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٥١- ١٥٧.

تا ساڵی (١٩٥٤ن)و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی لەلایەن دەسەڵاتەوە، بە سەردەمی زێرینی کاری ئیخوان دادەنرێت[١]، بەڵام لەو مێژووەوە تا شۆڕشی (١٩٥٨ن) جارێکی تر ئیخوان بە شێوەیەکی نهێنیی لە چەند کەناڵی جۆراو جۆرەوە کاری دەکرد، دەکرێت ئەم ماوە بە قۆناغی خاوبوونەوەو ڕووکردنە پەروەردەو پەرتبوونی ڕیزەکانی ئیخوان ناوزەد بکەین[٢].

کاتێك شۆڕشی (١٩٥٨ن) ڕوویدا، لە زۆربەی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانەوە بانگەشەی ئەوە دەکرا پارتەکان چالاکییان ڕاگرن تا دەرفەت بۆ حکومەتی شۆڕش بڕەخسێ کار بۆ هێنانەکایەی دۆخێکی باشتر بکات، جگە لە ئیخوان هیچ پارتو ڕێکخستنێکی دیکە بەدەم ئەم بانگەشەوە نەچوو، ئیخوانەکان پاش ماوەیەك زانیان تاکە گروپن چالاکییان وەستاندووە، جارێکی دی وەکو ڕێکخراوێکی نهێنی دەستییان دایەوە کار، بەڵام هیچ شتێکی فەرمیان ڕانەگەیاند، لەو ماوەدا بڵاوکراوەکانی ئیخوان بە ناوی بەرەی ئیسلامییو کوتلەی ئیسلامیی دەردەچوو، وەلێ زۆرێك لە خەڵکی دەیانزانی ئیخوان لە پشت ئەو کارەوەیە[٣].

---

[١] عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٣.

[٢] الدکتور عثمان علي: مقابلة ولقاء هام بین مجلة ئاڵای ئیسلام والدکتور طه جابر العلواني، ل١٣.

[٣] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٣. لەسەردەستی ژمارەیەك لەو کەسانەی وازیان لە ئیخوان هێنابوو، لەدوای (١٤ تەمموز ١٩٥٨) بەرەی ئیسلامیی دەرکەوت، بەرە لە سەرەتادا پێکهاتبوو لە: عەبدولغەنی شەندالە، موحەممەد ئالوسی، موحەممەد سالم زەیدان. دواتریش کاریگەی بەرە موسڵی گرتەوەو هەریەکە لە: غانم سەفار، یەحیا عەللاوی، عەبدولحافز سلێمان، حازم حاجی داود، عەبولئیلا حەمدانی، ئەحمەد عەلی دەباغ، جەمال عەلی بەرزنجی، عەبدولحافز مەجید، هیشام تالیب، عیسام تالیب هاتنە ڕیزی بەرەوە، ئەم گروپە خوازیاری ئەوە بوون زوو دەسەڵاتی وڵات بگرنە دەست، لەمەشدا لەگەڵ سەرکردەکانی ئیخوان ناکۆك بوون، دوای بەهێزبوونی بەرە لە موسڵ، چاودێری گشتیی ئیخوان (سەواف) گەیشتە موسڵو هەردوولا (بەرەی ئیسلامییو ئیخوان) کۆبوونەوەو بڕیاریاندا کاری هاوبەش بکەن، بەڵام پاش ماوەیەك بەرەی ئیسلامیی بڵاوکراوەیەکیان بە ناوی بەرەوە بڵاوکردەوە، لە بەرانبەریشدا ئیخوان لەبەر ئەوەی بە نهێنیی کاریان دەکرد بڵاوکراوەیەکی تایبەتییان بە ناوی کوتلەی ئیسلامییەوە بڵاوکردەوە، ئەمەش تا ڕاگەیاندنی حزبی ئیسلامیی درێژەی کێشا. ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٦٧.

دوای شۆڕشی (١٩٥٨ز)، بیری چەپ بە تەواوی لە گۆڕەپانی سیاسیی عێراق پەرەیگرت، وەك پەرچەکردار بۆ بیری چەپو شیوعییەت ئیخوان لە گۆڕەپانەکەدا دەبینرا، ئیخوانو شیوعییەت بە تەواوی لە یەکتر دڕدۆنگ بوون، وەکو دوو نەیاری یەکتری کاریان دەکردو بەمەرگی یەك تینو بوون. کاتێکیش لە ئازاری (١٩٥٩ز) جوڵانەوەی شەواف[١] لە موسڵ سەریهەڵدا، دوای شکست هێنانی جوڵانەوەکە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ئیخوان کوژران، ئەمەش نەك لەبەر بەشداریکردنییان لە جوڵانەوەی شەواف، بەڵکو کاتێك جوڵانەوەکە شکستی هێنا، شیوعییەکان کەوتنە کوشتنو ڕاوەدوونانی نەیارانییان، ئەم بارەش تا کۆتایی (١٩٥٩ز) درێژەی کێشا[٢].

کاتێك حکومەتی کۆماری یاسای پارتەکانی دەرکرد، ژمارەیەك لە ئیخوانە دێرینەکانو چەند کەسایەتییەکی بێلایەن، بە مەبەستی مۆڵەتدان بە دامەزراندنی (حزبی ئیسلامیی عێراقی) داوایەکیان پێشکەشی وەزارەتی ناوخۆ کرد[٣]، وەزارەتی

---

[١] ئەو جوڵانەوەیە لە (ئازاری ١٩٥٩ز) لەسەردەستی عەبدولوەهاب شەواف دژی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم لە موسڵ بەرپا بوو. دەربارەی هۆکارو ڕەوتی جوڵانەوەکەو ئاکامەکانی بڕوانە: عەبدولقادر سالح: شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عێراق، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٢٠٩ ـ ٢٣٩.

[٢] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٣. ئەمەش بەو ڕەهاییە نییە کە ئیخوان بەشداری جوڵانەوەی شەوافی نەکردووە، بەڵکو ئیخوان بەکردەوە بەشداری جوڵانەوەکە بوو، دەقی کوردی بەیاننامەی جوڵانەوەکەش لە لایەن مەلا عەبدوڵڵا ئەربیلیەوە خوێندرایەوە کە ئەندامێکی چالاکی ئیخوان بوو. بڕیاریش وابوو برێك لەو چەکانەی لە میسرەوە دەگاتە موسڵ بەسەر ئەندامانی ئیخواندا دابەش بکرێت، بەڵام گەیشتنی چەکەکان دواکەوت، زۆرێك لەو بڕوایەدان ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ سەرنەکەوتنی جوڵانەوەکەی شەواف. ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٣٦٠– ٣٦٤.

[٣] داواکارانی دامەزراندن بریتی بوون لە: ( نوعمان عەبدوڕڕەزاق سامەڕائی، ئیبراهیم عەبدوڵڵا شەهاب، سەبری مەحمود ئەللەیلە، وەلید عەبدولکەریم ئەلئەعزەمی، ئیبراهیم مونیر مودەڕیس، فلیح حەسەن سامەڕائی، فازیل دولان ئەلعانی، حەمید حاجی حەمد، حاجی مەحمود موحەممەد لافی، عەبدولجەلیل ئیبراهیم، یوسف تەها ئەلعانی، د. جاسم حەمد ئەلعانی). بڕوانە: محمد کاظم علي: العراق في عهد عبدالکریم قاسم دراسة في القوى السیاسیة والصراع الایدولوجي ١٩٥٨ ـ ١٩٦٣، مطبعة الخلود، بغداد ١٩٨٩، ل١٧٨؛ کاظم احمد المشایخي: تاریخ نشأة الحزب الاسلامي العراقي، دار الرقیم للنشر والتوزیع، الطبعة الاولى، بغداد ٢٠٠٥، ل١٦.

ناوخۆ ڕەزامەندی نەنواند، داواکە ڕەوانەی دادگای تەمیز کرا، دادگای تەمیز بڕیاری وەزارەتی ناوخۆی هەڵوەشاندەوەو بە فەرمی مۆڵەتی دامەزراندنی (حزبی ئیسلامیی عێراقی) دا[1].

حزبی ئیسلامیی، ماوەی چەند مانگێك جموجۆڵو چالاکی بەرچاوی هەبوو، بەڵام زۆری نەبرد لەلایەن حکومەتەوە مۆڵەتی لێسەندرایەوەو چالاکییەکانی قەدەغەکراو سەرکردەکانی گیرانو حزب هەڵوەشایەوە[2].

بە درێژایی سالانی شەست، ئیخوان بە نهێنی کاری دەکرد، هەر چەندە لە کودەتای (١٧ تەمموزی ١٩٦٨) ئیخوان پۆستی وەزارەتیان وەرگرت، بەڵام ئەمە درێژەی نەکێشاو لە کودەتای (٣٠ تەمموزی ١٩٦٨) بەدواوە بەعس تەنگی بە ئیخوان هەڵچنیو کەوتە ڕاوەدونانی ئەندامانی ئیخوان، سەرەنجام لە (١٩٧١/٤/٤) لەسەر زاری عەبدولکەریم زەیدانی ڕێبەری ئەوسای ئیخوانەکانی عێراق، بە فەرمی کاری ئیخوان ڕاگیرا[3].

---

[1] وەزارەتی ناوخۆ بە نوسراوی ژمارە (ش/ج/٩١٤) مێژووی (١٩٦٠/٣/٢٧) داواکەی ڕەتکردەوە، بەلام دادگای تەمیز بە بڕیاری (٢١ حزبی ئیسلامیی) مێژووی (١٩٦٠/٤/٢٦) بڕیارەکەی وەزارەتی ناوخۆی هەڵوەشاندەوەو پاشان لە (١٩٦٠/٥/٥) بە فەرمی مۆڵەتی کارکردن درا بە حزبی ئیسلامیی عێراقی. بڕوانە: الدکتور عثمان علي: مقابلة ولقاء هام بين مجلة ئالای ئیسلام والدکتور طه جابر العلواني، ل١٣. کاظم احمد المشايخي: تاريخ نشأة، ل٢٠– ٣٢.

[2] ڕۆژنامە (الفيحاء) ڕۆژی (١٥ تشرینی یەکەمی ١٩٦٠) بەیاننامەیەکی حزبی ئیسلامیی بڵاوکردەوە، لە بەیاننامەکەدا ڕەخنەی توند لە عەبدولکەریم قاسمو حکومەتەکەی گیرابوو، دوای ئەو بەیاننامەیە، حکومەت کەوتە ڕاوەدوونانو دەستگیرکردنی سەرکردەکانی حزب، ڕۆژی (١٩٦٠/١٠/٢٠) بارەگای حزب لە بەغداد داخرا، ڕۆژی (١٩٦١/٣/٢٠) حکومەت بە فەرمی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی حزبی دەرکرد. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی حزبی ئیسلامیی بڕوانە: کاظم احمد المشايخي: تاريخ نشأة، ل١٧٦– ١٨٦؛ د. محسن عبدالحميد: الحزب الاسلامي العراقي، مرحلة تأسيس (١٩٦٠)، اصدارات الحزب الاسلامي العراقي، دار النور للطباعة، ب.م، ل٢٨– ٣٦.

[3] جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل١٣٨؛ د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

## باسی دووەم: ڕەوتی ئیسلامیی لە کوردستان لە سەردەمی پاشایەتی

هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، ڕەوتی ئیسلامیی لە ماوەی نێوان هەر دوو جەنگی جیهانیدا، لە باشووری کوردستان بە شێوازی جۆراوجۆر ئامادەیی هەبوو، بەڵام سەبارەت بە ئیخوان موسلمین وەکو بەشێکی سەرەکی ڕەوتی ئیسلامیی، دەتوانین کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان بە سەرەتای ئاشنابوونی کورد بە بیری ئیخوان دابنێین، ئەم ئاشنابوونەش لە شاری موسڵو دەرەنجامی چالاکی ئیخوانە لەو شارەدا،ساڵی (١٩٤٦ن) ژمارەیەك حاجی موسڵ لە گەشتی حەج بە هۆی عەبدوڕڕەحمان سەید مەحمودەوە چاویان بە حەسەن بەننا دەکەوێت، بەننا لەگەڵیان کۆدەبێتەوەو وتاریان بۆ دەداتو پێکەوە بڕیار دەدەن کاربکەن بۆ کردنەوەی لقێکی ئیخوان لە موسڵ[1].

دوای گەڕانەوەی حاجییەکانو چالاکی نواندن لە موسڵ، ناوی کۆمەڵێك کەس دێت کە چالاکانە هەڵسوڕاون، لەناو ئەوانەدا ناوی (مەلا عەبدوڵڵا موحەممەد ئەربیلی*،

---

[1] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٢. لە ناو حاجییەکاندا ناوی ئەم کۆمەڵە زانراوە: موحەممەد عەلی زەنون، سالم سلێمان موحەممەد بەکری، عەبدوڵڵا ئەربیلی، عەبدوڵڵا سەعید، عەبدولوەهاب ڕەشید، موحەممەد نەجیب عەلی بەزاز، عەبدولمونعیم زورەری. جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل٥٩.

* مەلا عەبدوڵڵا موحەممەد ئەربیلی، ساڵی (١٩١٤) لە هەولێر لەدایك بووە، پاشان چۆتە موسڵو دەستی داوەتە خوێندنی زانستە شەرعییەکان، دوای تەواوکردنی خوێندن بۆتە مامۆستای پەیمانگای ئیسلامیی لە موسڵ، ساڵی (١٩٨٤) کۆچی دوایی کردوە. سالم عبدالرزاق: صفحة من ثورة الموصل عام ١٩٥٩م، جريدة (القادسية)، العدد (٣١٩١)، ١١ آذار ١٩٩٠. مەلا عەبدوڵڵا لەگەڵ ئەوەدا کە بەرپرسی لقی موسڵی کۆمەڵەی برایەتیو وتاربێژی مزگەوت بوو، کەبابچیش بوو، ڕۆژێك مەلا عەبدوڵڵا لە مزگەوتی گەورەی موسڵ وتاریدا، زانای گەورەی سوریا شێخ عەلی تەنتاوی کە لەو کاتەدا لە سەردانی موسڵدا بوو، ئامادەی وتارەکە بوو، ڕۆژی دواتر تەنتاوی لەگەڵ چەند ئەندامێکی کۆمەڵەی برایەتی دەچنە چێشتخانەکەی مەلا عەبدوڵڵا ئەربیلی بۆ کەباب خواردن، تەنتاوی زۆر لە کەبابچیەکە (مەلا عەبدوڵڵا) ورد دەبێتەوەو بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت: پاکو بێگەری بۆ خوا! ئەم کەبابچیە زۆر لەو پیاوە دەچێت کە دوێنێ وتاریدا. هاوڕێکانیشی پێی دەڵێن: ئەوە هەر وتاربێژەکەی دوێنێیەو کاری کەبابچێتی دەکات. تەنتاوی زۆر پێدەکەنێتو بەو کارە دڵخۆش دەبێتو دەڵێت: دەبێت زانا بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی پشت بە خۆی

موحەممەد یاسین عەبدوڵڵا سنجاری*، هاشم عەبدولسەلام**) دێت، کە سێ زانای کورد بوون‌و لە شاری موسڵ لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە بیری ئیخوانیان بڵاودەکردەوەو چالاکانە هەڵدەسوڕان، ڕۆڵی ئەم وتاربێژانە بە شێوەیەك حکومەتی دڕدۆنگ کردبوو، بەڕێوەبەرێتی ئەوقاف ئاگاداری ئەو وتاربێژانەی کرد کە وتاری هەیینی دەبێت تەنها بۆ ئامۆژگاری‌و قسەکردن لە بابەتە ڕەوشتییەکان بێت، نەك بابەتی سیاسیی[١].

لە ساڵی (١٩٤٦ن) بەدواوە، دامەزراندنی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی، بووە کەناڵێکی باش بۆ بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوان لە زۆربەی شارەکانی عێراق‌و باشووری کوردستان، لەمەشدا خودی شێخ ئەمجەد زەهاوی، سەرۆکی کۆمەڵە ڕۆڵی بەرچاوی بینی، هەر لە چوارچێوەی چالاکی کۆمەڵەدا لە (٦/١/١٩٤٧ن) شێخ ئەمجەد زەهاوی، سەرۆکی کۆمەڵە، لە نامەیەکدا زانای ناسراوی کورد (مەلا حسێن پیسکەندی***) لە سلێمانی

---

بەستێت نەك بە حکومەت، چونکە پشت بەستن بە حکومەت دەیبەستێتەوە بە سیستمی دەوڵەتەوە. ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٢٦ پەراوێزی ژمارە (٤).

* موحەممەد یاسین عەبدوڵڵا سنجاری، ساڵی (١٩٢٥) لە سنجار لەدایك بووە، دەرچووی کۆلێجی شەریعەی بەغداد بووە، ئەندامی یەکەم شانەی ڕێکخستنی ئیخوان بووە لە کۆلێجی شەریعە، ماوەیەکی زۆر لە موسڵ مامۆستای ئامادەیی بووە، چەند بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە، ئێستا خانەنشینەو لە موسڵ نیشتەجێیە. ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٧٠ پەراوێزی ژمارە (٤)؛ محمد زكي حسن أحمد: هەمان سەرچاوە، ل٢٢٧.

** هاشم عەبدولسەلام، لە بنەماڵەیەکی کوردی باکووری کوردستانە، ساڵی (١٩٣٠) لە موسڵ لەدایك بووە، زانستی شەرعی خوێندووەو کەسێکی شارەزاو وتاربێژێکی بەتوانا بووە، لە چەندین مزگەوتی موسڵ وتاربێژ بووە، بە هۆی جوڵانەوەکەی شەواف‌و هێرشی زۆری بۆ سەر شیوعییەکان لە وتاری هەینیدا، لە (ئازاری ١٩٥٩) کوژرا. د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٣٦٩.

[١] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٤.

*** مەلا حسێن کوڕی حاجی خەلیفە پیرۆت پیسکەندییە، کە خەلیفەی کاك ئەحمەدی شێخ بووە، ساڵی (١٨٦٥ن) لە پیسکەند لە دایك بووە، دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی لەو مزگەوتەی ئێستا پێی دەڵێن مزگەوتی مەلا حسێن لە سەرشەقام دەبێتە پێش نوێژ، زانایەکی ناودارو شارەزاو بلیمەت بووە، چەند مەلا لەسەر دەستی ئەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی (١٩٤٨ن) کۆچی دوایی کردووە. عبدالكريم محمد المدرس: علماؤنا في خدمة العلم والدين، الطبعة الاولى، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٨٣، ل ١٧٦ - ١٧٧.

ئاگادار دەکاتەوە، کە بە مەبەستی کردنەوەی لقی کۆمەڵە سەردانی لایەنی پەیوەندیداری کردوەو بەوپێیەی کۆمەڵەکە ئایینیو ڕەوشتییە موتەسەڕیفەکان ڕوخسەتیان داوە لقی کۆمەڵە لە لیوای سلێمانی بکەنەوە[1].

لە درێژەی نامەکەدا، زەهاوی داوا لە پیسکەندی دەکات، بە مەبەستی کردنەوەی لقی کۆمەڵە لەگەڵ برایان سەردانی موتەسەڕیف بکەنو لە ئەنجامەکەی ئاگاداری بکەنەوە، ئەمەش گەورەترین خزمەتە بەرامبەر ئایینی ئیسلام بەجێی دێنن، لەکاتێکدا خراپە بڵاوبۆتەوەو بەدڕەوشتی پەرەی سەندووە[2].

دوای تێپەڕبوونی تۆ مانگ بەسەر نامەی پێشوو، بە نوسراوی ژمارە (٤٧) لە (١٩٤٧/٩/٢٨ن) شێخ ئەمجەد زەهاوی، ئاگاداری مەلا حسێن پیسکەندی دەکات، کە وەزارەتی ناوخۆ بە نوسراوی ژمارە (١١٨٤٦) مێژووی (١٩٤٧/٨/٢٦ن) ڕەزامەندی نواندوە لەسەر کردنەوەی لقی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی لە لیوای سلێمانی، هەر بەو بۆنەوە داوای لێدەکات لەگەڵ برایان دەستەی کارگێڕی لق هەڵبژێرنو لە ئەنجامەکەی ئاگاداری بکەنەوە[3].

پێدەچێت دوابەدوای نامەی یەکەمی زەهاوی، مەلا حسێن کەوتبێتە چالاکیو پەیداکردنی ئەندامو لایەنگر بۆ کۆمەڵە، بێگومان مەلا حسێن زانایەکی ناودارو قسە ڕۆیشتوی شار بوو، چالاکییەکانی بەرهەمی هەبوو، دەستەی کارگێڕی لق لە سلێمانی هەڵبژێردراو پێکهاتبوو لە (مەلا حسێن پیسکەندی – سەرۆکی لق، شێخ نوری بابە عەلی – جێگری سەرۆك، مەلا موحەممەد سەعید – ئەندام، جەلال ئاغا حاجی سەعید ئاغا – ئەندام، مەلا مارف – ژمێریار، حاجی عەبدولوەفا – ئەندام، عەبدوڕڕەحیم بەرزنجی – ئەندام، حاجی کەریم حاجی ساڵح – ئەندام، مەلا عەبدولقادر کۆکۆیی – باجگر)[4].

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١).

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢).

[4] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣)

دەستەی ناوبراو لەگەڵ ناوی دەستەی کارگێڕی لق، نوسراوێك ئاڕاستەی موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی دەکەن و تێیدا بە پشت بەستن بە ماددەی (٢١) لە پەیڕەوو پرۆگرامی کۆمەڵەی ناوبراو، لەسەر داوای کۆمەڵێك زاناو خانەدانی لیوای سلێمانی، دەخوازن موتەسەڕیف ڕەزامەندی لەسەر کردنەوەی لقی کۆمەڵە بنوێنێت[١].

هەر چەندە نوسراوەکەی دەستەی کارگێڕی لقی سلێمانی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی مێژووی لەسەر نییە، بەڵام پێدەچێت دوابەدوای نامەی دووەمی شێخ ئەمجەد بێت، کە ئاماژە دەدات بە ڕەزامەندی وەزارەتی ناوخۆ دەربارەی کردنەوەی لقی کۆمەڵە لە لیوای سلێمانی، ئەمەش پاش جموجۆڵو چالاکی مەلا حسێن پیسکەندیە کە بەر لەو مێژووە لە سلێمانی کەوتۆتە چالاکی نواندن.

بە سەرنجدان لە ناوی ئەندامانی دەستەی کارگێڕی کۆمەڵە، دەبینین پێکدێت لە زانایانی ئایینیو بازرگانو خانەدانو کەسایەتییە ناسراوەکانی ئەو دەمەی لیوای سلێمانی، ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە هەوڵو کۆششی مەلا حسێن، لە کۆکردنەوەی ئەندامو لایەنگر بۆ کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتو بووە.

هەر چەندە کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی، وەك بەشێك لە کاریگەری ئیخوان ئەژمار دەکرێت، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ڕەوتی ئیسلامیی لە کوردستان بە تەواوی بەو بیرە کاریگەر بووە، بەڵکو کاریگەری بیری ئیخوان لە کوردستان کەمتر هەستی پێدەکرێت لەچاو ناوچە عەرەبنشینەکاندا، ئەمەش دەرەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری خودیو بابەتییە، کە دواتر باسی لێوەدەکەین، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەر لە بنەڕەتدا کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی، بە شێوەیەکی ڕێژەیی کەوتبووە ژێر کاریگەری بیری ئیخوان، ئەگەر بەراورد بکرێت بە کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی کە بە تەواوی ببوە ڕووکاری ئیخوانو تەواوی دیدو تێڕوانینەکانی ئیخوان موسلمینی میسر لە ئەدەبیاتیدا ڕەنگی داوەتەوە.

---

[١] سەرچاوەی پێشوو.

چالاکی ئیخوان لەسەر دەستی سەواف‌و هاوکارانی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە عێراق ڕووی لە زیادی دەکرد، بوارو سنووری کار فراوانتر دەبوو، کاتێك ساڵی (١٩٤٩ز) کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی دامەزرا، کۆمەڵەی ناوبراو بووە چالاکترین کۆمەڵەی ئیسلامیی ئەو سەردەم[1]، سەواف سکرتێری کۆمەڵە، مامۆستای زانکۆو وتاربێژێکی لێهاتوو بوو، لە ناو خوێندکارانی زانکۆ، بە تایبەتیش لە کۆلێجی شەریعە، شانەی ڕێکخستنی بنیادنا، لەناو ئەو خوێندکارانەدا ژمارەیەك کوردی نیشتەجێی کەرکووکی تێدابوو، لەوانە (نیزامەدین عەبدولحەمید، موحسین عەبدولحەمید*، ئەحمەد ئەجمەدین بەرزنجی، سوبحی داودی، نورەدین واعیز**، ...)[2].

بۆچوونی ئەوەش هەیە کاری ئیخوان لە ساڵی (١٩٤٧ز) لە کەرکووك دەستی پێکردبێت، ئەویش لەسەر دەستی سلێمان موحەممەد ئەمین ئەلقابلی‌و پارێزەر نورەدین واعیز[3]، شایانی باسە حاجی سلێمان موحەممەد ئەمین ئەلقابلی دواتر لە شەقامی ئەتڵەس لە کەرکووك کتێبخانەیەکی بە ناوی (الاخوة الإسلامية) کردەوە[4]. بەزوویش خانوویەکیان پەیداکردو هەموو شەوانێکی پێنجشەممە وانەیان تێدا دەخوێند، وانەکانیش لەلایەن نورەدین واعیزو سلێمان موحەممەدو نیزامەدین

---

[1] كاظم أحمد المشايخي: الامام امجد، ل١٩٨.

* پێدەچێت موحسین عەبدولحەمید لە ناوەڕاستی پەنجاکان بەدواوە بووبێتە ئەندامی ئیخوان، چونکە ناوبراو لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٧)ەو ئەگەر لە خوێندن دوانەکەوتبێت لە (١٩٥٥) بۆتە خوێندکاری کۆلێجی شەریعە.

** نورەدین واعیز: ساڵی (١٩٢٩) لە کەرکووك لەدایك بووە، هەر لەوێ دەستی داوەتە خوێندن‌و پاشان لە بەغداد خوێندنی تەواو کردووە، شارەزاییەکی زۆری لە بواری شەریعەتدا هەبووەو ڕۆڵی بەرچاوی بینیوە لە بڵاوکردنەوەی بیری ئیسلامیی، چەند بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە. بڕوانە: محمد زكي حسن أحمد: هەمان سەرچاوە، ل٢٣٥.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩. هەندێك لەو خوێندکارانە لە کۆلێجەکانی تر بوون‌و پێشتر لە ڕێگەی مامۆستا میسرییەکانەوە پەیوەندیان بە ئیخوانەوە کردبوو.

[3] د. محسن عبدالحميد: تاريخ جماعة الاخوان، ل١٠٣.

[4] محمد نوری بازياني: مستقبل الحركة الإسلامية في كوردستان العراق، رسالة ماجستير تقدم الى جامعة العالمية للعلوم الإسلامية في لندن سنة ٢٠٠٣، ل٤٠.

عەبدولحەمیدەوە دەوترانەوە، ئەمەی دواییان فەرمانبەر بوو ساڵی (١٩٥٢) لە سلێمانییەوە گواسترابوویەوە بۆ کەرکووک[1]، بە گوتەی سوبحی داودی لە سەرەتای پەنجاکاندا لە کەرکووک ئیخوان نزیکەی (٣٠ ـ ٣٥) ئەندامی چالاکی هەبوو[2]. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئیخوان لە کەرکووک چالاکی زۆرتر بووە لەچاو شارەکانی دیکەی کوردستان.

ئیخوانەکانی کەرکووک، بەرلەوەی مۆڵەتی کردنەوەی لق وەرگرن، بە رادەیەکی بەرچاو جموجۆڵو چالاکییان هەبوو، وێڕای مزگەوتی نورەدین واعیز، لە دوکانی موحسین ئەترەقچیو ئوتوی سەید ئەحمەدو کتێبخانەکەی حاجی سلێمان کۆبوونەوەیان ئەنجام دەداو بەرنامەی پەرەپێدانی کارەکانیان دادەڕشت[3].

ئیخوانەکانی کەرکووک چالاکانە هەڵدەسوڕان، لە سەرەتای (١٩٥٣) مۆڵەتیان لە وەزارەتی ناوخۆ وەرگرتو لقی کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی لە کەرکووک کرایەوە، دەستەی کارگێڕی لق هەڵبژێردرا کە پێکهاتبوو لە: نورەدین واعیز — سەرۆك، سلێمان موحەممەد ئەمین ئەلقابیلی — جێگری سەرۆك، سەید ئەحمەد — ئەندام. لە ئاهەنگی کردنەوەی لقدا سەواف وتارێکی پێشکەش کردو هەردوو شێخ محێدین بەرزنجیو مەلا ساڵح کۆزەپانکی* لە هەولێرەوە هاتبوون بۆ ئاهەنگەکە[4].

کەناڵێکی دیکەی کاری سەواف بۆ بڵاوکردنەوەی بیری ئیخوان، ئەنجامدانی ئەو گەشتانەبوو کە بۆ ناوچە جیاوازەکان ئەنجامی دەداو سەردانی کەسایەتییە ناسراوەکانی دەکرد، لەو ناوچانەی گەشتی بۆ دەکرد، وتاریشی دەدا، لەو چوارچێوەدا

---

[1] د. محسن عبدالحمید: تاریخ جماعة الاخوان، ل١٠٤.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، هەولێر، ١٩/١٢/٢٠٠٤.

[3] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٤٣.

* مەلا ساڵح کۆزەپانکی: لە گوندی کۆزەپانکەی نزیك هەولێر لەدایك بووە، هەر لە منداڵییەوە دەستی داوەتە خوێندن، لەسەردەستی مەلا فەتاحی خەتێ ئیجازەی زانستی وەرگرتووە، شارەزایی زۆری لە ئەدەبی کوردیو زانستە شەرعییەکاندا هەبووە، چەند بەرهەمی چاپکراوو دەستنووسی لە پاش بەجێماوە. محمد زکي حسن أحمد: هەمان سەرچاوە، ل٢٠٥– ٢٠٦.

[4] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٤٣– ١٤٤.

سەردانی چەندین ناوچەی کوردستانی کردووە، لە هەندێك لەو گەشتانە شێخ ئەمجەد زەهاوی هاوڕێیەتی سەوافی کردووە[1].

حاجی تەها حەسەن سنجاری* یەکێك بووە لەو کوردانەی لە سەرەتای گەڕانەوەی سەواف بۆ عێراق، بۆتە ئەندامی ئیخوان‌و لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باس لەوە دەکات، ساڵی (١٩٤٩ز) سەواف بە هاوڕێیەتی مستەفا پێنجوێنی‌و غانم حمودات گەشتێکیان بۆ ناوچەی سنجارو دەوروبەری کردووەو، پێکەوە چونەتە گوندەکانی قاپوسی، گریَ گوارا، خنێسی، کون روفی، بلێج، ئەبوسی‌و حەمیَ‌و سەواف وتاری خوێندۆتەوە[2]. هەروەها ساڵی (١٩٥٣) سەواف لەگەڵ عەبدولمونعیم زورەری‌و عەزیز حاجی عەزیز ئاغاوو ئەحمەد حەسوو غانم حمودات سەردانی سنجارو هەندیَ گوندی دەوروبەری کردو لە سنجار لە مزگەوتی حاجی عەبدوڵلا وتاریدا[3].

لە درێژەی چالاکییەکانیدا، سەواف لە (٢٣ شوبات ١٩٥٣) بە هاوڕێیەتی موحەممەد عەلی خەششاب سەردانی قەزای دهۆکی کردو لە مزگەوتی گەورە بە ئامادەبوونی قایمقامی شار بورهانەدین ئەسعەدو ژمارەیەکی زۆر خەڵك وتاریدا[4].

کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی کە ڕوکاری ئیخوان بوو، ئەندام‌و لایەنگری لە دهۆك، زاخۆ، ئاکری‌و سنجار هەبوو، سەواف لە شوبات‌و تەموزی (١٩٥٣ز)و مانگەکانی شوبات‌و نیسان‌و ئەیلولی (١٩٥٤ز) چەندین سەردانی بۆ دهۆك، زاخۆو سنجار ئەنجامدا[5]. بە هۆی ئەم گەشتانەوە، سەواف دۆستایەتی لەگەڵ چەند زانایەکی ناوچەی

---

[1] کاظم أحمد المشايخي: الامام امجد، ل١٩٩.

* حاجی تەها حەسەن سنجاری: لە سنجار لەدایك بووە، هەر لەویَ زانستە شەرعییەکانی خوێندووەو ئیجازەی زانستی وەرگرتووە، لە سەرەتای دەرکەوتنی بانگەوازی ئیخوانەوە پەیوەست بووە پێوەی، کەسایەتییەکی گوێلێگیراو هەڵسوڕاوی ناوچەکە بووە، بە گوندەکاندا دەگەڕاو کەرەستەی بۆ خۆبەخشەکانی فەلەستین کۆدەکردەوە، ساڵی (١٩٩٩) کۆچی دوایی کردووە. ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٣٠ – ١٣١ پەراوێزی ژمارە (٤).

[2] چەردەیەك لە یادەوەرییەکانم، ڕۆژنامەی ڕاپەڕین، ژمارە (١٦) ساڵی یەکەم، ١٩٩٨/٦/١٥.

[3] جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥.

[5] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨١.

بانیقان دروست کردبوو، لەوانە: مەلا موحەممەد لە دەتۆک، مەلا ئەحمەد لە زالخۆ، مەلا ئەحمەد وتاربێژو پێشنوێژی مزگەوتی گەورەی ئاکرێ[1]. هەر لەو ماوەدا لە چەند گەشتێکی دیکەدا، چۆتە ڕەواندز، چۆمان، بامەڕنێ[2]، کەرکووک، هەولێرو سلێمانی[3].

بە هەمان شێوە، سەواف سالی (١٩٥٤ز) بە هاوڕێیەتی زەماوی دەچێتە هەڵەبجە، لەوێ لە مزگەوتی پاشا وتار دەداتو لەگەڵ (شێخ عوسمان عەبدولعەزیز*، مەلا سالح عەبدولکەریم « مەلا سالحی گەورە» **) پەیوەندی دروست دەکات[4].

---

[1] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٢.

[2] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، أربيل ٢٠٠٢، ل٤٦.

[3] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨١.

* شێخ عوسمان عەبدولعەزیز : عوسمان عەبدولعەزیز موحەممەد، سالی (١٩٢٢ز) لە گوندی پەریس لە ناوچەی هەڵەبجە لەدایك بووە، لای باوکیو مەلا سالحی گەورە خوێندویەتیو ئیجازەی زانستی وەرگرتووە، موفەسیرو زانایەکی لێهاتوو خاوەن هەڵوێستو ناسراوی کوردستانو جیهانی ئیسلامییە، چەند بەرهەمی نوسراوی هەیە، بەناوبانگترینیان تەفسیری قورئانی پیرۆزە کە لە دوتوێی پانزە بەرگو(٥٤٠٠) لاپەڕەدا چاپی کردوە، دەیان زانا لەسەردەستی ئەو ئیجازەی زانستیان وەرگرتووە، چەند جارێك لەسەر هەڵوێستی بوێرانەی لەلایەن حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقەوە دەستبەسەر کراوە، لە سالی (١٩٨٧)ەوە ڕابەری بزووتنەوەی ئیسلامیی بووە، لە (١٢/٥/١٩٩٩) لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کرد. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو کەسایەتییە بڕوانە: ابراهيم طاهر معروف: الشيخ عثمان عبد العزيز ودوره في الصحوة الإسلامية في كردستان العراق، (توێژینەوەی بڵاونەکراوە).

** مەلا سالح عەبدولکەریم: سالح عەبدولکەریم موحەممەد، سالی (١٩٠٤ز) لە دایك بووە، لای زانایانی ناوچەی سلێمانی دەستی داوەتە خوێندنی زانستە شەرعییەکانو لەسەردەستی شێخ عومەر قەرەداغی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان دەبێتە مەلا لە گوندی تریفەی ناوچەی هەڵەبجە، سالی (١٩٤٩) دێتە هەڵەبجەو لە گەڕەکی کانی عاشقان مزگەوتێك بنیادئەنێت، لە کاتی سەردانی بۆ بەغداد بە مەبەستی تۆمارکردنی مزگەوتەکە لەسەر میلاکی ئەوقاف ئاشنایەتی لەگەڵ شێخ ئەمجەد زەهاوی پەیدادەکات، زانایەکی لێهاتوو بەتوانای ناوچەکە بووە، چەندین کەس لەسەردەستی ئەو ئیجازەی زانستیان وەرگرتوە، لە (١٧/١١/١٩٩٠) لە سنە کۆچی دوایی کردووە.

[4] جۆری ئەم پەیوەندییە ئۆرگانی نەبووە، بەڵکو پەیوەندییەکی تایبەتیو ڕۆحیو فکری بووە، خودی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز دەربارەی پەیوەندی خۆی بەسەوافەوە دەڵێت: "ئەو وەختە لێرەبوو ( عێراق ـ تووسەر) هەموو پەیوەندیەکی ڕۆحیو فکریو شەخصیم لەگەڵی هەبوو". بڕوانە: باوکی پێشەوا: چاوپێکەوتنێکی بڵاونەکراوە لەگەڵ زانای موجاهیدو پێشەوای کۆچکردوو ماموستا مەلا عوسمان ئە

سەبارەت بە گەیشتنی ئەم بیرە بە هەولێر، لە ساڵی (١٩٤٥)و لە ڕێگەی عەبدولوەهاب حاجی حەسەنەوە بوو، ناوبراو لە سەرەتادا پەیوەندی دەکات بە مەلا ساڵح کۆزەپانکی پێشنوێژی مزگەوتی نورەدین، دوای ئەوەی عەبدولوەهاب حاجی حەسەن باسی بیری ئیخوان بۆ مەلا ساڵح دەکات، ناوبراو ڕێگەی دەدات لە مزگەوتەکەیدا کۆبوونەوە بکات، کۆبوونەوەکانیش دوای نوێژی مەغریب ئەنجام دەدران، دوای زۆربوونی ژمارەی گوێگران، گواستیانەوە بۆ تەکیەی شێخ محیدین شێخ ساڵح، دواتریش قوتابخانەیەکیان بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری لە هەولێر کردەوە، قوتابخانەکەش لە ناو قوتابخانەی یەکەمی هەولێردا بوو، خەڵکی پێشوازییەکی گەرمیان لە کردنەوەی قوتابخانەکە کردوو ژمارەیەك مامۆستا بە شێوەی خۆبەخش وانەیان تێدا دەوتەوە[1]. ئەمە وێڕای ئەوەی سەردانی گوندەکانی دەوروبەری هەولێریان کردو وتاریان بۆ گوندنشینەکان دەدا، هاوکات بۆنە ئاینییەکانیان دەقۆزتەوە بۆ وتاردان و بڵاوکردنەوەی ئەو بیرە[2].

دوای پەرەگرتنی بانگەوازی ئیخوان لە هەولێر، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن نامەیەك دەنێرێت بۆ حسێن کەمالەدین لە قاهیرە، ناوبراو لە نامەکەدا باسی چالاکی خۆی دەکات کە لە ماوەی پشووی هاویندا ئەنجامیداوە، حسێن کەمالەدین وەڵامی نامەکەی داوەتەوەو بۆی نووسیوە نامەکەی نیشانی حەسەن بەننا داوەو ئەویش زۆر پێی دڵخۆش بووەو وتوویەتی: "الله اکبر، سوپاس بۆ خوا بانگەواز لە نێوان گەلانی دیکەدا بڵاوبۆتەوە، خوا بەرەکەتی تێخات، تکام وایە سڵاوی منیان پێ بگەیەنیت"[3].

---

ڕۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی، ژمارە (٤٠)، ١٩٩٩/٥/٢٨. بە هەمان شێوە، سوبحی داودی و سدیق عەبدولعەزیز جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکەنەوە کە پەیوەندی شێخ عوسمان و سەواف ئۆرگانی نەبووە. چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[1] مامۆستا خۆبەخشەکان ئەمانە بوون: نەشئەت موحەممەد سەفوەت، عادل مستەفا، عەبدوڵڵا سەلیم، جیهاد عەبدوڕەزاق، ئەنوەر موحەممەد دەباغ، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن. د. محسن عبدالحمید: تاریخ جماعة الاخوان، ل٦٧–٦٨.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٩.

بەپێی ئەو زانیاریانەی لەبەردەستدان، لەو دەمەدا لە هەولێر ئیخوان چەندین ئەندامی چالاکی هەبوو، لەوانە: موحەممەد سادق موختار[1*]، عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، ئەحمەد عەباس، سەید موحەممەد جەباری[2]، حاجی خەلیل[**].

ئیخوانەکانی هەولێر هەوڵیانداوە چالاکی جەماوەری ئەنجام بدەن، لە ساڵی (١٩٤٧) دوا بە دوای دەرچوونی بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین، لە هەولێر خۆنیشاندانێکیان ئەنجامداو چەندین دروشمی پشتگیریان بۆ فەلەستین بەرزکردەوە[3]، لەو

---

* موحەممەد سادق موختار: ساڵی (١٩٢٧) لە هەولێر لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، هاوکات لای مەلا سالح کۆزەپانکەیی زانستە شەرعییەکانی خوێندووە، ساڵی (١٩٤٩) کۆلێجی مافی لە بەغداد تەواو کردووە، پاشان لە هەولێر بۆتە پارێزەرو دواتریش بۆتە قازی، ساڵی (١٩٦٩) لە قاهیرە ماستەری بەدەستهێناوەو پاشان گەڕاوەتەوە عێراق و دواجار بۆتە قازی مەحکەمەی تەمیز. كاظم احمد المشايخي: الامام امجد، ل١٧٤– ١٧٥.

[1] لە: مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٢٨٦؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩. هەردوو نووسەر (ئیمان عەبدولحەمید موحەممەد ئەلدەباغ و جاسم موحەممەد عەبدوڵڵا نەجم ئەللوهەیبی) ناوی چەند کەسێکیان نووسیوە کە ئەندامی چالاکی ئیخوان بوون لە هەولێر، لەوانە: میسر سالح ئەلئەمین، عادل شاکر، خەلیل ئیسماعیل، رائق سەید جەمیل، فاتح موحەممەد. دەبینین لێکچوون لە نێوان هەندێ لەو ناوانەو ئەو ناوانەدا هەیە کە پێشتر ئاماژەمان پێداون و لە سەرچاوەکانی دیکەوە وەرمان گرتوون، پێدەچێت هەندێکیان هەر یەك کەس بن و سەرچاوەی زانیارییەکان ناوەکانی تێکەڵ کردبێت، بۆ نموونە لەوانەیە ئەکرەم شاکر و عادل شاکر یەك کەس بێت، یان خەلیل عەبدوڵڵاو خەلیل سلێمان یەك کەس بێت. جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل٨٥؛ ايمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٤٦.

** حاجی خەلیل: خەلیل عەبدوڵڵا عەزیز، ساڵی (١٩٣٢) لە هەولێر لەدایك بووە، ساڵی (١٩٥٨) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە شەریعەدا وەرگرتووەو لە نێوان ساڵانی (١٩٦١ ـ ١٩٨٢) لە هەولێر مامۆستا بووە، یەکێکە لە ئەندامە دێرینە چالاکەکانی ئیخوان لە هەولێر، لە (١٩٩٩/٥/١٢) کۆچی دوایی کردوە. بڕوانە: مامۆستا ئەحمەد: کورتەیەك لە ژیانی مامۆستا حاجی خەلیل، ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە (٢٣٨)، ١٩٩٩/٥/٢١.

[3] د. محسن عبدالحميد: تاريخ جماعة الاخوان، ل١٠٢.

خۆنیشاندانانەدا (عەبدولوەهاب حاجی حەسەن، ئەکرەم شاکر، زێوەر خەتاب*، موحەممەد سادق موختار، عەبدوڵلا سەلیم) بەشداریان تێدا کرد[1]، ئەم چالاکیەش بەڵگەی بڵاوبوونەوەی بیری ئیخوانە لە هەولێر.

لە ناوەڕاستی (١٩٥٣) لقی هەولێری کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی کرایەوەو موحەممەد سادق موختار بە سەرۆکی لق هەڵبژێردرا، لە ناو بارەگای لقدا کتێبخانەیەکی تێدابوو کە موحسین موجاهید بەڕێوەبەری بوو، دوای ئەویش ئەحمەد عەبباسی دەیبرد بەڕێوە. ئاهەنگی کردنەوەی لق بە سەرپەرشتی شێخ محێدین بەرزنجیو ئامادەبوونی سەواف بەڕێوەچوو، مەلا سالح کۆزەپانکی رۆڵی بەرچاوی هەبوو لە هاندانی لاوان بۆ پابەندبوون بەم بزووتنەوەیەوە[2].

سەبارەت بە گەیشتنی بانگەوازی ئیخوان بە سلێمانی، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٤٦)، ئەو کاتەی نیزامەدین عەبدولحەمید لە ئاماری سلێمانی بووە فەرمانبەر، کارەکەش لە ناساندنی بانگەوازی ئیخوان بە هەندێ لە زانایان کورتهەڵاتبوو، لە ناو ئەو زانایانەشدا شێخ موحەممەدی خاڵ قازی سلێمانی[3].

ساڵی (١٩٥٢) ئیخوانەکانی کەرکووك ویستیان کارو چالاکی لە سلێمانی فراوان بکەن، بۆ ئەو مەبەستە بە هاوکاری مەلا جەلال ساعاتی دوو کتێبخانەیان کردەوە، بەڵام تەنها شەوێك بەسەر کردنەوەیاندا تێپەڕی، هەردووکیان لە لایەن چەپەکانەوە سووتێنران[4].

---

* زێوەر خەتاب: ساڵی (١٩٢٩) لە هەولێر لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتاییو دواناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، ساڵی (١٩٥٤) کۆلێجی مافی لە بەغداد تەواو کردووە، چەند پۆستی جیاوازی لە حکومەتدا وەرگرتووە کە دواهەمینیان بەڕێوەبەری گشتیی بووە لە وەزارەتی شارەوانی، چەند بەرهەمێکی چاپکراوی هەیەو لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا دەیان وتاری بڵاوکردۆتەوە. جمال بابان: هەمان سەرچاوە، ل٢٣٩ -٢٤٢.

[1] مەهدی محەمەد قادر: پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥ - ١٩٥٨، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٥، ل٢١٨.

[2] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل ١٤٥- ١٤٦.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤- ٧٥.

[4] د. محسن عبدالحمید: تاریخ جماعة الاخوان، ل١١١. چەپەکان شێوازی توندوتیژیان بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبونەوەی بیری ئیخوان گرتەبەر، غانم حمودات باس لەوە دەکات لە هاوینی (١٩٥٢) یان (١٩٥٣)

لقی موسڵ، چالاکترین لقی ئیخوان بوو لە عێراق، کاتێك لە (٤ تشرینی یەکەمی ١٩٥٢ن) ڕەزامەندی حکومەتیان بۆ کردنەوەی لقی کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی لە موسڵ وەرگرت، دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردراو عەبدوڵلا موحەممەد ئەربیلی بووە سەرۆکی لقی موسڵ[1]، ئەم لقە بە شێوەیەك چالاك بوو، توانی هۆبەیەك لە سنجار بکاتەوەو زانای ئایینی حاجی تەها حەسەن سنجاری بووە بەرپرسیو بارەگایان دانا، هاوکات ناوبراو کتێبخانەیەکی بە ناوی (الأخوة الإسلامية) لە سنجار کردەوە[2].

هەر لە چوارچێوەی چالاکی لقی موسڵدا، لە (٢ ئەیلول ١٩٥٤) چەند لاوێکی کۆمەڵەی برایەتی سەردانی زاخۆیان کردو شەوێك لای حازم شەمدین ئاغا[*] — نوێنەری زاخۆ لە پەرلەمانی عێراق— مانەوەو لە مزگەوتی زاخۆ چەند وتارێکیان دا[3].

یەکێك لەو چالاکییانەی ئیخوان بۆ پەروەردەکردنی ئەندامەکانی سوودی لێ وەردەگرت، کردنەوەی خێوەتگە بوو، لە پەنجاکاندا ئیخوان چەندین خێوەتگەی لە

---

چۆتە زاخۆ، شەو لە مزگەوتێکدا وتاری داوە، شیوعییەکان بەرەنگاری بوونەتەوەو بەردبارانیان کردووە، بەیانی ڕۆژی دواتریش لەگەڵ تەها جەوادی لە چاخانەیەکدا باسی کۆمەڵەی برایەتییان کردووە، شیوعییەکان بۆیان هاتوون‌و بەرتۆچکەیان تێکرتوون‌و پۆلیسیش نەچووە بە هانایانەوە، ئەوانیش گەڕاونەتەوە بەرەو موسڵ. لە: ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٢٧١.

[1] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٨. سەرەتا بۆ ماوەی ساڵێك عەبدولحافز سلێمان سەرۆکی لق بوو، بەڵام لە (٥ تشرینی یەکەمی ١٩٥٣) دەستەی کارگێڕی لق هەڵبژێردرا کە پێکهاتبوو لە: عەبدوڵلا موحەممەد ئەربیلی – سەرۆکی لق، عەبدولمونعیم زورەری – سکرتێر، موحەممەد نەجیب عەلی – ئەمین سندوق، عەتائوڵلا موحەممەد سەعید – ژمێریار، ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨١. لە (١٣ ئاب ١٩٥٣) دەستەی کارگێڕی هۆبە هەڵبژێردراو حاجی تەها بووە سەرۆك، یونس زەنون – جێگری سەرۆك، عەبدوڵلا فەتحی – سکرتێر، حسێن شەریف – ژمێریار، جەرجیس یونس – ئەمین سندوق. لە (ئەیلول ١٩٥٣) بارەگا بە فەرمی کرایەوەو بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکی وتارخوێندنەوە ساز کرا. ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٣١ – ١٣٢.

[*] حازم شەمدین ئاغا: ساڵی (١٨٩٥) لە زاخۆ لەدیك بووە، پێنج جار بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، کەسێکی خێرخواز بووەوکۆمەکی زۆری هەژارانی دەکرد، هەر بۆیە لەناو خەڵکیدا بە باوکی هەژاران ناودەبرا، ساڵی (١٩٥٤) کۆچی دوایی کردووە. جمال بابان: هەمان سەرچاوە، ل٢٣٠.

[3] ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٢٩.

هاوینەهەوارەکانی کوردستان کردەوە، لەوانە: خێوەتگەی دهۆك لە ١٩٥٣، خێوەتگەی سولەتوکە ١٩٥٤، خێوەتگەی چۆمان ١٩٥٦، چەند خێوەتگەیەکی تر لە سەرسەنگ، بامەڕنێ، مانکیش و لوماتا[1].

هەر چەندە لە (١٩٥٤ز) بەدواوە کاری ئیخوان بە فەرمی قەدەغەکراو کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی هەڵوەشایەوە، بەڵام ئیخوان بە نهێنی لەسەر کاری خۆی بەردەوام بوو، ساڵی (١٩٥٦ز) بە هەمان شێوەی ساڵانی پێشوو خێوەتگەیەکیان لە چۆمان کردەوەو ژمارەیەکی زۆر ئەندامی ئیخوان تێیدا بەشدار بوون[2]. بەو شێوەیە ئیخوان لە دوا ساڵەکانی سەردەمی پاشایەتی بە شێوەیەکی نهێنی کارو چالاکییەکی سنووردای هەبوو.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٦. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی بەرنامەی خێوەتگەکان بڕوانە: د. محسن عبدالحمید: تاريخ جماعة الاخوان، ل١٢٠-١٢٢.

[2] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٣.

## باسی سێیەم: ڕەوتی ئیسلامیی لە کوردستان لە سەردەمی کۆماریدا

دوای شۆڕشی (١٩٥٨ن) لە عێراق، قۆناغێکی نوێ لە کاری ئیسلامیی لە عێراق‌و کوردستان دەستی پێکرد، ئەم قۆناغە لە خودی خۆیدا، هەندێ جار بەرەو لوتکەو هەندێ جاریش بەرەو نشێوو هەڵدێر ملی ناوە، ئەمەش دەرەنجامی بارودۆخی سیاسی ئەو دەمەی عێراق‌و ناوچەکەیە.

لەسەروبەندی دوای شۆڕش، لە سلێمانی، کۆمەڵەیەکی ئایینی بەناوی کۆمەڵەی پیاوانی ئایینی ئازاد (جمعية رجال الدين الأحرار في السليمانية) دادەمەزرێت، دەربارەی ناوی دامەزرێنەران‌و کارو چالاکی ئەم کۆمەڵە، هیچ زانیاریەکمان چنگ نەکەوت، تاکە سەرچاوەیەك کە هەبێت ئەو بەیاننامەیەیە کە بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی چاپکراوەو تێیدا ئامانجەکانی کۆمەڵە لە (٩) بەندا دەخاتەڕوو[١].

کۆمەڵی پیاوانی ئایینی ئازاد، لە ژێر دروشمی ئایەتی (وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ) خۆی دەناسێنی‌و ئامانجەکانی دەخاتەڕوو، لە بەندی یەکەمدا ناوی تەواوی کۆمەڵە دێنێت، لە بەندی دووەمدا نووسیویەتی: "کۆمەڵەکەمان کۆمەڵێکی حیزبی‌و سیاسی نی‌یە بەڵکوو کۆمەڵێکی دینیەو هیچی تر"، لە بەندی پێنجەمی بەیاننامەی ناوبراودا هاتووە کە: "کۆمەڵ تێ ئەکۆشێ لە ڕێگای پاراستنی جمهوریەتە دیموکراسیەکەمان‌و چنگ کەوتووەکانی شۆڕش وە هەوڵ ئەدات بۆ جێگیربونی ئاشتی جیهان". ئەم بەندە بەڵگەی ئەوەیە کۆمەڵی پیاوانی ئایینی ئازاد لەسەردەمی کۆماریدا دامەزراوە[٢].

تەواوی بەندەکانی (٣، ٤، ٦، ٧، ٨، ٩) بۆ ڕوونکردنەوەی ئامانجەکانی کۆمەڵە تەرخان کراوەو تێیدا بەرزکردنەوەی ئالای ئایینی پاك‌و بڵندکردنی وشەی ڕاست‌و دابینکردنی مافەکانی پیاوانی ئایینی‌و یەکخستن‌و یەکڕیزیی زانایان‌و زۆرکردنی ژمارەی

---

[١] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٤).

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

پێشەوایانی ئایینیو پشگیریکردنو کۆمەکی جولانەوەی نیشتمانییو تێکۆشان دژی ئیمپریالیزم، لە دوتوێی ئامانجەکانی کۆمەڵەدان[١].

دامەزراندنی کۆمەڵەی ناوبراو، تاکە چالاکی ئەو دەمەی ڕەوتی ئیسلامیی نییە، بەڵکو لەپاڵ ئەمەدا، ئیخوان بە شێوەیەکی بەرفراوان لە هەندێ ناوچەی باشووری کوردستان چالاکی دەنوێنێ، دوای شۆڕشی (تەمموزی ١٩٥٨ن) شیوعییەکان بەتەواوی لە گۆڕەپانی سیاسیی عێراقو کوردستان دەرکەوتن، لە ساڵی (١٩٥٩) شیوعییەکان لە هەڵەبجە خۆنیشاندانێکیان سازدا[٢]، وەکو پەرچەکردارێك لە هەمان ڕۆژدا ئیسلامییەکان خۆنیشاندانیان سازدا، شەڕو پێکدادان لە نێوان هەردولادا بەرپا بوو، چەند برینداری لێکەوتەوە، (حاجی عەبدوڕڕەحمان موحەممەد) یەکێك بوو لە بریندارەکان[٣].

تاوسەندنی شیوعییەتو توندڕەویی شیوعییەکان بەرامبەر ئیسلام، کارێکی وای کرد زانایان فەتوای کافربوونی شیوعییەکانو حەرامی مامەڵەکردنو ژنخوازی لەگەڵیاندا دەربکەن، لەو ڕەوەوە ڕۆژنامەی (الوطن) لە ژمارە (١٥٩)ی (٢٣ تشرینی دووەمی ١٩٦٠) لە ژێر ناونیشانی (دور العلماء الأعلام) فەتوای زانایان (مەلا ساڵح عەبدولکەریم، شێخ جەمیل موفتی[*]، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز،

---

[١] سەرچاوەی پێشوو.

[٢] شیوعییەکان لە خۆنیشاندانەکاندا زۆرجار دروشمی (مژدەبێ خوشكو برا دەرگای مزگەوت داخرا)یان بەرزدەکردەوە.

[٣] ئەرسەلان تۆفیق محەمەد: هەوڵێك بۆ نووسینەوەی ڕیشەی ڕابوونی ئیسلامی کوردستان قۆناغی یەکەم ١٩٥٢ ـ ١٩٨١، گۆڤاری بوار، ژمارە (١) ساڵی یەکەم، بەهاری ٢٠٠٠، ل١٤.

[*] شێخ جەمیل موفتی: جەمیل کوڕی شێخ مستەفا موفتی کوڕی شێخ مەحمود ناسراو بە قازی کوڕی شێخ عەبدوڵلا خەرپانی، ساڵی (١٩٠٦) لە هەڵەبجە لەدایك بووە، خوێندنی فەقێیەتی لە هەڵەبجەو دەوروبەری تەواو کردوەو ئیجازەی زانستی وەرگرتووە، کەسایەتییەکی ناسراوو خاوەن هەڵوێست بووە، لە بەرامبەر شیوعییەکان توند بووەو ئەمەش زۆرجار کێشەی بۆناوەتەوە، دوای دووساڵ نەخۆشی لە (١٩٦٩/٩/١٤) کۆشی دوایی کرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دەروازەیەك لە ژیانو یادگارییەکانو کەسایەتی مامۆستا شێخ جەمیلی موفتی، ئا: محمد ئومێد نجم الدين شيخ جميل، گۆڤاری پێشەنگ، ژمارە (٢٣) ساڵی چوارەم، ٢٠٠١ز، ل٤٧ ـ ٦٣.

مەلا عومەر عەبدولعەزیز*ی بلاوکردۆتەوە، ناوبراوان لە دەقی فەتواکەدا دەڵێن: "پرسیارمان لێکراوە دەربارەی شیوعی‌و شیوعییەت، سەرەتا دەبێت دەربارەی ئیستعمار پاشان شیوعییەت بدوێین، چونکە هەرکەس دژی شیوعییەت بدوێ بە هاوکارو نۆکەری ئیستعمار تۆمەتبار دەکرێت، بەو شێوەیە سێ پرسیار بەرەو ڕومان دەبێتەوە:

پرسیاری یەکەم، حوکمی ئەو کەسە چییە کە هاوکاری ئیستعمار دەکات؟، لە وەلامدا دەڵێین: ئیستعمار دوژمنمان‌و دوژمنی یەکەمی ئیسلامە، لە ژێر سایەیدا تەواوی ڕێبازە هاوردەکان دروست بوون، هەرکەس هاوکاری ئیستعمار بکات لە موسڵمانان ئەژمار ناکرێت، بەڵکو دوژمنیانە، خوای گەورە فەرمویەتی (ومن يتولهم منكم فأن منهم).

پرسیاری دووەم، حوکمی ئەو کەسە چییە کە پەیوەندارێتی (ئینتیما)ی بۆ شیوعییەت هەیە؟، بێگومان شیوعییەت مادیەتێکی ڕووتە‌و بڕوای بە خواو بەڕۆژی دوایی‌و غەیب نییە، گومان نییە لە کافرێتی ئەو کەسەی پەیوەندارێتی بۆ ئەو حزبە هەیە‌و ئاگاداری ڕێبازە گڵاوەکەیانە ( إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللّٰهِ الْأِسْلامُ)، (وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْأِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ).

پرسیاری سێیەم، حوکمی ئەو کەسە چییە کە هاوکاری شیوعی‌و شیوعیەتە؟، جۆری هاوکاریەکە دەگۆڕێت، بەهەرحاڵ هاوکاریکردنیان خزمەتی کوفرە، موسڵمان

* مەلا عومەر عەبدولعەزیز: عومەر عەبدولعەزیز موحەممەد، ساڵی (١٩١١) لە هەڵەبجە لەدایك بووە، لەسەردەستی باوکی زانستە شەرعییەکانی خوێندووە‌و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لە گوندی پەلی مێرۆ بۆتە پێشنوێژو قوتابخانەیەکی ئایینی لەو گوندەدا دامەزراندووە، پاشان گەڕاوەتەوە هەڵەبجە، لەبەر دژایەتی کردنی شیوعییەت ڕووبەڕووی دژایەتی‌و دوورخستنەوە بۆتەوە، ساڵی (١٩٦٠) بە هاوکاری زانایانی ناوچەکە قوتابخانەی ئیسلامییان لە هەڵەبجە کردۆتەوە‌و بۆتە یەکەم بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەیە. یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (١٩٨٧)، لە (٢٠٠٨/٨/٨) کۆچی دوایی کردووە.

نابێت هاوکاریان بکات، خوای گەورە فەرمویەتی (لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ...) "[1].

دەرکردنی ئەو فتوایانە کاریگەری لەسەر گۆڕەپانەکە هەبوو، تەنانەت حکومەت لە تۆڵەی ئەوەدا بڕیاری دورخستنەوەی شێخ عوسمانو مەلا عومەر عەبدولعەزیزی بۆ ناسریە دەرکرد[2]. پێدەچێت ئەو بڕیارەی حکومەت بە پلانو هاندانی شیوعییەکان بووبێت.

وێستگەیەکی دیکەی چالاکی ئیخوان، دەگەڕێتەوە بۆ بەشداری کۆمەڵێك زانای ئایینی کورد لە کۆنگرەی حزبی ئیسلامیی عێراقی لە (تەموزی ١٩٦٠ن)، ئەو زانایانە لە هەڵەبجەوە چوبوون، بریتی بوون لە (مەلا ساڵح عەبدولکەریم، مەلا عومەر عەبدولعەزیز، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، شێخ جەمیل موفتی)[3]. لەو کۆنگرەدا شێخ عوسمان عوبدولعەزیز بەناوی وەفدی لیوای سلێمانیو قەزای هەڵەبجە وتاری خوێندەوە، رۆژنامەی (الحیاد) زمانحاڵی حزبی ئیسلامیی دەقی وتەی ناوبراوی بڵاوکردەوە[4].

شایانی باسە لە کاتی دامەزراندنی حزبی ئیسلامیی عێراقیو بەستنی کۆنگرەی یەکەمی حزب، نوعمان عەبدوڕەزاق سامەڕائی سەرۆکی حزبی ناوبراو، (سوبحی داودی) ڕادەسپێرێ کە بچێتە هەڵەبجەو ڕێکخستنی ئیخوانی تیا دامەزرێنێ، لە (هاوینی ١٩٦٠ ) سوبحی داودی، بە هاوڕێیەتی (عابدین ڕەشید) لە کەرکوکەوە گەشتێك بۆ هەڵەبجە دەکەنو یەکەم شانەی ڕێکخستنی ئیخوانی تیا دادەمەزرێنن، ئەم شانە

---

[1] لە: ابراهیم طاهر معروف: هەمان سەرچاوە، ل١٦ ـ ١٧.

[2] ئەرسەلان تۆفیق محەمەد: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[4] ابراهیم طاهر معروف: هەمان سەرچاوە، ل١٨. لە ژمارە (٤٢)ی گۆڤاری (جەماوەر) دەقی وتارەکەی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز کە لە رۆژنامەی (الحیاد) وەرگیراوە بۆ جارێکی تر بڵاوکراوەتەوە. بڕوانە: گۆڤاری جەماوەر، ژمارە (٤٢)، ٢٢ ئەیلولی ١٩٩٥ ز، ل٦١ ـ ٦٣.

پێکهاتبوو لە (سدیق عەبدولعەزیز، جەلال مەلا سالّح)، ئەم شانەیە دەبێتە بەردی بناغەی کاری ڕێکخستن لە هەڵەبجەو شارەزوور[1].

هەر چەندە پێشتر لە نێوان چەند زانایەکی هەڵەبجەو بانگخوازانی ئیخوان ئاشنایەتی دروستبوو، بەڵام ئەم یەکترناسینە ڕێکخستنی فەرمی لێنەکەوتەوە، بەمەش هەردوو (سدیق عەبدولعەزیز، جەلال مەلا سالّح) بە یەکەم کادیری ڕێکخراوەیی ئیخوان لە دەفەری ناوبراو ئەژمار دەکرێت.

دواتر ئەم شانەیە فراوان بوو، هەریەکە لە (عومەر ڕێشاوی*، عەبدولعەزیز پارەزانی**) تێیدا بوونە ئەندام، لە سەرەتادا سدیق عەبدولعەزیز بەرپرسی ڕێکخستنەکانی هەڵەبجە بوو، ئەویش پەیوەندی هەبوو بە عابدین ڕەشید

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

* عومەر ڕێشاوی: عومەر فەتاح یەعقوب سالّی (١٩٣٣) لە گوندی (ڕێشاو) لە دایك بووە، خوێندنی زانستە شەرعییەکانی تەواو کردوەو لە شەستەکاندا لە قوتابخانەکانی هەڵەبجەو دەوروبەری مامۆستا بووە، یەکێکە لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان، کەسێکی لێبڕاوو هەڵسوڕاوی ڕەوتی ئیسلامییە، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەککرتووی ئیسلامیی کوردستان سالّی (١٩٩٤)، لە (٢٠٠١/١٠/١٨) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: ڕۆژنامەی یەککرتوو، ژمارە (٣٦٠)، ٢٠٠١/١٠/١٩.

** عەبدولعەزیز پارەزانی: عەبدولعەزیز کوڕی شێخ ئەمین شێخ ئەحمەد، لە بنەماڵەی شێخ ئیلیاسە، سالّی (١٩٢٨ن) لە گوندی پارەزانی شاربازێر لەدایك بووە، لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە دەستی داوەتە خوێندنو لای مەلا سالّح ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، نووسەرێکی کارامەو بەسەلیقە بوو، گرنگترین بەرهەمەکانی بریتین لە (ژیانی پێغەمبەری مەزن، نمونەیەك لە ئیسلام، پێنج پایەکانی ئیسلام، لە دەروازەی ئیسلامەوە، پاشکۆی ژیان، خێزانی بەختیارو کۆمەڵی کامەران، کوڕێکی لاسارو باوکێکی هەژار، ئیسلامو بەرنامەی ژیان، ئیسلام کارە نەك تەمەڵی، دوو خەریزە بەدەستێك هەڵناگیرێت)، ئەمە وێڕای ئەوەی چەندین وتاری لە گۆڤاری (التربیة الإسلامیة)دا بڵاوکردۆتەوە، شەوی (٢٢\٢٣ ـ ١٢ ـ ١٩٧٦) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: حسن محمود حەمەکەریم: مامۆستا پارەزانی لە بیرەوەری قوتابییەکانیدا، ڕۆژنامەی یەککرتوو، ژمارە (٢٢)، ١٩٩٤/١٢/٢٣.

لە کەرکوک[1]. دواتر چالاکی ئیخوان لە ناوچەکەدا پەرەیگرتو عومەر ڕێشاوی بووە بەرپرسی ڕێکخستنی هەڵەبجە[2].

لە سەرەتای شەستەکاندا چالاکی ئیخوان لە دەڤەری شارەزورو هەڵەبجە بەرفراوان بوو، بیری ئیخوان بەشێوەیەك بڵاوبویەوە مەلاکان بە ئاشکرا باسی ئەو بیرەیان دەکرد، تەنانەت لەهەندێ شوێن وێنەی حەسەن بەننا بەرزدەکرایەوە، (مەلا حسێن کوڕی مەلای گەورە) بە ئاشکرا لە مزگەوت باسی بیری ئیخوانی دەکرد[3]. هەر لەو سەروبەندەدا چالاکی ئیخوان لە هەولێرو سلێمانیو کەرکوك لە برەودا بوو[4].

قۆناغی کاری ئاشکرای ئیخوان لە عێراق، زۆر درێژەی نەکێشاو حزبی ئیسلامیی قەدەغەکراو هەڵوەشێنرایەوە، ڕووداوێکی لەو شێوە کاری کردە سەر بەرتەسك بوونەوەی چالاکی ئیخوان لە کوردستانو بە درێژایی سالآنی شەست تا (١٩٧١/٤/٤) بەفەرمی کاری ئیخوان لە عێراق ڕاگیرا[5]، کاری ئەو ڕێکخراوە لە کوردستان بەشێوەیەکی نهێنی بەردەوام بوو، شێوازی کارکردنیش بریتی بوو لە:

١ـ شانەکان هەفتانە کۆبوونەوەیان دەکردو دوای لێپرسینەوە لە کاری هەفتەی ڕابردوو، کاری هەفتەی ئایندە دیاری دەکرا.

٢- دروستکردنی تیپی شەوانە (كتائب الليلية) بە تایبەت لە مانگی ڕەمەزاندا.

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩. عەبدوڕڕەحمان حسێن بەرزنجی کە وەك ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر لە کەرکوك خۆی ناساندووە، لە نامەیەکیدا کە ڕۆژی (٣٠ ڕەبیعی یەکەمی ١٣٨٠ك – ٢١ ئەیلول ١٩٦٠ز) بۆ ئەمین سامەڕائی ناردووە، باس لەوە دەکا کە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا شەش ئەندامی نوێ لە لیوای سلێمانی پەیوەندییان بە حزبەوە کردووەو ناسنامەیان بۆ کراوە. لە: كاظم احمد المشايخي: تأريخ نشأة، ل١٧٢.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[3] محمد نوری بازیانی: هەمان سەرچاوە، ل٥٢. بەهەمان شێوە لە ڕاپۆرتی دەزگا سیخوڕیەکانی بەعس لە ساڵی (١٩٨٦)جەخت لەسەر پاشخانی چالاکی ئیخوان لە ناوچەکە دەکاتەوە. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥).

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (جەعفەر مستەفا)، هەڵەبجە، ٢٠٠٤/١٢/١٥.

[5] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

٣- ئاهەنگ گێڕان لە بۆنەکاندا، بە تایبەتیش لە مزگەوتەکاندا، ئەو بۆنانەش وەکو یادی لەدایك بوونی پەیامبەر( ﷺ )، شەوانی قەدر، غەزای بەدر، ئوحود، ئیسراو میعراج و...هتد. لەو ئاهەنگانەدا وتارو پەخشان و هۆنراوە پێشکەش دەکران.

٤- شەونوێژی بە کۆمەڵ.

٥- کرنگیدان بە توێژی خوێندکارو مامۆستاو ڕۆشنبیران و گەیاندنی بانگەواز پێیان.

٦- هەفتانە چەند ئایەت و فەرمودە لەبەردەکراو لەلایەن ئەندامانەوە ڕاڤەو ڕونکردنەوەیان بۆ دەکرا.

٧- سەردانی مامۆستایانی ئایینی و کەسایەتییە ناسراوەکان بە مەبەستی گەیاندنی بانگەوازی برایان.

٨- سوود وەرگرتن لە خوێندنەوەی هەندێ بڵاوکراوەو کتێب و گۆڤارەکانی وەکو ( المجتمع، التربية الإسلامية، المسلمون، الدعوة، لواء الإسلام،...) لەگەڵ بڵاوکراوە تایبەتییە نهێنیەکانی ئیخوان [1].

٩- وانەی گشتی مزگەوت.

لەپاڵ ئەمانەشدا، بەرهەمی نووسەرانی وەکو: حەسەن بەننا، سەید قوتب، مستەفا سباعی، ئەبو حەسەنی نەدوی و ئەبو ئەعلای مەودودی، سەرچاوەی سەرەکی ئەدەبیاتی ئیخوان بوون، ئەندامان نووسینەکانیان دەخوێندەوەو لە وتنەوەی وانەکاندا سوودیان لێوەردەگرتن [2].

دیدو هەڵوێستی ئیخوان لە ئاست ڕوداوو گۆڕانکارییەکانی ئەو دەمەدا گەلێك جاران گۆڕانی بەخۆوە دیوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی نەیتوانیوە لە ئاست هەندێ مەسەلەی چارەنوسسازدا هەڵوێستی یەکلاکەرەوەی هەبێت، بە تایبەتیش مەسەلەی کورد کە ئیخوان هەڵوێستی لە بەرامبەریدا سلبی بوو [3]. بەڵام کەسایەتی و زاناکانی ناو ڕەوتی

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (جەعفەر مستەفا)، هەڵەبجە، ٢٠٠٤/١٢/١٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] لە باسی چوارەم بە درێژی باس لە هەڵوێست و تێڕوانینی ئیخوان لەو مەسەلانە دەکەین.

ئیسلامیی باشوری کوردستان له زۆر مسهلەی چارەنوسسازدا هەڵوێستیان دەربڕیوەو پەتی بێدەنگیان پساندووە، لەمەشدا شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بە ڕوونی جێدەستی دیارە، کاتێك حزبی ئیسلامیی هەڵوەشێنرایەوەو بارەگاکانی داخرا، شێخ عوسمان بەسەرۆکایەتی وەفدێك چووە سەردانی عەبدولکەریم قاسم، شێخ عوسمان نەیتوانی عەبدولکەریم قاسم ببینێ، بۆیە لە جیاتی دیدار بیرخەرەوەیەکی توندی لە (٢٥ شوباتی ١٩٦١) ئاڕاستەی ناوبراو کرد[١].

دوای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١ن) لە باشووری کوردستانو ئاڵۆزبوونی پەیوەندی حکومەتی عێراقو کورد، حکومەتی عێراقو خودی عەبدولکەریم قاسم، هەوڵی زۆریاندا بۆ ناشیرین کردنی کوردو جوڵانەوەکەی، کاتێك عەبدولکەریم قاسم لە وتارێکدا باس لەوە دەکات کورد لە عێراق میواننو دەبێت بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، شێخ عوسمان بەناوی زانایانی کوردستانو هەڵەبجەوە، بیرخەرەوەیەك ئاڕاستەی قاسم دەکاتو گوتەکانی ناوبراو ڕەتدەکاتەوەو داوا دەکات لە چوارچێوەی عێراقی یەکگرتوودا دەستووری قورئان چارەسەری کێشەی کورد بکات[٢].

دوای هاتنە سەرکاری بەعسییەکان لە(١٩٦٨)، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز سەردانی مەلا مستەفا بارزانی[*] کردو پێشنیازی دامەزراندنی یەکێتیی زانایانی ئایینی بۆ بارزانی کرد، بارزانی بەحوکمی پێگەی ئایینی بەو پێشنیازە خۆشحاڵ بوو، هاوکاری زانایانی کرد بۆ دامەزراندنی ئەو یەکێتییە[٣]. هۆکاری دامەزراندنی ئەو یەکێتییە بریتی بوو لە:

---

[١] الدکتور عثمان علي: مقابلة ولقاء عام بين مجلة ئالای ئیسلام والدکتور طه جابر العلواني، ل١٥.

[٢] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٦).

[*] مەلا مستەفا بارزانی: مستەفا موحەممەد عەبدولسەلام، شۆڕشگێڕو سەرکردەیەکی ناوداری کوردە، ساڵی (١٩٠٤ن) لە گوندی بارزان لە دایك بووە، لە تەمەنی لاوییەوە تێکەڵی ڕووداوە سیاسییەکان بووە، بەشداری شۆڕشی دووەمی بارزانو دامەزراندنی کۆماری کوردستانی لە مهاباد کردووە، لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١– ١٩٧٥) ڕێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلولی دژی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق کردوە، لە (١٩٧٩/٣/١) لە ئەمریکا بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ١٠/ ١٢/٢٠٠٤.

١ـ بەشداری کردن و بەدەمەوە چوونی شۆڕشی کوردو هەستکردن بە لێپرسراوێتی بەرامبەر ئایین و نەتەوە.

٢ـ شیوعییەکان هێندە توندڕەو بوون تەنگیان بە زانایان هەڵچنیبوو، بێڕێزیان بە پیرۆزییەکانی ئیسلام دەکرد، بەرەی حکومەتی بەعسیان گرتبوو[١].

ئەم هەڵوێستانە، زیاتر هەوڵ و تێکۆشانی تاکەکەسی، یاخود چەند زاناو کەسایەتییەکە، هەر چەندە زۆربەی ئەو زانایانە هەڵگری بیری ئیخوان بوون، بەڵام هەڵوێستەکان ناچنە خانەی هەڵوێستی فەرمی ئیخوان. دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە خودی هەڵوێستەکان بوێرانەن و بەشێکن لە مێژوی ڕەوتی ئیسلامیی باشوری کوردستان، چونکە خاوەن هەڵوێستەکە کەسێکی هەڵسوڕاوو دیاری ناو ئەو ڕەوتەیەو ناکرێت هەڵوێستەکان لە مێژووی ئەو ڕەوتە دابڕین.

هەر چەندە لە دەیەی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی سەدەی بیست ئیخوان چالاکترین باڵی ڕەوتی ئیسلامیی بوو، بە درێژایی ئەو مێژووە لە باشووری کوردستان کاری کرد، بەڵام سەرکەوتنی ئەوتۆی بەدەست نەهێناو ڕێکخستنێکی بەرتەسکی هەبوو، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:

١ـ شێوازی کارکردنی ئیخوان کە نەیانتوانیوە ڕێکخستنەکانیان بۆ ناو سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگە شۆڕ بکەنەوە، کارەکەیان زیاتر لە توێژی زانای ئایینی و خوێندەواری زانکۆ گیردابوو[٢]، توێژی یەکەم پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك بنەماڵەی ناودارو خاوەن پێگەی ئایینی و کۆمەڵایەتی، بە تایبەتی لە هەولێرو هەڵەبجە، توێژی دووەمیش پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك لاوی تازە پێگەیشتوی خوێندەواری ناو زانکۆو پەیمانگاکان[٣].

ئەمەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی کارکردنی خودی سەواف، ئەو لە هەنگاوی یەکەمی کارکردنیدا گرنگی زۆری بەو دوو توێژە دەدا، لەو کاتەشدا ئەو دوو توێژە کەمینەی کۆمەڵگە بوون، ئەمەش وای کرد کاری ئیخوان سنوردار بێت.

---

[١] ابراهیم طاهر معروف: هەمان سەرچاوە، ل٢٠ ـ ٢١؛ ئەرسەلان توفیق محەمەد: هەمان سەرچاوە، ل١٩.

[٢] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٢٨٦.

[٣] ئەرسەلان توفیق محەمەد: هەمان سەرچاوە، ل١٣.

٢ـ پشتگیری نەکردنی دۆزی کوردو گرنگی پێنەدانی[1]، جێگەی سەرنجە هەر چەندە ئیخوان بەرامبەر کێشەی کورد بێ هەڵوێست بوو، بەڵام ڕەوتی ئیسلامیی کوردستان، لە ئاست ڕوداوو گۆڕانکارییەکانی جیهانی ئیسلامیی زۆر جار بەدەنگ هاتووەو هەڵوێستی دەربڕیوە، کاتێك حکومەتی میسر بڕیاری لە سێدارەدانی سەید قوتبو هاوڕێکانی دەرکرد، مەلا سالح عەبدولکەریمو شێخ عوسمان عەبدولعەزیز نامەیەك بۆ جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر دەنێرنو داوای هەڵوەشاندنەوەی حوکمی لە سێدارەدانەکە دەکەن[2]. هەروەها کاتێك ئیخوانەکانی عێراق بڕیاری لە سێدارەدانی سەید قوتب دەبیستن، لە کەرکووکەوە وەفدێك کە پێکهاتبوو لە (شێخ نازم ئەلعوبێدی، نیزامەدین عەبدولحەمید، سلێمان موحەممەد ئەمین ئەلقابلی، یوسف سدقی)، دەنێرنە لای مەلا مستەفا بارزانی تا پشتیوانی خۆی بۆ هەڵوەشاندنەوەی حوکمی لە سێدارەدانی سەید قوتب دەربڕێت، مەلا مستەفا بارزانی کاغەزێکی سپیان بۆ واژۆ دەکاتو پێیان دەڵێت: بڕۆن بە ناوی منەوە چی بە باش دەزانن بینووسن[3]!

---

[1] لە باسی چوارەم بەدرێژی باسی هەڵوێستی ئیخوان لەمەڕ کێشەی کورد دەکەین.

[2] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٧).

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

## باسی چوارەم: سەرنجێکی گشتی سێ دەیەی کاری ئیخوان لە عێراق‌و کوردستان

کاری ئیخوان لە عێراق، لە دەیەی چوارەم‌و پێنجەم‌و شەشەمی سەدەی بیست، گەلێك قۆناغی جۆراوجۆری بەخۆوە دیوە، لەو سێ دەیەدا ئیخوان بە گەلێك شێواز کاریکردووە، بە نهێنی‌و ئاشکراو لە چوارچێوەی کۆمەڵەو پارتی سیاسییدا، کاری جەماوەری‌و رێکخراوەیی، رووبەڕوو بوونەوەو هاوپەیمانێتی، تێکڕای ئەو شێوازانە لای ئەو رەوتە پەیڕەوی لێکراوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە چەندین کەناڵی جۆراوجۆرەوە بیری ئیخوان ئاراستەو پەخش دەکرا.

بێگومان، شەن‌و کەو کردنی کارو هەڵوێست‌و دیدو تێڕوانینی ئیخوان، لە ماوەی سێ دەیەدا کارێکی سانا نییە، بەتایبەتیش کە ژێدەری پێویست بەردەست نەبێت تا توێژەر پشتی پێ ببەستێت، بەڵام گرنگی‌و هەستیاری بابەتەکە ئەوە دەخوازێت دەستبەرداری نەبین‌و بەدواداچونی زیاتری لەبارەوە بکەین.

دیارە هەر دیاردەیەکی مێژوویی بەدەر نییە لە خاڵی بەهێزو لاواز، دەستنیشانکردن‌و قسەکردن لەسەر ئەو دوولایەنە جەوهەری توێژینەوەی مێژوویی پێکدێنێت، هەر لەو ڕوانگەوە سێ دەیەی کاری ئیخوان لە عێراق‌و باشووری کوردستان، وەکو دیاردەیەکی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئایینی گەلێك لایەنی بەهێزو لاوازی تێدایەو دەگونجێت وەکو ئەزمونێکی مێژوویی ناوزەدیان بکەین.

ئێمە لێرەدا گوزەرێکی خێرا دەکەین بە سێ دەیەی کاری ئیخوان، لە چەند وێستگە دەوەستین‌و خاڵە لاوازەکانی ئەو ڕەوتە دەستنیشان دەکەین، مەگەر بە دەگمەن، ئەگەرنا خۆ لەقەرەی خاڵە پۆزەتیڤەکان نادەین، ئەمەش مانای ئەوە نییە ئەو ڕەوتە هیچ خاڵی بەهێزی تیا نەبووە، بەڵکو ئەوەی ئێمە مەبەستمانە خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەیە، ئەمەش وامان لێدەکات کەمتر بەلای دیاریکردنی خاڵە بەهێزەکاندا بچین.

کاری ئیخوان لە عێراق، لەچاو وڵاتانی دیکەدا تاڕادەیەك درەنگتر دەرکەوت، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی تایفی‌و نەتەوایەتی عێراق، کە لە کوردو

عەرەبو تورکمانو سوننەو شیعە پێکدێت[1]، ئەمە وێڕای ئەوەی لەو دەمەدا، هەڵگرانی بیری چەپ، زۆرینەی چینی ڕۆشنبیرانی عێراقی پێکدەهێناو لە پاڵ ئەوەشدا هەڵگرانی بیری نەتەوایەتیی‌و عەرەبچێتیی لە برەودابوون[2].

لەلایەکی دیکەوە، سەرکردایەتی ئیخوان موسلمین لە میسر بەخودی حەسەن بەنناشەوە گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی، عێراق دوا وڵاتە بانگەوازی ئیخوانی تێدا بڵاودەبێتەوە[3]، ئەم حاڵەتە کاریگەری لەسەر ڕێگوزەری کاری ئیخوان لە عێراق جێهێشت.

کاری ئیخوان لە عێراق، لەسەر دەستی سەواف پەرەی سەندو شێوازی فەرمیی‌و ڕێکخراوەیی وەرگرت، سەواف کەسێکی تاکڕەو بوو، دەیویست هەموو کارەکان لە ژێردەستی خۆیدابێت، خوازیار بوو جوڵانەوەی ئیخوان لە عێراق بەو ئاراستەدا بڕوات، کە خودی خۆی بڕوای پێیەتی، بواری ئەوەی نەدەدا کەسانی دیکە نەشونما بکەن‌و ئازادانە هەڵسوکەوت بکەن، تاکڕەویی سەواف کارێکی وای کرد، هەر زوو ناکۆکی بکەوێتە ڕیزەکانی ئیخوان‌و ژمارەیەک ئەندامی چالاک ڕیزەکانی ئەو ڕێکخراوە جێبێڵن[4]، لەو ڕووەوە (موحەممەد ئالوسی) یەکەم کەس بوو ساڵی (١٩٥٠) ڕیزەکانی ئیخوانی جێهێشت.

ناکۆکی سەواف‌و ژمارەیەک ئەندامی کۆمەڵەی ئادابی ئیسلامیی، گەیشتە ڕادەیەک سەواف ناچاربوو واز لە کۆمەڵە بێنێت‌و بیر لە دروستکردنی کۆمەڵەیەکی دیکە بکاتەوە[5]، ئەم ناکۆکییە لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی درێژەی هەبوو، بێزاری ژمارەیەک ئەندام گەیشتە ڕادەیەک بەرپرسی لقەکانی کەرخ‌و ئەعزەمییەی کۆمەڵە، نامەیان نارد بۆ میسرو گازندەیان لەکارەکانی سەواف کردبوو، بە بازرگانی

---

[1] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٢.

[2] الدكتور عثمان علي: مقابلة ولقاء هام بين مجلة ئالای ئیسلام والدكتور طه جابر العلواني، ل١٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.

[4] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٢.

[5] كاظم أحمد المشايخي: الامام امجد، ل١٩٧؛ محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل١١٠.

کردن بە بانگەوازەوە تۆمەتباریان کرد، لەبەرامبەر ئەوەدا، سەواف بەرپرسی لقەکانی لابردو کەسی دیکەی خستە شوێنیان [1].

ناکۆکی ڕیزەکانی ئیخوان، لقی هەولێری کۆمەڵەی برایەتیشی گرتەوە،دوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، موحەممەد سادق موختار سەرۆکی لقی هەولێر بە بەهانەی ترس لە حکومەت دژایەتی ئەنجامدانی کۆبوونەوەی دەکرد، بەڵام عەبدولوەهاب حاجی حەسەن کە زۆرینەی ئەندامانی لق پشتگیریان دەکرد دژی بۆچوونی سەرۆکی لق بوو، دەرئەنجامی ئەم ناکۆکییە، چاودێری گشتیی غانم حموداتی ڕاسپارد بۆ لێك نزیك کردنەوەی هەردوو بۆچوونەکە، غانم حمودات ماوەی سێ چوار حەفتە هەموو ڕۆژانێکی هەیینی دەچووە هەولێر، بەڵام هەوڵەکانی بێ ئەنجام بوو، هەر بۆیە بڕیار درا بە لادانی سەرۆکی لق و خەلیل عەبدوڵڵا خرایە شوێنی، بەدوای ئەویشدا نیزامەدین عەبدولحەمید بووە بەرپرسی لق، بەڵام نیزامەدین عەبدولحەمید لەگەڵ چاودێری گشتیی (سەواف) کەوتە ناکۆکیو لە نووسراوێکدا بۆ لیژنەی ناوەندی ڕەخنەی لە شێوازی سەرکردایەتیکردنی ڕێکخستن گرتبوو،چاودێری گشتیی لیژنەی ناوەندی کۆکردەوەو نووسراوەکەی نیزامەدین عەبدولحەمیدی بۆ خوێندنەوە، لیژنەی ناوەندی بڕیاریدا نیزامەدین عەبدولحەمید دەربکرێت، بەڵام چاودێری گشتیی ئەو بڕیارەی ڕەتکردەوە [2].

بە گوتەی (هیشام تالب)، کە ئەو دەمە ئەندامی ئیخوان بووە، سەواف لەئاست گرفتەکاندا کەسێکی گوفتاری بوو نەك کرداری، هەمیشە ئەوەی دوپات دەکردەوە

---

[1] محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل١٤٢– ١٤٣. دیارترین جیابوونەوەکان بریتیبوون لە جیابوونەوەی حسێن عەلی سالح –ئەبو عەلی– بەرپرسی لقی ئەعزەمیە لە (١٩٥٢)، جیابوونەوەی بەرپرسی کارگێڕی لقی کەرخ لە (١٩٥٣)، ناکۆکی لقی هەولێر، جیابوونەوەی عەبدولغەنی شەنداڵەو سەرزەنشتی چاودێری گشتیی ساڵی (١٩٥٤). هەندێك لە نووسەرانو کەسانی بەشداربووی ناو ڕووداوەکان بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی پێشوو، پێیانوایە سەواف هۆکاری ئەو جیابوونەوانە نییەو لەو ڕووەوە چەند هۆکارێکی تریان دەستنیشان کردووە کە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نییە بە درێژی بیانخەینە ڕوو. بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەوە بڕوانە: جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل١٠٦– ١١٤ ؛ ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٥٩ – ١٦٠؛ د. محسن عبدالحمید: تاريخ جماعة الاخوان، ل٩١–٩٥.

[2] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل١٦٥ – ١٦٦.

کەپێویستە پارێزگاری یەکڕیزیی بکرێت، بەمەش هیچ گرفتێك چارەسەر نەدەکراو گوتەکانی زیاتر ئاوات خواستن بووە نەك چارەسەر[1]، لەلایەکی دیکەوە، جۆری پەیوەندییەکانی سەواف مایەی ڕەزامەندی سەرکردەکانی ئیخوان نەبوو، بەتایبەتی گەنجەکان خوازیاری هەڵوێستی توندبوون بەرامبەر کاربەدەستانی حکومەت[2]، حاڵەتێکی لەو شێوە ساڵی (١٩٥٩) سەرکردەکانی ئیخوانی هێنایە سەر ئەو بڕوایەی، کە باشتروایە سەواف دەستبەرداری سەرکردایەتیکردنی کاری ئیخوان بێتو دەرفەت بۆ کەسانی دی بڕەخسێنێ، تا ئەو کارە بگرنەدەست، سەرەنجامی ئەو ناڕەزاییانە ئەوەبوو ئەنجومەنی شووورای ئیخوان لە عێراق ساڵی (١٩٥٩) نامەیەکیان ئاراستەی سەواف کردو لە سەرکردایەتی ئیخوان لایانبرد[3]، ناوبراو هەر لەو ساڵەدا ڕۆشتە دەرەوەی عێراق*.

---

[1] لە: طارق الأعظمي: نشوء حركة الأحياء الإسلامي المعاصر في العراق، مجلة ئالای ئیسلام، العدد (١)، السنة (١٣)، آذار ١٩٩٩، ل٣٨.

[2] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٤.

[3] طارق الأعظمي: هەمان سەرچاوە، ل٣٨. بۆچوونی ئەوەش هەیە ئەم ئاڵوگۆڕە لە ساڵی (١٩٥٨) ڕوویدابێت، لە بەرەبەیانی ڕۆژی (١٤ تەمووز ١٩٨٥)، لەسەر داوای لیژنەی ناوەندیی سەرکردایەتییەکی نوێ بۆ ئیخوان هەڵبژێردرا، چونکە ئامانجەکانی شۆڕش دیار نەبووو دۆخەکە ناڕۆشن بوو، ئیخوان بە گومان بوون لەوەی سەواف تووشی ناڕەحەتی ببێت، سەرکردایەتیی نوێی ئیخوان پێکهاتبوو لە: کەمال قەیسی – چاودێری گشتیی بە وەکالەت، داود عیساوی، عەبدولحەکیم موختار، عەلی سالح سەعدون، سەلمان حسێن سەعید، عەبدولمونعیم سالح ئەلعوللی – موحەممەد ئەحمەد ئەلڕاشد، عەبدوڕڕەحمان داود سمیدعی، عەبدولکەریم زەیدان، نوعمان عەبدوڕڕەزاق سامەڕائی. دوای چوونەدەرەوەی سەوافیش کەمال قەیسی لە سەرکردایەتیی ئیخوان مایەوە، بەڵام لە ساڵی (١٩٦٠) ڕوویکردە وڵاتی بەحرەین، ئەنجومەنی شوورا عەبدولکەریم زەیدانی بۆ چاودێری گشتیی ئیخوان لە عێراق هەڵبژارد. جاسم محمد عبدالله نجم اللهيبي: هەمان سەرچاوە، ل١٢٢– ١٢٣؛ ايمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٣٢٦– ٣٢٧. سەواف لە بیرەوەرییەکانییدا وردەکاری ئەو مەسەلەیە باس ناکاتو تەنها ئەوە دەخاتەڕوو کە بە هۆی شۆڕشی (١٤ تەمموز)و کاردانەوەکانی، هەر لە ڕۆژانی یەکەمی شۆڕشدا سەرکردایەتیی نوێی بۆ ئیخوان داناوە، ئەوانیش بۆ پاراستنی گیانی سەواف بڕیاریاندا کە بڕواتە دەرەوەی عێراق. محمد محمود الصواف: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٠.

* سەوافو کۆمەڵێك ڕێکخراوی تر دژی جێبەجێکردنی بڕیاری لەسێدارەدانی سەرکردەکانی جوڵانەوەی شەواف خۆنیشاندانیان سازدا، هەر بۆیە لیوا ئەحمەد سالح عەبدی – دادوەری سەربازی– بڕیاری گرتنی

زۆر جار مەسەلەی کەسی یەکەم لای ئیخوان کێشەی لێکەوتۆتەوە، بە ڕۆیشتنی سەواف بۆ دەرەوەی عێراق، ناکۆکی لە نێوان سەرانی ئیخوان لەسەر ڕێبەرایەتی کردنی ئەو کارە دروستبوو، دانانی (عەبدولکەریم زەیدان) لەبەر زۆری تەمەن، هەر چەندە، ڕەزامەندی هەندێ سەرکردەی ئیخوانی لەسەرنەبوو، تاڕادەیەك ئەو بۆشاییەی پڕکردەوە کە بە ڕۆیشتنی سەواف دروستبوو، هاوکات دانانی ناوبراو جۆرێك بوو لە یەکلاکردنەوەی ململانێی نێوان لایەنە ناکۆکەکانی ئیخوان[1].

زەیدان، بەهەمان شێوازی سەواف، دەیویست کاری ئیخوان بەو ئاراستەدا گوزەر بکات، کەخۆی بڕوای پێیەتی، ئەمەش هەمان هەڵەی سەواف بوو زەیدان دوبارەی کردەوە، هەڵبەتە زەیدان حەزی بەکاری ئاشکراو ڕوبەڕوبونەوە نەدەکردو زیاتر خوازیاری کاری نهێنیو هاوکاریو پێکەوەژیان بوو[2].

لەکاتێدا ئیخوان لە عێراق درەنگ کەوتە چالاکی نواندنو کاری ڕێکخراوەیی، بەڵام سەرکردەکانی ئیخوان لە عێراق بەتایبەتی خودی سەواف دەیانویست بەخێرایی بگەن بەو ئاماتجانەی ئیخوانی میسر بەدەستیان هێناوە، هەر بۆیە بەزویی بەرلەوەی بنکەیەکی جەماوەری بەرفراوان دروست بکەن، تێکەڵ بە ڕودلوە سیاسییەکان بوون، لە ناڕەزاییو خۆنیشاندانەکانی ساڵی (١٩٤٨)، ئیخوان بەشدارییەکی بەرفراوانی کردو بەمەش خۆی بەجەماوەر ناساند[3]، بەو پێیەی ئیخوانی میسر ساڵی (١٩٤٨) دژی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلو هاوکاری بەریتانیا خۆنیشاندانیان سازدا، سەواف

---

سەوافی دەرکرد، ئەنجومەنی شوورای ئیخوانیش، بۆ پاراستنی گیانی سەواف، بڕیاریدا کە ناوبراو بڕوات بۆ دەرەوەی عێراق. ایمان عبدالحميد محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٣٦٤.

[1] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل ١٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٤. بە گوتەی دکتۆر موحسین عەبدولحەمید زۆربەی سەرکردە کۆنەکانی ئیخوان کە لە نزیکەوە زەیدانیان ناسیوە، ئەو ڕاستییە دوپات دەکەنەوە کە زەیدان زانایەکی لێهاتوو دڵسۆزی ئیخوان بووە، بەڵام بە حوکمی پەروەردەو ئەو ژینگەیەی تیایدا گەورە بووە، بۆ ئەوە نەدەگونجا کە ببێتە سەرکردەو ڕێبەری کۆمەڵەیەکی ڕێکخراوی، چونکە پێویستە سەرکردە هەڵگری هەندێ سیفەتی تایبەتی بێت کە شایستەی ئەو کارە بێت. بڕوانە: تاريخ جماعة الاخوان، ل٢٣٥-٢٣٧.

[3] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٤.

هەمان چالاكی ئیخوانی لە عێراق دووبارە كردەوە، دیارە سەواف ڕەچاوی ئەوەی نەكردبوو، كە ئیخوانی میسر، دوای بیست ساڵ كاركردن گەیشتونەتە ئەو قۆناغەی خەبات، لە كاتێكدا كاری ڕێكخراوەیی فەرمی ئیخوان لە عێراق، تەمەنی لە دوو ساڵ تێنەدەپەڕی، ئەنجامی ئەو كارەی ئیخوانی عێراق بەوە گەیشت، دوای ئەوەی حكومەت جارێكی تر بەهێزبۆوەو دەسەڵاتی چەسپا، سەوافو ژمارەیەكی زۆر ئەندامی ئیخوانی لە موسڵ دەستگیر كرد[1]، بەمەش چالاكی ئیخوان بەرتەسكبووەوە.

پەلەكردنی ئیخوانەكانی عێراق، لە تێكەڵ بوون بە كاری سیاسیی، بێ بوونی ئەزمونێكی پێشینە، ئەو ڕەوتەی بەرەو ئیزدواجیەتو هەڵدێر برد، هەر بۆیە بەردەوام ئیخوانەكانی عێراق لە ململانێكاندا سیاسییەكی دۆڕاوو پاشكۆی ڕووداوەكان بوون.

سەرانی ئیخوان تێگەیشتنێكی واقعییان لە ڕەوشی عێراق نەبوو، هۆشیاریی سیاسییان لاواز بوو، هەڵوێستەكانیان زۆرتر پەرچەكرداربوو، لەسەر بنەمای هەستو سۆزو هەڵچوونو كەفوكوڵی كاتی دەردەبڕان، نەك لەسەر بنەمایەكی واقیعیو بابەتی، لە خۆنیشاندانەكانی ساڵی (١٩٥٢)دا لە عێراق سەركردایەتی ئیخوان بێدەنگی هەڵبژارد، بەڵام ئەندامە گەنجەكانی ئیخوان بەشداری خۆنیشاندانەكانیان كرد، بە هەمان شێوە، سەركردایەتی ئیخوان بە شۆڕشی (١٩٥٨) خۆشحاڵ نەبوو*، بەڵام گەنجەكانی ئیخوان بەشداری خۆنیشاندانەكانی پشگیری لە شۆڕشیان دەكرد[2].

دوای شۆڕشی (١٩٥٢)ی میسرو گرژبوونی پەیوەندی جەمال عەبدولناسرو ئیخوانەكانی میسر، ژمارەیەك لە ئیخوانەكانی میسر بەرەو عێراق هەڵاتن، (نوری

---

[1] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٧٥. بۆچوونی ئەوەش هەیە كە گرتنی سەوافو ئەندامانی ئیخوان بە هۆی بەشداریكردنییان بووە لە هەڵبژاردنەكان نەك خۆنیشاندانەكان. بڕوانە: ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٣١٦ پەراوێزی ژمارە (١).

* لە سەرەتادا بە شۆڕش خۆشحاڵ بوون، تەنانەت سەواف بروسكەی پیرۆزبایی بۆ عەبدولكەریم قاسم نارد، بەڵام ئەمە زۆر درێژەی نەكێشاو هەڵوێستی سەوافو سەركردەكانی ئیخوان پێچەوانە بوویەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جاسم محمد عبدالله نجم اللهیبي: هەمان سەرچاوە، ل١٤٩- ١٥٣؛ ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە، ل٢٥٦- ٢٦٠.

[2] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٥.

سەعید) سەرەك وەزیرانی عێراق، دۆستی نزیكی ئینگلیزو دژی شۆڕشی میسر بوو، سودی لە پەنادانی ئیخوانە میسرییەكان بینی‌و هانیدان لە بڵاوكراوەكانیاندا هێرش بكەنە سەر شۆڕشی میسر، هاوكات، ئیخوانەكانی عێراق، لەستەم‌و كەموكورتی حكومەتی پاشایەتی عێراق بێدەنگ بوون، هەر چەند نەبوونە هاوپەیمانی حكومەتی عێراق، بەڵام هەڵبژاردنی بێدەنگی جۆرێك لە ڕازی بوون بەو واقیعەی تێدا دەخوێندرایەوە، ئەمەش دەنگی ناڕەزایی جەماوەری دژ بە ئیخوان زیادكردو سەرەنجام ژمارەیەك ئەندامی ئەو ڕێكخراوە دەستیان لەكار كێشایەوە، كاتێكیش ئیخوان بەشداری ئەو خۆنیشاندانەیان نەكرد، كە دژی هێرشی سێقۆڵی سەر میسر ڕێكخرا، هێندەی تر ئیخوان لای جەماوەر دزێو بوو، ئەمەش كاریگەری هەبوو لەسەر كزبوونی چالاكی ئیخوان، لەبەرامبەردا چالاكی بەعسیی‌و نەتەوەیی‌و شیوعییەكان پەرەیسەند[1].

بوونی ئیزدواجیەت لە هەڵوێستەكاندا، ئیخوانی بەرەو هەڵدێر برد، ناكۆكی ناوخۆو جێهێشتنی ڕیزەكانی لێكەوتەوە، ساڵی (١٩٥٧) ژمارەیەك هێزی نەیاری حكومەت، بەرەی یەكێتیی نیشتمانییان دروستكرد، ئیخوان بە بەهانەی بوونی شیوعییەكان لەو بەرەدا بەشداریكردنی ڕەتكردەوە[2]، بەڵام لە ڕاستیدا ئیخوان نەیدەویست بەرەنگاری دەسەڵات بێتەوە، هەر بۆیە، كاتێك سەرجەم پارت‌و كۆمەڵەو هێزە نیشتمانییەكان بایكۆتی هەڵبژاردنەكانی (٥ مایسی ١٩٥٨)یان كرد، سەواف لە ناوچەی دووی موسڵ خۆی پاڵاوت، سەواف دوای ئەوەی سەركەوتنی بەدەست نەهێنا، وتی: " بە تەزویركردن نەیانهێشت دەرچم"[3].

---

[1] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٤.

[2] ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە. ل٣٠٤.

[3] د. عبدالفتاح علي البوتاني: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٥. سەبارەت بە چۆنێتی خۆپاڵاوتنی سەواف‌و وردەكاریەكانی هەڵبژاردن‌و ناڕەزایی سەواف لە ئەنجامی هەڵبژاردنەكان، بڕوانە: ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە. ل٣١٦ – ٣٢٢.

سەیر لەوەدا بوو، کاتێك سەواف خۆی بۆ هەڵبژاردنەکان پاڵاوتبوو، ڕۆژانە لە ڕادیۆی حکومییەوە بەرنامەی (لەسەر خوانی قورئان)* ی پێشکەش دەکرد، هەر چەندە وانەکانی سەواف سیاسیی نەبوون، بەڵام خەڵکی جۆرێك لە هاوکاری حکومەتی تیا دەخوێندەوە. ئەمەش سیاسەتی حکومەت بوو، توانیبووی کەڵك لە سەواف وەرگرێت بۆ دژایەتی نەتەوەیی‌و شیوعییەکان، لەبەرامبەریشدا نەتەوەیی‌و شیوعییەکان چالاکی خۆیان دژی ئیخوان چڕ کردەوەو سەرەنجامی ئەمەش بە زیان‌و کەنارگیر بوونی ئیخوان تەواو بوو[1].

بەدرێژایی سەردەمی پاشایەتی، ئیخوان لە عێراق خۆی لە ڕووبەڕووبونەوەی حکومەت پاراست، بەڵام دوای شۆڕشی (١٩٥٨)و دەرکەوتنی حزبی شیوعی وەکو هێزێکی چالاك لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی عێراق، ئیخوان وەکو پەرچەکردارێك بەڕووی شیوعییەتدا دەرکەوتن، ئەمەش جۆرێك لە دوو هەڵوێستی‌و ئیزدواجییەتی بۆ دروستکردن، بەردەوام جەماوەر لێی دەپرسین: بۆچی لە سەردەمی نوری سەعید بێدەنگ بوون، وەکو نەیاری حکومەت دەرنەکەوتن‌و جوڵەیان نەبوو؟، بۆچی تا دەسەڵات ڕۆژئاواگەرا بوو، ئیخوان دژایەتی نەکرد؟، ئێستا کە دەسەڵات دژی ڕۆژئاوایە، ئیخوان دژایەتی حکومەت دەکات؟، شیوعییەکان ئەو پرسیارانەیان دەوروژاندو برەویان پێدەدا، ئەمەش ئیخوانی ئیحراج کردبوو[2].

سەرکردەکانی ئیخوان سیاسییەکی کرچوکاڵ بوون، نەیانتوانیوە خوێندنەوەیەکی بابەتیی‌و واقیعییان بۆ ڕووداوو پێشهاتەکان هەبێت‌و پەیوەندییەکی تەندروست لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی گۆڕەپانی عێراق دامەزرێنن[3]، هەرچۆن سەواف لە گیانەڵای

---

* شیوعییەکان ئیخوانیان بە پیاوی ئینگلیزو ئەمریکا تۆمەتبار دەکردو بەرنامەی (لەسەر خوانی قورئان)یان ناونا بوو (لەسەر خوانی ئەمریکا). چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

[1] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٢.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

حکومەتی پاشایەتی خۆی بۆ هەڵبژاردنەکان پالاوت، کاتێك دەنگی ناڕەزایی دژی حکومەتی قاسم پەرەیسەند، هەموو ئەگەرەکان ئەوەیان تێدا دەخوێنرایەوە حکومەتی قاسم دەڕوخێت، کەچی ئیخوان بە هۆی (حاجی ئەمین حسەینی) دەیانویست جارێکی دیکە پەیوەندی لەگەڵ قاسم دامەزرێننو لێی نزیك ببنەوە [1].

هەر چەندە دوای هەڵوەشاندنەوەی حزبی ئیسلامیی عێراقی، قاسم هەوڵیدا، قەناعەت بە سەرکردەکانی حزبی ناوبراو بکات، ناوی حزبەکەیان بگۆڕن بۆ کۆمەڵەیەکی خێرخوازیی، لەو ڕووەوە بەڵێنی هاوکاریو کۆمەکی پێدان، سەرکردەکانی ئیخوان گۆڕینی ناوی حزبیان ڕەتکردەوەو سودیان لەو دەرفەتە وەرنەگرت [2]، بەلام لەگەڵ نزیکبوونەوەی مەرگی قاسم بە نیازن سەرکێشیەکی گەورە بکەنو گرەو لەسەر یارییەکی دۆڕاو بکەن.

هەر لەو کاتەوە زەیدان بووە بەرپرسی یەکەمی ئیخوان لە عێراق، نەیاریی کاری ئاشکرای دەکرد، بەلام لەژێر فشاری هەندێ سەرکردەی ئیخواندا، ملی بۆ دامەزراندنی حزبی سیاسیی ئاشکرا دا، بە هاوکاری چەند کەسایەتییەکی بێلایەن، حزبی ئیسلامیی عێراقییان دامەزراند، هەر چەندە حزبی ناوبراو ڕووکاری ئیخوان بوو، بەلام ئیخوان لە پشتەوە ڕێکخستنی هەبوو، کە دەکرێت ئەوە بە ڕێکخستنی ڕاستەقینەی ئیخوان دابنێین، نەك حزبی ئیسلامیی، ئەوەی زیاتر ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت ڕێگەنەدانی ئیخوانە بە سەرجەم ئەندامەکانی تا لە ڕیزی حزبی ناویراودا کاربکەن، ئەمەش هەر لە سەرەتاوە گرفتی بۆ حزبەکە دروستکرد [3].

حکومەتی عێراق ڕێگەی نەدا حزبی ئیسلامیی کۆبوونەوەی گشتی ئەنجامدا، حزب توشی گرفتی دارایی هاتبوو، کارەکانی لەبەر نەدەڕۆیشت، بە پلەی یەکەم پشتی

---

[1] الدکتور عثمان علی: الحلقة الثانیة من لقاء المجلة الهام بالاستاذ الدکتور طه جابر العلواني، ئالای ئیسلام، العدد(٢)، السنة الثامنة، أیلول ١٩٩٤، ل١١.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١١. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پێشنیازەکەی عەبدولکەریم قاسم بۆ سەرکردە گیراوەکانی حزبی ئیسلامیی بڕوانە: کاظم احمد المشایخي: تاریخ نشأة، ل٨٨ –٩٢.

[3] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٤؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

بەستبوو بە ئابوونەی ئەندامان، ئەمەش حزبی ئیسلامیی خستبووە قەیرانەوە، سەرکردایەتی ئیخوان هەڵوەشاندنەوەی حزبی بە تاکە چارەسەر دەزانی، بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستەش، دەبوو بە شێوازێك ئەو کارە بکەن، خۆیان لە بەرپرسیارێتی هەڵوەشاندنەوەی حزب قوتار بکەن، سەرەنجام ئیخوان دەرکردنی بەیاننامەیەکی دژی حکومەتی قاسم بە باشترین شێواز زانی، ڕۆژنامەی (الحیاد)ی زمانحاڵی حزب بەیاننامەیەکی دوورو درێژی بڵاوکردەوە، تێیدا ڕەخنەی توندی ئاڕاستەی سیاسەتی ئابووریی‌و پیشەسازیی حکومەت کردبوو، ئۆباڵی نەهامەتییەکانی خستبووە ملی حکومەت، لە بەرامبەردا حکومەت کەوتە گرتن‌و ڕاوەدونانی سەرکردەکانی حزب‌و داخستنی بارەگاو هەڵوەشاندنەوەی حزب[1] .

بە وردبوونەوە لە ڕەوتی ڕووداوەکان، دەبینین سێ لایەن ڕۆڵیان بینی لە هەڵوەشاندنەوەی حزبی ئیسلامیی، سەرکردایەتی ئیخوان کە بڕیاری دابوو حزب هەڵوەشێنێتەوە، سەرکردەکانی حزبی ئیسلامیی کە وەڵامی داواکەی سەرانی ئیخوانیان دایەوەو بەیاننامەکەیان دەرکرد، حکومەتی عێراقی کە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی حزبی دەرکرد، بەڵام ئەوەی پشکی شێری ئەو بەرپرسیارێتیەی بەردەکەوێت سەرکردەکانی ئیخوانن[2] ، ئەمەش ڕاستییەکی تاڵی مێژووەو زۆر لەسەرکردەکانی ئیخوان بەوتنی ئەو ڕاستییە تەنگاو دەبن.

هەر چەندە لە بنەڕەتدا سەرکردایەتی حزبی ئیسلامیی زۆرتر لەو کەسانە پێکهاتبوو کە پێشتر لەگەڵ سەرانی ئیخوان ناکۆك بوون‌و لەکار لابرابوون، بەڵام ئیخوان بۆ ڕازیکردنی دڵی جەماوەرەکەی ڕایگەیاند: ڕێپێوان دژی بڕیاری داخستنی حزب ڕێکدەخات، ژمارەیەك خەڵك لە شوێنی دیاریکراو کۆبوونەوە، پاش چاوەڕوانییەکی زۆر ئەو کەسەی بەرپرس بوو لە ڕێکخستنی ڕێپێوانەکە ئامادە نەبوو، سەرەنجام جەماوەر بڵاوەیان کردو ڕێپێوان نەکرا، بە هەمان شێوە، کاتی لەسێدارەدانی سەید قوتب خەڵك بۆ ڕێپێوان کۆبوونەوە، بەڵام بە هەمان شێواز بڵاوەی لێکرا[3] .

---

[1] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

کاتێك، حکومەت لەوە دڵنیا بوو کە ئازادکردنی سەرکردەکانی حزبی ئیسلامیی هیچ مەترسیەکی نییە، ئازادیکردن، بە ئازادبونیشیان ئیخوان بە تەواوی هەموویانی لەکارخست، هۆکاری ئەمەش ئەو ناکۆکییە بوو کە پێشتر لەگەڵ سەرکردەکانی ئیخوان هەیانبوو، سەرکردەکانی ئیخوان لە دەرفەتێك دەگەڕان تا خۆیان لێ ڕزگار بکەن، ئەمەش باشترین دەرفەتی بەدیهێنانی ئەو ئامانجەی سەرکردەکانی ئیخوان بوو[1].

گرفتێکی ئیخوان نەبوونی تێگەیشتنی بابەتی بوو لە ڕەوشی سیاسیی عێراق، تاکڕەویی کەسی یەکەمیش وای کردبوو کە زۆریەی ئەندامان بیر لە ئایندەی کارەکەیان نەکەنەوە، ئەگەر جارجارەش پێشنیازی گونجاو بکرایە، هێندە بەس بوو کە بە دڵی سەرانی ئیخوان نەبێت تا ڕەتبکرێتەوە، ئەم حاڵەتە بە جۆرێك کاریگەری کردۆتە سەر کاری ئیخوان، چەندین دەرفەتی مێژوویان لەدەستداوە، دەکرا ئەو دەرفەتانە بە بارێکی گونجاودا ئاراستە بکرانایە، ساڵی (١٩٦٧) بە بەشداری (٤٠) کەس لە سەرکردەو کادیرە پێشکەوتوەکان، ئیخوان کۆنگرەیەکی لە مزگەوتی (حسیبە) لە بەغداد بەست، تێیدا باس لە بارودۆخی سیاسیی عێراق کراو ڕەوتێك بە ڕێبەرایەتی(موحەممەد فەرەج سامەڕائی) پێشنیازی کودەتاو هەوڵدان بۆ ڕووخانی حکومەتی عێراقو دامەزراندنی حکومەتێکی ئیسلامیی بە ڕێبەرایەتی ئیخوان کرد، بەڵام ئەم بۆچوونە لەلایەن زەیدانەوە ڕەتکرایەوە[2]. سوبحی داودی باس لەوە دەکات کە لە (١٤ تەمموزی ١٩٦٧) لە یەکێك لە باخەکانی یوسفیە سەرکردەکانی ئیخوان

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

[2] صلاح الخرسان: حزب الدعوة الإسلامية حقائق ووثائق، الطبعة الاولى، المؤسسة العربية للدراسات والبحوث الاستراتيجية، دمشق ١٩٩٩، ل٤٠؛ مجول محمد محمود جاسم العكيدي: هەمان سەرچاوە، ل٣٠. هەڵگرانی بیری کودەتا بریتیبوون لە: فلیح حەسەن سامەڕائی، تەها جابر ئەلعەلوانی، سالح عەبدوڵلا سریە، عەبدولغەنی شەنداله، موحەممەد فەرەج. بەڵام زەیدان لە ترسی ئەوەی بە هۆی ئەو ڕووداوەوە ئەو کارەساتە دووبارە بێتەوە کە لە دوای شۆڕشی (٢٣ تەمموز ١٩٥٢) بەسەر ئیخوانەکانی میسر هات، بیرۆکەی کودەتای ڕەتکردەوە، دواتریش سەرکردایەتی ئیخوان، هەڵگرانی بیری کودەتای بە پەرتکردنی ڕیزەکانی ئیخوان تۆمەتبار کردو دەریان کردنو فتوای کەنارگیرکردنیان دەرکرد. د. محسن عبدالحمید: تاريخ جماعة الاخوان، ل٢٢٣-٢٢٥.

کۆبوونەوەیەکیان کرد، نزیکەی (١٣ ـ ١٤) کەس بەشداربوون لەوانە: (سوبحی داودی، سەید ئەحمەد، شامل سەلاح، موحەممەد ئەحمەد ڕاشد، عەبدولکەریم زەیدان، عادل ئەلهاشمی، سەلمان حسێن، ئەبو عومەر،...) لەو کۆبوونەوەدا بڕیاریاندا دەستبەرداری کاری سیاسیی بن و تەنها سەرقاڵی کاری پەروەردەو بانگەواز بن[١].

لە مانگی تەمووزی (١٩٦٨) حکومەتی عەبدوڕڕەحمان عارف تەواو لاواز بوو، بەرپرسی دیوانی سەرۆکایەتی هەواڵی زانیبوو کە بەعسییەکان نیازی کودەتایان هەیە، داوای لە سەرکردەکانی ئیخوان کرد، دەستپێشخەری بکەن و کودەتا بکەن و دەسەلات بگرنەدەست، سەرکردەکانی ئیخوان دەربارەی کودەتا ناکۆك بوون، وێڕای ڕازیبوونی هەندێکیان، سەرەنجام بۆچوونی ڕەتکردنەوەی کودەتا چەسپا، بەمەش ئەو دەرفەتەیان لە دەستداو بەعسییەکان کودەتایان کردو دەسەلاتییان گرتەدەست[٢].

لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٨ ـ ١٩٦٨) چەند کودەتا لە عێراق ڕویدا، زۆربەیان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لەو بارەشدا سەرکردەکانی ئیخوان، هێشتا ڕێگەیان بە ئەندامانیان نەدەدا بیر لە کارێکی وەها بکەنەوە، بەلام هەندێ لە کادیرانی ئیخوان بە نهێنی سەرقاڵی ئامادەسازیی کودەتا بوون، بە گوتەی سدیق عەبدولعەزیز ڕەوتێك لەناو ئیخوان سەریهەڵدابوو، شۆڕشگێڕ (ثوري)یان پێدەوتن، ئەو ڕەوتە دوای دەسەلات گرتنەدەستی بەعسییەکان بە نیازی کودەتابوون[٣].

عەبدولغەنی شەنداله، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی ئەو ڕەوتە، ناوبراو سەردانی هەڵەبجەی کردو داوای لە سدیق عەبدولعەزیز کردووە هاوکاری بکات، بەلام سدیق عەبدولعەزیز هاوکاریکردنی شەندالەی ڕەتکردۆتەوە[٤].

دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی، ئەو ڕاستییە ئاشکرا دەکات، دوای کودەتای دووەمی بەعس لە (٣٠ تەمموزی ١٩٦٨) ئیخوان چووە قۆناغی سڕبوون، پەیامێکی ناوخۆیی

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

[٢] هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی ئیسلامییەکان بەرامبەر ڕوداوەکانی ساڵی ١٩٦٨ لە عێراقدا، گۆڤاری هەڵوێست، ژمارە(٧)، ساڵی دووەم، ١٩٩٣ز، ل١٨.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[٤] سەرچاوەی پێشوو.

دەرکرا بە ناونیشانی (پەروەردەو ڕێکخستنو دەستبەرداربوونی هەرچیەکی دیکە)*، ئەمەش بە شێوەیەکی بەرفراوان پەیڕەوی لێکرا، لەو ماوەدا ژمارەیەك لە ئەندامە لەکارخراوەکانی ئیخوان لە هەوڵی دروستکردنی ڕێکخستنێکی نوێدا بوون، (موحەممەد فەرەج) یەکێ بوو لەو کەسانەو بە کردەوەش لە ناو سوپادا سەرپەرشتی ڕێکخستنێکی سەربازی دەکرد[1].

ساڵی (١٩٦٩) ژمارەیەك ئەندامی ئیخوان بە هاوکاری کەسانی دیکە، هەوڵیاندا کودەتای سەربازی دژی بەعسییەکان ئەنجامدەن، دیدارو کۆبوونەوەکان لە ئێران لە ژێر چاودێری (موحەممەد ڕەزا شا)دا بەڕێوەدەچوون، چەند پلانێك بۆ کودەتا دارێژرا، بەڵام کتوپڕ لە (١٩٧٠/١٠/١٩) سەرنەگرتنی کودەتا لەلایەن حکومەتی بەعسەوە ڕاگەیەنرا**.

کۆتایی ئەم باسە تەرخان دەکەین بۆ قسەکردن لەسەر هەڵوێستی ئیخوان موسلمینی عێراق دەربارەی کێشەی کورد، ئەمەش یەکێکە لەو مەسەلانەی دەبێت هەڵوێستەی لەسەر بکەینو بەوردی سەرنجی لێبدەین، هەر چەندە لە سەرەتای کاری ئیخوانەوە لە عێراق ئەم بیرە باشووری کوردستانی گرتەوە، بە درێژایی سەدەی بیست کورد لە عێراق بەرەو ڕووی چەوساندنەوەو ستەم بۆتەوە، بەڵام ئیخوان هەڵوێستێکی پۆزەتیڤی لە ئاستی ئەو کێشەدا نەبووە، لە ماوەی سەردەمی پاشایەتی ئیخوان چەندین چالاکی سیاسیی نواندووە، دەربارەی کێشەی فەلەستینو جەزائیرو...هتد،

---

* دەقە عەرەبیەکەی بریتی بوو لە (تربية وتنظيم وترك ماسوى ذالك)، ئەم پەیامە لەناو ئەندامانی ئیخوان بە پەیامی سێ تائەکە ناسراوە.

[1] د. طه جابر العلواني: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

** کەسە ناسراوەکانی کودەتا بریتیبوون لە: (عەبدولغەنی ڕاوی ، سەعد سالح جەبر، عەبدوڕڕەحمان نایف، موحەممەد عەلی سەعید)، تا ئێستا زۆر لایەنی کودەتاو شێوازی ئاشکرابوونی نادیارە، پێدەچێت لە داهاتوودا زۆر نهێنی ئەو ڕووداوانە ئاشکرابن. لە ئەنجامی ئاشکرابوونی پلانی کودەتا، حزبی بەعس نزیکەی (١٥٠) کەسی لە سێدارە دا، ئەوانە زۆربەیان پلەداری ناو سوپا بوون، کە ژمارەیەکی زۆر ئەندامی ئیخوانیان تێدابوو، خودی سەددام حسێن سەرپەرشتی لە سێدارەدانەکانی دەکرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: أسرار المحاولة الإنقلابية ضد البعثيين عام ١٩٧٠، مجلة النفير، العدد (٩)، آذار ١٩٩٢، ل ٢٧ .

خۆنیشاندانو کۆڕو کۆبونەوەی جەماوەری سازداوەو کۆمەكو یارمەتی کۆکردۆتەوە، بەڵام بەرامبەر کێشەی کورد، نەك کارێکی وای نەکردووە بەڵکو نەشبیستراوە تەنانەت لە بەیاننامەیەکیشدا داکۆکی لە کێشەی کورد بکاتو داوای لابردنی ستەمی سەری بکات، ئەمەش کەلێنێکی گەورەیە لە کاری ئیخوان لە عێراق[1] .

فەلەستینو جەزائیر هەزاران کیلۆمەتر لە عێراقەوە دوورن، ئیخوان ڕێکخراوی تایبەتی بۆ هاوکاریو کۆمەك کردنییان دامەزراندو کەسانی خۆبەخشی ڕەوانەی فەلەستین دەکرد، بەڵام لە عێراق بە بەرچاوی ئەوانەوە کورد لە ئازارو مەینەتیدابوو، نەك نکوڵییان نەکرد، بەڵکو ئیخوان ئەوەشیان بە کورد ڕەوا نەدیوە زەکاتی کۆکراوەی کوردستان بەسەر هەژارانی کورد دابەشبکرێت[2] .

---

[1] بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی سەرەوە، هەندێك سەرچاوە باس لەوە دەکەن ئیخوان تا ڕادەیەك هەڵوێستی پۆزەتیڤی لە ئاست کێشەی کورد هەبووە، بۆ نموونە لە (١٩٤٤) حەسەن بەننا داوای لە حکومەتی عێراق کرد، لە سایەی برایەتی ئیسلامییدا چارەیەکی ویژدانی کێشەی کورد بکات، ئەوەشی بیرهێناونەوە کە کورد دڵسۆزترین گەلی موسڵمانە بۆ ئیسلام. د. محسن عبدالحمید: تاریخ جماعة الاخوان، ل٢٢٧–٢٢٨.

لە کاتی گەڕانەوەی بارزانی لە یەکێتیی سۆڤیەتەوە بۆ عێراق، زەهاویو سەواف سەردانی مەلا مستەفا بارزانییان کرد لە ئوتێلی سمیرامیس، بەڵام دواتر بارزانی مەیلی زیاتری بەلای شیوعییەکاندا هەبوو، ئەمەش کاریگەری کردە سەر پەیوەندی بارزانیو ئیخوان. ئیبراهیم مودەڕیس باس لەوە دەکات کە لەگەڵ وەلید ئەعزەمی سەردانی بارزانییان کردووە، بارزانییان بانگهێشت کردووە بۆ ئامادەبوون لە ئاهەنگی ئیسراو میعراج، کە بە نیاز بوون لە مزگەوتی ئیمام ئەعزەم لە (٥ شوبات ١٩٥٩) سازیدەن، بەڵام بارزانی داوای لێبووردنی کردووە کە ناتوانێت ئامادەبێتو وتوویەتی: لەبەر قسەی شیوعییەکان نەبوایە ئەهاتم بۆ ئاهەنگەکەتان. ایمان عبدالحمید محمد الدباغ: هەمان سەرچاوە ل٢٧٤.
لەڕووی مرۆیشەوە لە کاتی هەڵایسانی شۆڕشی ئەیلول، ئیخوان لە موسڵ لیژنەی هاوکاری هەبوو کە یارمەتیو کۆمەکی پێشکەشی ئەو کوردانە دەکرد کە بە هۆی جەنگەوە ناوچەکانیان چۆڵ کردبوو ڕوویان کردبووە موسڵ. سەرچاوەی پێشوو. ل٢٧٥.

[2] حاجی تەها حەسەن سنجاری باس لەوە دەکات، ساڵی (١٩٥٠) ئیخوانەکانی سنجار زەکاتی جوتیارانی دێهاتەکانی سنجاریان کۆکردەوە، ئەو گەنمەی کۆیانکردەوە بردویانەتە موسڵو لەوێ فرۆشتویانە بایی (٥٠٠) دینار بووە، ئیخوانەکانی موسڵ هاتوونو داوای پارەکەیان لێکردوون، حاجی تەها داواکەی ڕەتکردونەتەوەو پێی وتون بەسەر هەژارانی ناوچەکەدا دابەشی دەکات. لەسەر ئەوە ناکۆکییان بۆ

ئیخوان موسلمین له میسر دامەزرا، به بیری عەرەبچێتی بارگاوی بوو، ئەمەش دەرەنجامی واقیعی میسر بوو بۆ داكۆكیكردن له عەرەبیەتی میسر بەرامبەر بانگەشەی فیرعەونییەتو ڕۆژئاواگەراكان كه لەگەڵ ئیخوان موسلمین له كێبەركێدا بوون، لەگەڵ گواستنەوەی بیری ئیخوان بۆ عێراق هەمان خەسڵەتی عەرەبچێتی پێوه گواسترایەوە، ئەمەش كاریكردە سەر هەڵوێستی ئیخوان بەرامبەر كورد[1].

دوای شۆڕشی (١٩٥٨)، به هەمان شێوەی سەردەمی پاشایەتی، ئیخوان له بەرامبەر كێشەی كورد بێدەنگ بوو، كاتێك حزبی ئیسلامیی عێراقی به فەرمی دامەزرا، پەیڕەوو پرۆگرامی حزب دانرا، ئەویش جگه له بەرنامەیەكی تیۆریی‌و خستنەڕووی چەند دروشمی زەق چیتر نەبوو.

پەیڕەوو پرۆگرامی حزبی ئیسلامیی، هیچ چارەسەرێكی ڕیشەیی بۆ كێشه ئابووریی‌و كۆمەڵایەتیی‌و سیاسییەكان پێنەبوو، له ماددەی سێی پەیڕەودا هاتووه: "حزب دژایەتی هەر هەوڵێكی جوداخوازیی لەسەر بنەمای تائیفیی‌و ڕەگەزی دەكات"[2]، هەروەها له ماددەی (٥٤)دا هاتووه: "حزب بڕوای به یەكێتیی عێراق هەیه لەسەر بنەمای عێراقی بوون، عێراق بەشێكه له نەتەوەی عەرەب"[3].

وێڕای ئەوەی حزبی ئیسلامیی له پەیڕەوو پرۆگرامەكەیدا به هیچ شێوەیەك باسی كێشەی كورد ناكات، به سەرنجدان له دوو بڕگەی سەرەوەی پەیڕەوو پرۆگرامی حزبی

---

دروست بووه، حاجی تەها نامه بۆ شێخ ئەحمەد زەهاوی‌و عەبدوڵڵا ئەربیلی بەرپرسی لقی موسڵی كۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی دەنێرێت، ئەوانیش حاجی تەها ئاگادار دەكەنەوە كه خاوەن حەقە، بەڵام ئیخوانە عەرەبەكان لەسەر داواكەیان سوور دەبن، ئەمەش وا له حاجی تەها دەكات دەستلەكاركێشانەوەی خۆی پێشكەشی ئیخوان بكات. بڕوانە: چەردەیەك له بیرەوەرییەكانم. ڕۆژنامەی ڕاپەڕین، ژمارە (١٦)، ساڵی یەكەم، ١٩٩٨/٦/١٥. پێدەچێت حاجی تەها له دەستنیشان كردنی ساڵەكەدا ورد نەبێت، چونكه حاجه تەها ساڵی (١٩٥٣) بۆته بەرپرسی هۆبەی سنجاری كۆمەڵەی برایەتی ئیسلامیی، بۆیه دەبێت دەستلەكاركێشانەوەكه دوای ئەو مێژووه بێت.

[1] الدكتور عثمان علي: مقابلة ولقاء هام بين مجلة ئالای ئیسلام والدكتور طه جابر العلواني، ل١٢-١٣.

[2] كاظم أحمد المشايخي: تأريخ نشأة، ل٣٥.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.

ئیسلامیی، هەستی عەرەبچێتی بە ئاشکرا لە بیری حزبدا ڕەنگی داوەتەوە. ئەمە لەکاتێکدایە کە ماددەی (٥٧) تەرخانکراوە بۆ باسکردنی کێشەی فەلەستینو ماددەی (٥٨) تایبەتە بە باسی پشتگیری جەزائیرو عوممانو ولاتانی تری ئیسلامیی بۆ ڕزگاربوون لە ئیستیعمار[1].

ئیخوان، هێندە دەربارەی کێشەی کورد خەمسارد بوون، چەند ساڵ درێژە کێشانی شۆڕشی ئەیلول ڕاینەچڵەکاندن هەڵوێست لەمەڕ کێشەی کورد وەرگرن، دکتۆر تەها جابر ئەلعەلوانی، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی حزبی ئیسلامیی عێراقیو دەربارەی ئەو خەمساردییەی ئیخوان دەڵێت: "ئیخوان بڕیاری دابوو خۆی لە کاری سیاسیی بەدوور بگرێت، جارجار لە ژێر فشاری ڕوداوەکاندا بەیانێکی سنورداری دەردەکرد، ئەمەش زیاتر لە بۆچونێکی فیقهی دەچوو، هەر بۆیە زۆرجار گلەییان دەهاتە سەر، تەنانەت لەلایەن سەرکردەکانی کورد گلەیی ئەوە دەکرا، ئیسلامییەکان هیچ شتێکیان ڕانەگەیاندووە خواستی کوردی تێدابێت، یاخود سەرزەنشتی ئەو ستەمە بکات کە لەسەر کوردە"[2].

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥. لە کۆی (١٠) بڵاوکراوەی نهێنیی ناوخۆیی کە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٣– ١٩٦٦) لەلایەن ئیخوانەوە لە عێراق دەرچووە، هیچکامیان باس لە کێشەی کورد ناکات، ئەمە لە کاتێکدا هەندێ لەو بڵاوکراوانە تایبەت بووە بە مەسەلەی پاکستانو فەلەستینو زنجیارو میسر، لەو بابەتانەش کە لە چەند ژمارەیەکی گۆڤارەکانی (المنهاج، النقیب)دا بڵاوکراونەتەوە، یەك بابەتیان لەژێر ناوی (مأساتنا في الشمال اعادة نظر في الموقف) باس لە مەسەلەی کورد دەکات. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. محسن عبدالحمید: تاریخ جماعة الاخوان، ل٢٢٥–٢٢٩.

[2] الدكتور عثمان علی: الحلقة الثانیة من لقاء المجلة الهام بالاستاذ الدكتور طه جابر العلواني، ل١١.

## باسی یەکەم: کاری ئیسلامیی لە حەفتاکان و نیوەی یەکەمی هەشتاکاندا

دوای ئەوەی کاری ئیخوان بە فەرمی لە (٤/٤/١٩٧١) وەستێنراو ڕێکخستن هەڵوەشایەوە، ئەم حاڵەتە کوردستانیشی گرتەوە[١]، هەر چەندە زۆرێك لە کادیرانی ئیخوان کاری ڕێکخستنیان بە حەرام دەزانی و لای ئەوان بڕیارەکەی سەرکردایەتی ئیخوان جۆرێك لە پیرۆزی هەبوو، بەڵام کۆمەڵێك کەسایەتیی، لە ساڵانی حەفتادا لە ناوچە جیاوازەکانی باشووری کوردستان جموجۆڵیان هەبوو، ئەو قۆناغەی کاری ڕەوتی ئیسلامیی، کە لە سەرەتای حەفتاکانەوە، دوای وەستانی کاری ئیخوان بە فەرمی، لە عێراق و کوردستان دەستپێدەکات، ناتوانرێت کۆتاییەکەی بە تەواوی دەستنیشان بکرێت، چونکە کۆتایی هاتنی ئەم قۆناغە شێوازێکی ڕیزبەندی وەرگرت و ماوەیەکی درێژی خایاند، دەتوانین نێوان ساڵانی (١٩٧٨ ـ ١٩٩١) بە کۆتایـی ئەم قـۆناغە دابنێین، بەواتـایەکی دیـکە، دروستبوونی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی لە (١٩٧٨) لە لایەك و دەست بەکاربوونەوەی سدیق عەبدولعەزیز لە ساڵی (١٩٧٩) لە لایەکی ترەوە، بوونە گوڕزی کاریگەر بۆ شکاندنی تەوقی حەرامی ڕێکخستن، کە ئیخوانە دێرینەکان برەویان پێدەدا.

پاشانیش، لە سەرەتای هەشتاکانەوە کارو چالاکی کادیرانی ڕەوتی ئیسلامیی بەرفراوان بوو، هێڵی سەلاحەددین موحەممەد، هاتە مەیدان و دواتریش لە (١٩٨٥) مۆڵەتی ڕەسمی کارکردنی لە سەرکردایەتی ئیخوان وەرگرت[٢]، هەر لەو ساڵەشدا ئیخوانەکانی کوردستان و ناوەڕاستی عێراق یەکیانگرتەوە[٣]، لە لایەکی ترەوە، ئەمەش ساڵانی هەشتا بزووتنەوەی پەیوەندی، چووە قۆناغی ئاشکراو کاری چەکداری، ئەمەش ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی لێکەوتەوە.

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٨/١/٢٠٠٥.

[٢] هیـوا: ماڵـەکۆك، ب.ش، ب.م، ل١٩؛ بـاوکی نوسـامە: بزووتنـەوەی ئیسـلامی واجبێکـی شـەرعیو زەروورەتێکی واقعیە، بەشی پێنجەم، گۆڤاری جەماوەر، ژمارە (٤٤)، ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٩٥ز، ل٧.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٨/١/٢٠٠٥.

ڕەوتی ڕوداوەکان بەو ئاڕاستەدا گوزەری کرد، تا ساڵی (١٩٩١) ڕاپەڕینی گەلی کورد دژی بەعس بەرپابوو، ئەمەش بە تەواوی کۆتایی هێنا بەو قۆناغەو ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان بە شێوازێکی بەرفراوانتر لە جاران هاتە مەیدان.

کاری ئیسلامیی لە سەرەتای ئەو قۆناغەدا، بە کاری تاکەکەسی دەستی پێکرد، دواتریش شێوازی فرە میحوەرییو ناوچەیی وەرگرت، بە ڕاوەستاندنی کاری ئیخوانو پچڕاندنی پەیوەندییە ئۆرگانییەکان، هەندێ لە مامۆستاکان بە شێوەی سەربەخۆ وانەیان بە قوتابییەکانیان دەوت، هەندێ جار لە شارێکدا یان لە شارۆچکەیەکدا چەند مامۆستا هەبوونو هەریەکەیان بە سەربەخۆ لەوی دیکە کاری دەکرد، لە هەڵەبجە عەبدولعەزیز پارەزانی مامۆستای پەیمانگای ئیسلامیی هەڵەبجە بوو، لەناو خوێندکارانی پەیمانگا دەجوڵا، ژمارەیەك گەنجی لە شێوەی ڕێکخستنێکدا لە دەوری خۆی کۆکردبویەوە، ساڵانە لە مانگی ڕەمەزانو مەولود سەرپەرشتی سازدانی چەند بۆنەو ئاهەنگی لە ناوچەکەدا دەکرد[1].

هەر لە هەڵەبجە، (ئیبراهیم ڕێشاوی[*]، عومەر ڕێشاوی، موحەممەد فەرەج، هادی عەلی، حەسەن شەمێرانی، موحەممەد عەبدوڕڕەحیم) چالاکیان هەبوو، هەروەها (سدیق عەبدولعەزیز، موحەممەد ڕەئوف، مەولود باوەموراد، مەلا ئەحمەد شافعی) بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەوانی دیکە جموجۆڵیان هەبوو[2].

لە سەیدسادق، (محێدین گەلاڵی، حەمەسەعید، هیوا میرزا سابیر) ڕۆڵیان بینی[3]، لەپاڵ ئەمانیشدا کۆمەڵێك وتاربێژ لەو دەڤەرە ڕۆڵیان بینی لەوانە

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٦/١/٢٠٠٥.

[*] ئیبراهیم ڕێشاوی، یەکێکە لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان لە دەڤەری هەڵەبجەو شارەزوور، ڕۆڵی بەرچاوی بینی لە پەروەردەکردنی کادیرانی ئیخوان لەو دەڤەرەدا، لە (٣١/١٢/١٩٩٢) کۆچی دوایی کردوە. بڕوانە: لە یادی دوو ساڵەی وەفاتی تێکۆشەری ئیسلام ابراهیم ڕێشاوی، ئا: حسن محمود حمە کریم، ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە (٢٣)، ٢٠/١٢/١٩٩٤ز.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (هیوا میرزا سابیر)، هەولێر، ١٨/١٢/٢٠٠٤.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

(شێخ موحەممەد بەرزنجی) لە شانەدەری، (مەلا عەلی بیارە[*] و مەلا موحەممەد شارەزووری[**]) لە سەیدسادق[1].

لە شارۆچکەی سیروان، (حەبیب موحەممەد سەعیدو ئەحمەد کاکە مەحمود[***])

---

[*] مەلا عەلی بیارە: عەلی حسێن میرزا، ساڵی (١٩٤١) لە گوندی (بناوەسووتەی) پێنجوێن لەدایك بووە، هەرلە منالییەوە دەخرێتە بەر خوێندنو دوای وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی، دەبێتە وتاربێژو مامۆستا لە خانەقای بیارە، پاشان لە بەغداد تاقیکردنەوە دەکاتو لەوێش ئیجازەی زانستی وەردەگرێت، چەند ساڵێك وتاربێژی مزگەوتی سەیدسادق بوو، لەگەڵ ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی لە (١٩٨٤) دەچێتە شاخو پۆستی جێگری ڕابەری گشتیو بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری وەردەگرێت، بە هەمان شێوە لە بزووتنەوەی ئیسلامیی دەبێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسییو بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری، ڕۆژی (١٩٨٨/٣/٩) لە ئەنجامی بۆردومانی فڕۆکەی عێراق لە بەرەی جەنگی سیمان کوژرا.

[**] مەلا موحەممەد شارەزووری: موحەممەد سالح ساڵی (١٩٤٦) لە گوندی (کەچەڵی) ناوچەی شارەزوور لەدایك بووە، سەرەتا لای باوکی دەستی بە خوێندن کردوەو پاشان چۆتە هەڵەبجەو درێژەی بە خوێندن داوە، ساڵی (١٩٧١) لە تاقیکردنەوەکانی پەیمانگای ئیسلامیی پلەی (زۆر باش)ی بەدەست هێناوە، لە چەندین گوندو شارۆچکە مەلایەتی کردووەو ڕۆڵی لە هۆشیارکردنەوەی گەنجاندا بینیوە، چەند جارێك لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە دەستگیرکراوەو ئازارو ئەشکەنجەدراوە، وتاربێژو نووسەرێکی بەتوانا بوو، چەند بەرهەمی چاپکراوی هەیە لەوانە (ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا، سروشت لە تەرازووی ژیریدا، داروین لە تەرازووی ژیریدا، فرۆید لەتەرازووی ژیریدا،...) لە (١٩٨٧/٧/٢٥) کۆچی دوایی کردووە. چمکێك لە ژیاننامەی مامۆستا مەلا موحەممەد شارەزووری، ئا: ئارام عەلی سەعید، ڕۆژنامەی ڕێگای یەکبوون، ژمارە (٧٤)، ساڵی یەکەم، ٢٠٠٠/٨/٦ز.

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (ئەحمەد کاکە مەحمود)، هەڵەبجە، ٢٠٠٤/١٢/٨.

[***] ئەحمەد کاکە مەحمود، ساڵی (١٩٥٠) لە گوندی یالانپێ لەدایك بووە، لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە خراوەتە بەر خوێندنی زانستە شەرعییەکان لە گوندی یالانپێ لای مامۆستا سەید حسێن، بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن چۆتە کوردستانی ئێران و لای چەند مامۆستاو لە چەندین ناوچەی کوردستان درێژەی بە خوێندنداوە، دواتر دەگەڕێتەوە کوردستانی عێراقو لەسەردەستی مامۆستا مەلا عوسمان ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتوە، دوای کرانەوەی پەیمانگای ئیسلامیی لە هەڵەبجە، دەبێتە قوتابی ئەو پەیمانگایەو ساڵی (١٩٧١) خوێندنی پەیمانگای تەواو کردووە، دواتر دەبێتە ئیمام و وتاربێژ لە چەند مزگەوتی ناوچەی پێنجوێنو خورماڵو سیروان بە وتارەکانی خەڵکی وشیار دەکاتەوە، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (١٩٨٧)، چەندین بەرهەمی چاپکراوی هەیە لەوانە: (خوا لەڕوانگەی زانیاریەوە، وتەی زاناکان و باوەڕ بە خوا، خواپەرستی لە ئیسلامدا، سەربەستی لە ئیسلامدا،

سەرقاڵی وانە وتنەوە بوون، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە هەشتاکاندا نووسینەکانیان لە ئاستێکی بەرفراواندا پێشوازیان لێدەکرا[1].

ڕەوتی ئیسلامیی لە دەڤەری بیتوێنو پشدەر، لە سەرەتای هەشتاکانەوە بە زەقی دەرکەوت، کۆمەڵێك کەسایەتی ڕۆڵی بەرچاویان لەو بێدارییەدا بینی، لەوانە ( عەلی باپیر، عەبدولقادر هەڵۆنەیی، مەغدید حسێن*، مەلا عومەر تیماری** )[2]. سەرەڕای ئەوانەی ناومان بردن، بورهان موحەممەد ئەمین باس لەوە

---

ئاشتی لە ئیسلامدا، پەروەردە لەئیسلامدا، جیهاد لە ئیسلامدا، تەفسیری ڕامان، ...هتد)، لە ٢٠٠٧/١/٢٥ کۆچی دوایی کردووە.

[1] نووسەرێکی نەزانراو: کاروانی ڕێ، ب. ش، ١٩٩٧، ل٣٠. بە گوتەی ئەحمەد کاکە مەحمود، ئەو بەرهەمانەی لە هەشتاکاندا بە چاپی دەگەیاندن، بە شێوەیەك پێشوازی لێدەکرا کە پاش ماوەیەکی کەم بەرهەمەکانی لە کتێبخانەکاندا نەدەما، ئەمەش وای کرد بەرهەمەکان چەند جار چاپ بکرێتەوە. چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، هەڵەبجە، ٢٠٠٤/١٢/٨.

* مەغدید حسێن: ساڵی (١٩٥٣) لە گوندی (ڕێزینە)ی ناوچەی ڕانیە لە دایك بووە، لە تەمەنی شەش ساڵی دەخرێتە بەرخوێندنو ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێتو لە مزگەوتی ناجیەخان لە ڕانیە دەبێتە وتاربێژ، لە سەرەتای هەشتاکاندا لە چوارچێوەی کاری ئیخوان لە ڕانیە چالاکانە هەڵدەسوڕاو جێدەستی لەو ناوچەدا دیارە، ساڵی (١٩٨٨) دەچێتە شاخو پەیوەندی بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە دەکاتو دەبێتە فەرماندەی هێزی ئازادی، لە کۆنگرەی پێنجەمی بزووتنەوەی ئیسلامیی بە ئەندامی سەرکردایەتیو لە کۆنگرەی شەشەم بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی هەڵدەبژێردرێت، لە (١٩٩٢/١٢/٢٦) لە شەڕی نێوان یەکێتیی نیشتمانییو بزووتنەوەی ئیسلامیی کوژرا. ڕێبوار کوێستانی: چەردەیەك لە ژیانی پڕ سەروەری ماموستای سەرکردە ماموستا مەلا مەغدید، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە(٢٥)، ٢٠٠٢/٥/٢.

** مەلا عومەر تیماری: عومەر مستەفا پەلکویی، ساڵی (١٩٥٢) لە گوندی (مەلا ئۆمەر) سەر بە ناحیەی چنارانی ئەو کاتە لە دایك بووە، سەرەتا لای باوکی خوێندویەتی، ساڵی (١٩٧٤) بڕوانامەی زانستی لە شەریعەتدا وەرگرتووە، لە دەشتی کۆیە سەرقاڵی وانە وتنەوە بووە، چەند کەس لەسەر دەستی ئەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، دواتر دەچێتە گوندی تیمارو قوتابخانەیەکی زانستی شەرعی دەکاتەوە، لە (١٩٨٤/٦/٢١) کوژرا. بڕوانە: گیانبازانی ڕێگەی خودا، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (٣١)، ٢٠٠٢/٧/٤.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن بابەکر) هەولێر، ٢٠٠٥/١/٥.

دەکات ساڵی (١٩٨٤) گەشتێکی ئەو ناوچەی کردووەو پەیوەندی بە (عەلی میربەگی، مەزهەر، ڕەسوڵ، عەزیز) ناوێکەوە کردووە[١].

لە سلێمانی، (حەسەن پێنجوێنی، ئەبوبەکر موحەممەد عەزیز، بورهان موحەممەد ئەمین) ڕۆڵیان هەبوو[٢]، هەروەها (تەها حەمەساڵح و جەزا حەمەساڵح) سەربەخۆ لە خەڵکانی تر کاریان دەکرد، (فاتح کرێکار)یش لە هەولێرو سلێمانی تا ڕادەیەك کاریگەری هەبوو[٣].

لە کەرکووك، جگە لە کاری ژمارەیەك ئەندامی ئیخوان، شێخ نازم[*] جموجۆڵێکی بەرفراوانی هەبوو. هەروەها لە کەلار (مەلا موحەممەد هۆرێنی) ڕۆڵی هەبوو[٤].

ڕەوتی ئیسلامیی، جگە لە هەڵەبجە، لە هەولێر، لەچاو شارەکانی دیکە لە هەشتاکاندا چالاکی زیاتر بوو، بوونی زانکۆو گەورەیی شارەکە ڕێگەیان بۆ چالاکبوونی ڕەوتی ئیسلامیی خۆشکرد، بەڵام ئەو چالاکبوونە شپرزەو پەرتەوازە بوو، لە حەفتاکانەوە (موخلیس یونس، سەید عیزەدین، ئەبوڕائید، حاجی فوئاد، موحسین

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٦/٢/٢٠٠٥.

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

[٣] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٣١.

[*] شێخ نازم، پیاوێکی ئایندارو شێخی عەشیرەتی عوبەیدی بوو لە حەویجە، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی هەبوو، هەر لە شەستەکانەوە جموجۆڵێکی بەرفراوانی جەماوەری هەبوو، دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق لە نفوزو دەسەڵاتی دەترسان، هەوڵیاندەدا بە پێدانی پارەو پلەوپایە لە خۆیانی نزیك بکەنەوە، بەڵام ئەم هەوڵانە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، لە سەرەتای هەشتاکاندا لەناو زانکۆو سوپادا لایەنگری هەبوو، لایەنگرانی سوپا لە ڕێگەی مەلاڕامی و موقەددەم ئەحمەدو ئەندازیارێکەوە بوو، جوڵانەوەو هەڵچوونێکی ناڕێکخراوی دروستکرد، (موحەممەد عوبەید ئەلبەیاتی) پێشنیازی کودەتای بۆ کرد، هەر چەندە سەرەتا بە کودەتا ڕازی نەبوو، بەڵام دواجار ڕەزامەندی نواند، موقەددەم ئەحمەد یەکێك بوو لە متمانە پێکراوەکانی شێخ نازم بیرۆکەی کودەتاکەی لای نەقیبی خانەنشین (زوهێر عەزاوی) باس کرد، ناوبراویش بەرزان تکریتی لەو بیرۆکەیە ئاگادار کردەوە، بەمەش پلانەکە بۆ حکومەتی بەعس ئاشکرابوو، حکومەتی بەعس نزیکەی (١٤٣) کەسی گرت و لەسێدارەی دان و کۆتایی بە جموجۆڵی شێخ نازم هات.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٦/١/٢٠٠٥.

جوامێر) جوڵەو چالاکییان هەبوو، هەر لە هەولێر (دکتۆر عیسام ئەلراوی) بەناوی ئیخوانەوەو بە هێڵێکی سەربەخۆ کاری دەکرد، (بورهان شێروانیو زوهێر خۆشناو)و چەند کەسی دیکە سەر بەو هێڵە بوون[1].

جگە لەوانەی پێشتر ناومان بردن، (مەلا ئەمین) کە لە سەرەتای حەفتاکانەوە وازی لە ئیخوان هێنابوو لەگەڵ (مەلا جەمیل، مەلا جەمال، مەلا یەحیا)، ڕوویانکردە قورئانو فەرموودە لەبەرکردن، مەلا ئەمین ڕەخنەی توندی لە ئیخوان دەگرتو بەرامبەریان توندوتیژ بوو[2].

کارو چالاکی ڕەوتی ئیسلامیی لە دەڤەری بادینان لە کۆتایی حەفتاکانەوە دەستی پێکردبوەوە، حاجی تەها سنجاری ئەندامێکی دێرینی ئیخوان بوو، کۆمەڵێك لاوی کۆکردبویەوەو وانەی پێدەوتن، لەوانە (ئەبو شڤان، وەلید یونس ئەحمەد، جەمال ئەحمەد، موحەممەد تاهیر، زوهێر حجی، زەکی نورەدین)، ئەمانە لەناو خۆیاندا شێوە ڕێکخستنێکییان هەبوو لەناو مزگەوتەکاندا وانەیان دەوتەوەو چالاکییان هەبوو[3].

هەر لەو قۆناغەدا، هەندێ لەو کەسانەی پێشتر ئیخوان بوون، دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی نوور، بەو پێیەی بانگەوازی نوور زیاتر گرنگیدان بوو بە بابەتە ئیمانییەکانو بواری پەروەردە، ئەمەش جێداری کاری ئیخوان بوو[4]، دیارە حکومەتی بەعس بانگەوازی نووری بە مەترسی نەدەزانی، چونکە خۆی لە مەسەلە سیاسییەکان دەبوارد، هەر ئەمەش وای کرد بەعس تاڕادەیەك چاوپۆشی لە بانگەوازی نوور بکات.

بانگەوازی نوور، لە سەر دەستی (ئیحسان قاسم ئەلسالحی) کە یەکێك بوو لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوانی نیشتەجێی کەرکوك هاتە ناوچەکە، ناوبراو ساڵی

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٣١.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢ ـ ٣٣.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

(١٩٦٩ ـ ١٩٧٠) ئەڵقەی پەیوەندی (حلقة وصل)ی نێوان کەرکوکو هەڵەبجەی ئیخوان بوو[1]، بەو هۆیەوە لەگەڵ ئەندامانی ئیخوان لە ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوور ناسیاوی پەیداکرد. ئەلسالحی پەیامەکانی سەعید نوورسی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، لەگەڵ ئاشنابوونی ژمارەیەك لە ئەندامانی ئیخوان بە بیری نوورسی، پەیامەکانیان کردە سەرچاوەی پەروەردەیی‌و کارکردنیان، دواتریش لە ساڵانی هەشتادا، زۆرێك لە بەرهەمەکانی نوور بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕدران* و لەناو ئەندامانی ڕەوتی ئیسلامیی برەویان پەیداکرد.

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

* زۆربەی پەیامەکانی نوور، لەلایەن (فاروق ڕەسول یەحیا)وە وەرگێڕدرانە سەر زمانی کوردی.

## باسی دووەم: خەسڵەتو تایبەتمەندیی ئەو قۆناغەی کاری ئیسلامیی

وەستاندنی کاری ئیخوان بە فەرمی لە (١٩٧١/٤/٤)، کاریگەری ڕاستەوخۆی لە سەر ڕەوتی ئیسلامیی باشووری کوردستان هەبوو، هەر چەندە ئەم بڕیارە لەو قۆناغەدا توانی گیانی ئەندامانی ئیخوان لە مەرگو مەترسی دەسەڵاتی بەعس بپارێزێت، بەڵام کاریگەری مەترسیداری کردە سەر ڕێگوزەری ڕەوتی ئیسلامیی، بڕیارێکی لەو شێوە پەرتبوونی ڕیزەکانی ئەو ڕەوتەی لێکەوتەوە.

بڕیاری ڕاگرتنی کار لای ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی ئیخوان، جۆرێك لە پیرۆزی هەبوو، سەرپێچیکردنی ئەو بڕیارەیان بە گوناهی گەورە دەزانی، ئەو جۆرە بیرکردنەوە تا ڕاپەڕینی (ئازاری ١٩٩١) لە بیری هەندێ ئەندامی دێرینی ئیخوان شەپۆلی دەداو پیرۆزی خۆی لەدەست نەدا، لەپاڵ ئەمەشدا هەر وەکو لە باسەکانی پێشوو ئاماژەمان پێدا، چەند کەس توانیبویان کۆتو بەندی پیرۆزی بڕیاری سەرکردایەتی ئیخوان بپسێنن، بەشێوەیەکی سەربەخۆ کەوتنە کارکردن، ئەو کەسانەش هەریەکەیان بە دیدو تێڕوانینی خۆی جۆرێك لە کاری ئەنجامدەدا.

لێرەوە کاری تاکەکەسو پەرتەوازەیی، بووە خەسڵەتێکی بەرچاوی ئەو قۆناغەی کاری ئیسلامیی، هەر مامۆستایەك ژمارەیەك قوتابی بە دەورەوە بوو وانەی پێدەوتن، بە بۆچونی خۆی ئالییەتی کارکردنی بۆ دەستنیشان دەکردن، زۆرێك لەوانەش خۆیان بە ئیخوان دەزانیو هەر بەو ناوەوە کاریان دەکرد، تەنانەت هەندێکیان پێیان وابوو جۆری کارو بیرکردنەوەی ئەوان کتومت کاری ئیخوانەو ئەوانی دیکە لە ڕێبازی ئیخوان لایانداوە، بۆ نموونە چەند کەسێك ڕوبانکردبووە پەیامەکانی نوورو پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە گرنگیدان بە بابەتە ئیمانییەکانو پاکردنەوەی دەروون، ناوەڕۆکی کاری ئیخوانەو برەویان بەو بیرە دەدا.

هەندێکی دیکە، ڕوبانکردبووە خۆ ڕۆشنبیرکردنو پێیان وابوو ئەوە کاری ئیخوانە لەو قۆناغەدا، ئەوەی جێی تێڕامانە، هەندێ جار ئەو گروپانە یەکتریان بەلادان لە ڕێبازی ئیخوان تۆمەتبار دەکرد، دەرەنجامی ئەو کارەش کەوتنەوەی شپرزەییو پەرتەوازەیی بوو لە ڕیزەکانی ڕەوتی ئیسلامیی.

لە سەرەتادا مامۆستایەك چەند قوتابی هەبوو وانەی پێدەوتن‌و جۆرێك لە بیرکردنەوەی بۆ دروستدەکردن، ئەمانە پێکەوە بە شێوەی گروپێکی بچووك دەکەوتنە کارکردن، دەرەنجامی تێکەڵبوونیان بەیەکترو خۆ دروورگرتنیان لە گروپەکانی دیکە جۆرێك لە کارو بیرکردنەوە بەسەریاندا زاڵ دەبوو، بەمەش ئەو گروپە دەبووە میحوەرێك‌و سەربەخۆ کاری دەکرد، زۆر جاریش لە شارو شارۆچکەکاندا زیاتر لە میحوەرێك جموجۆڵ‌و چالاکی هەبوو، بۆ نموونە لە هەڵەبجە چەند میحوەرێك دروستبوو، هەریەکەیان بەشێوەی سەربەخۆ کاری دەکرد.

دوای گۆڕانی کاری ئەو گروپانە بۆ میحوەر، جۆری پەیوەندی میحوەرەکان بە یەکترەوە ناکۆکی بەخۆوە دەبینی، زۆر جار هۆکاری ناوچەیی‌و بنەماڵەیی‌و دەروونیی تێکەڵ بە ناکۆکییەکان دەبوون، لە هەولێر ململانێی نێوان ئەو میحوەرانە بەشێوەیەك توندبوو، چەند میحوەرێك لەگەڵ یەك دەستەو یەخەبوون، بەڵام لە کۆبوونەوەیەکی سەرانی ڕەوتی ئیسلامیی ئەو گرژیە خاوبوویەوە[1]. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو میحوەرانە خۆیان بە ئیخوانی ڕاستەقینە دەزانی، تێکڕای میحوەرەکان دەکەوتنە بەردەم ڕەخنەی توندی ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان.

فرە میحوەری دەرگای بۆ چەندین شێوازی بیرکردنەوەو هاتنە ناوەوەی بیری نوێ واڵا کرد، لەو قۆناغەدا بیری جیهادی‌و چەکداری لە ناو ڕەوتی ئیسلامیی بە تەواوی چەکەرەی کرد، سەرهەڵدانی ئەو بیرە لە دوو ئاڕاستەوە بوو، یەکەمیان کۆمەڵێك کەسایەتیی‌و وتاربێژی ناو ڕەوتی ئیسلامیی لەناوچە جۆربەجۆرەکان باسیان لە پێویستی خەباتی چەکداریی دژی ڕژێمی بەعس دەکردو برەویان بەو بیرە دەدا، ئاراستەی دووەمیان گەیشتنی ئەدەبیات‌و بڵاوکراوەی کۆمەڵی جیهادیی میسری‌و گروپەکانی ترو وتارەکانی (عەبدولحەمید کوشك‌و عەبدوڵڵا عەززام)، ئەوانە بە ڕێژەیەکی کەم‌و بە شێوەیەکی نهێنی دەگەیشتنە هەولێرو لەناو هەندێ گەنجی ئەو

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٣٥.

شارەدا بڵاودەبوونەوە*، ئەوەش کاریگەری هەبوو لەسەر پەرەگرتن‌و دروستبوونی سەرتوێژێك لە بیری بەرەنگاربوونەوەی بەعس‌و دەستدانە کاری جیهادیی‌و چەکداریی[1].

خەسڵەتێکی دیکەی ڕەوتی ئیسلامیی لەو قۆناغەدا، هاتنە مەیدانی کتێب‌و بڵاوکراوەی ئیسلامیی بوو بە زمانی کوردی، ئەوەش لە هەشتاکاندا لەچاو چەند دەیەی پێشوو، گڕوتینێکی زیاتری تێکەوت، هەر چەندە پێشتر چەند نووسەرێك بە زمانی کوردی بەرهەمیان بڵاوکردبویەوە، بەڵام بڵاوکراوەی ئیسلامیی بەزمانی کوردی لە هەشتاکان بە ڕێژەیەکی بەرچاو پەرەیسەندو خوێنەری پەیدا کرد، هەڵبەتە لەو کاتەشدا زیاتر گرنگی بە بابەتی ڕۆحیی‌و ئیمانی دەدرا.

لەناو تەوژمی کتێب‌و بڵاوکراوەی ئیسلامیی، شێوازێکی نوێ لە نووسین سەریهەڵدا، بۆ یەکەمجار چەند نووسەرێك لە دەرگای بابەتە فکریەکانییان دا، دەربارەی بیری فرۆیدو مارکسییەت‌و داریونیزم بابەتیان دەنووسی، موحەممەد مەلا ساڵح شارەزووری لەم بوارەدا ڕچەشکێن بوو، دواتریش عەلی باپیر لەسەر هەمان بوار بابەتی دەنووسی‌و چەند نووسەرێکی دیکەش بابەتیان بڵاوکردەوە، لەو بڕوایەدام ئەوە سەرەتایەکی سادەیە بۆ بەزاندنی سنووری گوتاری ئامۆژگاری کە بەدرێژایی سەدەی بیست بۆتە ناسنامەی ڕەوتی ئیسلامیی باشووری کوردستان، دیارە هەر لەو سەرو بەندەدا ڕەوتی ئیخوان لەناو ئەندامەکانی خۆیدا توانیبوی ئەو بیرانە نابووت بکات، بەڵام ئەم کارە سنوری ڕێکخستنەکانی ئیخوانی نەبەزاندبوو.

خەسڵەتێکی ئەو قۆناغەی ڕەوتی ئیسلامیی شکاندنی ئەو بیرکردنەوە تەقلیدییە بوو، کە ئیخوان بە درێژایی کاری چەند ساڵەی لە ملی کاری ئیسلامیی ئاڵاندبوو، ئیخوان ئەو کارەی بە موڵکی خۆی دەزانی‌و کاری ئیسلامیی لە ژێر هەر ناوێکی دیکەدا بە ناجۆرو سەرکێشی دەزانی.

---

* لەو بڕوایەدام گەیشتنی ئەدەبیاتی کۆمەڵە ئیسلامییە جیهادییەکان، بە تایبەتیش کۆمەڵی جیهادیی میسری، کاریگەری هەبوو لەسەر دروستبوونی بیری پەرگیرو توندڕەو لەناو هەندێ گەنجی شاری هەولێرو شارەکانی تری باشووری کوردستان.

[1] فاتح كريكار: الحركة الإسلامية في كردستان العراق واقع وأمل، الجزء الأول، الطبعة الاولى، من اصدارات مكتب الإعلام الخارجي، ب. ش، ١٩٩٥، ل٣٨.

له کۆتایی حەفتاکانو سەرەتای هەشتاکان، چەند کەسایەتی لە ناوچە جۆربەجۆرەکان، لە دەرەوەی کاری ئیخوان جموجۆڵیان دەستپێکرد، ساڵی (١٩٧٨) بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی دامەزرا، هاوکات کۆمەڵێك وتاربێژو نووسەری ئیسلامیی دەرکەوتن، ئەو وتاربێژانە لە دوانگەی مزگەوتەکانەوە هۆشیارییەکی گشتییان دەدایە جەماوەرو بە وتاری هەستبزوێن کاریگەرییان کردە سەر گۆڕەپانەکە، هەر چەندە ئەو شێوازی کارکردنە مایەی ڕەزامەندی کادیرەکانی ئیخوان نەبوو، هەندێ جار بە بیانووی جۆراوجۆر ئاستەنگیان بۆ وتاربێژەکانیش دروستدەکردو تەنانەت تۆمەتی نابەجێیان دەدایە پاڵیان.

خەسڵەتێکی دیکەی کاری ئەو قۆناغە ئەوەبوو، کە ئەو کارە نوێیە لەناو چینی گەنجو خوێندکاراندا دەستی پێکرد، ئەوەش کاریگەری ڕاستەوخۆی کردە سەر ئایندەی ڕەوتی ئیسلامیی، لەو کاتەشدا کاری ئیسلامیی لە قۆناغی نهێنیدا بوو، ئەوەش وایکرد کارەکە لە سنورێکی بەرتەسکدا قەتیس بدرێت، ژمارەی قوتابییەکان کەم بوون، پەروەردەیەکی ئیمانیو فکری باش دەکران، وێڕای پێدانی ڕۆشنبیرییەکی گشتی، لەسەر خۆڕاگریو بەرخۆدان ڕادەهێنران، بەمەش توانرا نەوەیەك پێبگەیەنرێت، کە بتوانێت لە قۆناغەکانی دواتر سەرکردایەتی کارەکە بگرێتە دەست، بەکردەوەش ئەو نەوەیە لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو، ڕۆڵی بەرچاویان بینی لەو گەشەکردنە خێرایەی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان بەخۆیەوە بینی، لەو پەروەردە تۆکمەدا کادیرانی ئیخوان پشکی شێریان بەرکەوت، بە واتایەکی تر ئیخوان لەو بوارەدا بە ئەزمون بوونو گرنگی تەواویان بەو بوارەدەدا.

هەر لەو قۆناغەدا، ئەندامانی ڕەوتی ئیسلامیی لەسەر دژایەتی بەعسو ملنەدان بۆ خواستەکانی ئەو ڕژێمە گۆشدەکران، ئەندامانی ئەو ڕەوتە ئامادە نەبوون سەربازی بۆ ڕژێم بکەن، یاخود بەشداری سوپای میللی بکەن، بەڵکو کارێکی لەو شێوەیان بە نەشیاوو حەرام دەزانی، لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستە ژمارەیەك لە ئەندامانی ڕەوتی ئیسلامیی، خوێندنیان تەواو نەکردو بەرەو دەرەوەی عێراق بە تایبەتیش ئێران هەڵاتن، لەوێ لە ئۆردوگاکان کەوتنە جموجۆڵو چالاکی نواندن.

## باسی سێیەم: هۆکارەکانی سەرهەڵدانەوەی ڕەوتی ئیسلامیی

هەر دیاردەیەکی مێژوویی دەرەنجامی کۆمەڵێك هۆکارە، ئەو هۆکارانەش بریتین لە هۆکاری ئابووریی‌و ڕامیاریی‌و ئاینیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و دەروونیی‌و... هتد. هەندێك لەو هۆکارانە، یاخود پێکەوە بزوێنەری ڕەوتی مێژوون. زۆر جار ئەو هۆکارانە گڕوتین دەدەنە ئەو ڕوداوە مێژووییەو دەبنە پاڵپشتی پەرەسەندن‌و گەورەبوونی دیاردەکە، ئەمەش لەکاتێکدا کە دیاردەکە سەریهەڵداوەو لە برەودایە، یاخود قۆناغێك، یان چەند قۆناغێکی بڕیوەو بەشێوەیەکی بەربڵاوتر خۆی دەنوێنێت.

ڕەوتی ئیسلامیی لە ماوەی چارەکی کۆتایی سەدەی بیستدا، بە شێوەیەکی بەرفراوان نەك بە تەنیا لە کوردستان، بەڵکو لە تەواوی جیهاندا چالاکی‌و ئامادەیی هەبوو، تاوسەندنی دیاردەکە لەو هەلومەرجەدا جێگەی تێڕامان‌و توێژینەوەیە، بێگومان سەرهەڵدان‌و فراوان بوونی کاری ئەو ڕەوتە دەرەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری ناوخۆیی‌و دەرەکیی، یاخود خودی‌و بابەتییە. هەریەك لەو هۆکارانە کاریگەرییەکی ڕێژەییان لەسەر ئەو دیاردەیە هەیە، ئەوەشمان لەبەرچاو بێت کەڕەوتی ئیسلامیی ڕەگێکی قوڵی هەیەو دەیان ساڵە سەریهەڵداوە، هەر چەندە ئەو دیاردەیە لە سەرەتای حەفتاکاندا متبوو، بەڵام لە کۆتایی حەفتاکان‌و سەرەتای هەشتاکاندا بە شێوەیەکی بەرفراوانتر لە سەردەمی پێشخۆی دەردەکەوێت، ئەمەش دەخوازێت پرسیاری ئەوە بکرێت: بۆچی لەو کاتەدا ئەو ڕەوتە بەشێوەیەکی بەهێزتر لە جاران هاتە مەیدان؟ هەلومەرج‌و هۆکاری سەرهەڵدانەوەی ئەو ڕەوتە لەو قۆناغەدا چیبوو؟، بێگومان ئەمەش دەرەنجامی هۆکارگەلێکەو لێرەدا دەخوازین لێی بدوێین، هەندێك لەو هۆکارانەش کە ئێمە لێی دەدوێین دەگونجێت لە بنەڕەتدا هۆکاری سەرهەڵدانەوەی ڕەوتی ئیسلامیی نەبێت، بەڵام بۆتە هۆکاری بەهێزبوون‌و بەرفراوان بوونی چالاکی ڕەوتی ئیسلامیی. لەمەوە ئێمە دەخوازین باس لە هۆکاری سەرهەڵدانەوەی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان بکەین:

## یەکەم: هۆکارە ناوخۆییەکان

١ـ دەقە شەرعییەکان، ڕەوتی ئیسلامیی بەر لە هەر شتێك شەرعییەتی خۆی لە دەقە شەرعییەکانی قورئان و سوننەتەوە وەردەگرێت، بوونی کۆمەڵێك دەق لە قورئان و سوننەتدا، کە باس لە دەسەڵاتی ئیسلامیی و چەسپاندنی شەریعەت و خیلافەتیی ئیسلامیی دەکات، لەسەر موسڵمانانی پێویست کردووە کار بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێك بکەن تێیدا یاساکانی شەریعەت پیادەبکەن، لەلایەکی دیکەوە بوونی چەند دەقی ترکە باس لە بەرەنگاربوونەوەی ستەم و چەسپاندنی دادپەروەری دەکات. تێکڕای ئەو دەقانە لە دەمێکدا کە ستەمی بەعس گەیشتوەتە لوتکەو بەرەنگاربوونەوەی بە واجب دەزانرا، دەبوو بخرێنە چوارچێوەی کارپێکردنەوە، ئەمەش واتای بەرەنگاربوونەوەی بەعس دەگەیەنێت، بێگومان ئەم کارەش، واتە: بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی و بەرەنگاربوونەوەی ستەمی بەعس، بە تاکە کەس ناکرێت و پێویستی بەکاری کۆمەڵی و دەستەجەمعی هەیە. ئەمەش دروستکردنی پارت و ڕێکخراوی دەسەلماندو بووە هاندەرێکی سەرەکی کاری چەکداری دژی ڕژێمی بەعس.

٢ـ بوونی ڕیشەو پاشخانی بیری ئیخوان لە باشووری کوردستاندا، ئەمەش لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو هاتە باشووری کوردستان، ئەم بیرە هەر لە سەرەتاوە، لەوەدا سەرکەوتو بوو، توانیبووی لەناو دوو توێژدا جێی خۆی بکاتەوە، توێژی یەکەمیان لەناو کۆمەڵێك بنەماڵەی ناودارو خاوەن پێگەی ئایینی و کۆمەڵایەتیی، بەتایبەتی لە هەولێرو هەڵەبجە، توێژی دووەمیان کۆمەڵێك لاوی تازە پێگەیشتوی خوێندەواری ناو پەیمانگاو زانکۆکان[1]، ئەم توێژەش بەزۆری لەناو کەرکووکدا بوو، دوای ئەمانیش ژمارەیەکی دیکە لە زۆربەی شارو شارۆچکەکان لە دەوری کاری ئیخوان کۆبوونەوە.

بە درێژایی ساڵانی پەنجاو شەستەکان، ئەو کەسانە لەسەر کاری پەروەردەیی و ڕێکخراوەیی گۆشکرابوون، تا ساڵی (١٩٧١) کاری ئیخوان بە فەرمی وەستا، ئەوان لە بواری کاری ڕێکخراوەییدا خاوەن ئەزموون بوون، ئەمەش کاریگەرییەکی وای لەسەر

---

[1] ئەرسەلان تۆفیق محەمەد: هەمان سەرچاوە ل١٢.

ئەو کەسایەتییانە جێهێشتبوو، کە لە بارودۆخی گونجاودا بگەڕێنەوە سەر کاری ڕێکخراوەیی، هەر بۆیە لە سەرەتای هەشتاکاندا، ژمارەیەك لەو ئەندامە دێرینانەی ئیخوان بارودۆخەکە بە گونجاو دەزانن‌و دەکەونەوە کار.

لە ساڵی (١٩٨٥)و دواتریش، زۆربەی ئەو ئەندامانەی تا ئەو کاتە کاری ڕێکخراوەییان بە یاساغ دەزانی، کاتێك لەوە ئاگادار دەکرێن، کە سەرکردایەتی ئیخوان بڕیاری دەستپێکردنەوەی کاری داوە، پەیوەندی بە ڕێکخستنی نوێی ئیخوانەوە دەکەن.

٣- لە کۆتایی حەفتاکان‌و سەرەتای هەشتاکاندا، کۆمەڵێك وتاربێژو نووسەری ئیسلامیی[*] لە سلێمانی‌و هەولێرو شارەزوورو ڕانیە، ڕۆڵییان لە برەودان بە ڕەوتی ئیسلامیی بینی، بە وتارو نووسراوی هەست بزوێن، کاریگەرییان لەسەر گۆڕەپانەکە هەبوو، لەو ڕێگەوە توانییان جەماوەر لە دەوری ڕەوتی ئیسلامیی گرد بکەنەوە[1].

٤- توندڕەوی پارتە عەلمانی‌و چەپەکانی کوردستان بەرامبەر پیرۆزییە ئایینی‌و کەسایەتییە ئیسلامییەکان[2]، هەر لە دەیەی چلەکانەوە، بیری چەپ کاریگەری لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی کوردستان هەبوو، لە دەیەی حەوتەم‌و هەشتەمی سەدەی بیست ئەو کاریگەرییە بەشێوەیەك زیادیکرد، هەرکەس هەڵگری ئەو بیرە نەبوایە، بە

---

[*] گرنگترین ئەو وتاربێژو نووسەرانە بریتیبوون لە: شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، مەلا موحەممەد شارەزوری، شێخ موحەممەد بەرزنجی، مەلا ئەحمەدی خانەقا، مەلا عەلی بیارە، ئەحمەد کاکە مەحمود، حەسەن پێنجوێنی، عەلی باپیر، موحسین جوامێر،...هتد.

[1] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٤٨.

[2] ساڵی (١٩٨٢) کۆمەڵێك پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دەچنە یەکێك لە گوندەکانی شارباژێر، کاتی نیوەڕۆ دەبێت‌و دەچنە مزگەوتی گوندەکەو دەخەون، گوندنشینێك دێتە مزگەوت‌و سەلام دەکات، کەسێکی دیکە دێت‌و سەلام دەکات، کەسی سێهەم دێت‌و بەهەمان شێوە سەلام دەکات، زۆری سەلامکردن بەرپرسی پێشمەرگەکان تووڕە دەکات، بە تووڕەییەوەو بەدەم جوێندانەوە هەڵدەستێت‌و دەمانچەکەی دەردێنێت‌و دەڵێت: " هەر کەس بڵێت سەلاموعەلەیك دەیکوژم"، لەو کاتەدا کەسێك لە مزگەوتەکەدا نوێژ دەکات‌و کاتێك بەلای ڕاست‌و چەپدا، سەلام دەداتەوە لە ترساندا لە جیاتی وتنی ئەسەلاموعەلەیکوم دەڵێت: " مەرحەبا، مەرحەبا". فاتح کریکار: هەمان سەرچاوە، ل٢٩.

کۆنەپەرست لەقەڵەم دەدرا، لەناو هەڵگرانی بیری چەپ، ڕەوتێکی توندڕەو هەبوو، بڕوای وابوو ئیسلام پشکی گەورەی لە نەهامەتییەکانی کورد بەردەکەوێت، هەر بۆیە داوایان دەکرد قورئانەکان بەرەو عەرەبستان بنێردرێنەوە، دەبوو قورئانەکانیش بە حوشتر بگوێزرێنەوە نەبادا گوێدرێژی کورد ماندووبێت [1].

ساڵی (١٩٨٣) لە سلێمانی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی تەقەیان لە (مەلا ئەحمەدی خانەقا) کردو برینداریان کرد، ناوبراو یەکێك بوو لە ڕووە دیارەکانی ئەو دەمەی ڕەوتی ئیسلامیی، ئەو کارەش لە تۆڵەی ئەو ڕەخنەدابوو، کە مەلا ئەحمەد لە وتاری هەینیدا لە یەکێتیی گرتبوو، هەڵبەتە ناوبراو زۆرجار لە وتارەکانیدا ڕەخنەی لە حزبی بەعس دەگرت. هەروەها لە (١٩٨٤/٦/٢٠) پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی هەڵسان بە کوشتنی (مەلا عومەر مستەفا تیماری)، کوشتنی مەلا عومەر نارەزایی زۆری لای ئیسلامییەکان دروستکرد، بە بۆنەی ئەو ڕوداوەوە لە (١٩٨٤/٦/٢٣) لە مزگەوتی گەورەی چوارقورنە کۆڕێکی ماتەمینیی ڕێکخرا، بۆ ئەو کۆڕە دەیان زانا لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی باشووری کوردستانەوە هاتبوون‌و وتاریان خوێندەوە، ژمارەیەك لە وتاربێژەکان خوازیاری کاری جیهادی‌و چەکداری بوون، ئەم حاڵەتە کاریگەریی گەورەی هەبوو لەسەر خرۆشاندن‌و جولاندنی هەستی ئامادەبووان بەرەو ڕێکخراوبوون‌و کاری چەکداری [2].

٥- دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول (١٩٧٥)، حکومەتی بەعس سیاسەتێکی دوژمنکاری توندوتیژی لە دژی کورد پەیڕەو کرد، گوندەکان ڕاگوێزران‌و کاولکران، دانیشتوانی شارو شارۆچکەکان سەرکوت دەکران، دوای هەڵگیرساندنی شەڕی عێراق - ئێران، ئەو سیاسەتە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر پەیڕەو دەکرا، ئەو حاڵەتەش بیری بەرەنگاربوونەوەی جۆش دەداو پاڵنەرێکی گەورە بوو بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی چەکداری دژی ئەو ڕژێمە [3].

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل١١.

[2] فاتح کریکار: هەمان سەرچاوە، ل٣٠.

[3] موجز عن الحركة الإسلامية في كردستان العراق، إعداد: مكتب دمشق الحركة الإسلامية، ب. ش، ١٩٩٨، ل٢١.

درێژەکێشانی شەڕی عێراق – ئێران، وێڕای ئەوەی بۆشایی لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا جێهێشت، ڕێگەشی بۆ سەرهەڵدانی چەندین پارتو گروپ خۆشکرد، ئەوانەی لە دەستی حکومەتی عێراق هەڵدەهاتن، لە تاراوگە خڕدەبوونەوەو بیریان لە دروستکردنی پارتی سیاسیی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕژێم دەکردەوە، ئەوەش دەرەنجامی شەڕی تاقەتپڕوکێنی عێراق – ئێران بوو. ڕەوتی ئیسلامیش سوودی لەو دەرفەتە وەرگرتو چەند ڕێکخراوێکی سیاسیی چەکداری دروستکرد.

## دووەم: هۆکارە دەرەکییەکان

١- سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران لە (١٩٧٩)، کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر پەرەسەندنی ڕەوتی ئیسلامیی لە جیهاندا هەبوو، کوردستانیش سنورێکی درێژی لەگەڵ ئەو دەوڵەتەدا هەیە، ئەمەش وای کرد ئەو شۆڕشە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەری هەبێت[١]، هەلگرانی ئایدۆلۆژیای ئیسلامیی کەوتنە چالاکی نواندن، پێیان وابوو ئێران دەبێتە نموونەی دەوڵەتێکی ئیسلامیی، تێیدا دادی کۆمەلایەتی بەرقەرار دەبێت، ئەمەش دەگونجێت چاوی لێبکرێتو هەولبدرێت هەمان ئەزموون لە وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامیی دووبارە بکرێتەوە.

٢- سەرهەڵدانی جیهادی ئەفغانستان دژ بە هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، لە تەواوی جیهانی ئیسلامیی ببووە نموونەی بەرخۆدانو قوربانیدان لە پێناو ئایینو نیشتماندا بەرامبەر زلهێزێکی ئەوسای جیهان[٢]. لە تەواوی جیهانی ئیسلامییەوە، کۆمەكو هاوکاری ئەفغانستان دەکرا، ئەوانەی لە نزیکەوە، یاخود لە ڕێگەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە ئاشنای جیهادی ئەو گەلە دەبوون، خوازیاری دووبارەکردنەوەو گرتنەبەری هەمان شێوازی چەکداری گەلی ئەفغانی بوون بەرامبەر دەوڵەتە ستەمکارەکان. ئیسلامییەکانی کوردستانیش لەم کاریگەرییە بێبەش نەبوونو خوازیاری پیادەکردنی هەمان شێوازی بەرەنگاربونەوە بوون.

---

[١] هادی علی: یەککگرتووی ئیسلامیی کوردستان، ب. ش، ٢٠٠٤ز، ل٥؛ مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٤٩.

[٢] هادی علی: هەمان سەرچاوە، ل٥؛ مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٥٠.

٣ـ لە حەفتاكانى سەدەى ڕابردوو، نووسينى ژمارەيەك بيرمەندى ئيسلاميى وەكو سەيد قوتبو ئەبو ئەعلاى مەودودى، بە زۆربەى جيهانى ئيسلاميدا بڵاوبونەوە، ئەو بيرمەندانە بيرى بەرەنگاربوونەوەى حكومەتە ديكتاتۆرەكانى جيهانى ئيسلاميان برەوپێدەدا[1]، ئەو نووسەرانە لە نووسينەكانياندا، جيهاديان كردبووە سمبولى خەباتو كارى ڕەوتى ئيسلاميى، بەشێكى گەورەى ڕەوتى ئيسلاميى ئەو كاتە كەوتە ژێر كاريگەرى ئەو بيرەو گروپى چەكدارييان دروستكرد، ئەدەبياتى ئەو نووسەرانەش دەگەيشتنە كوردستانو تاڕادەيەك كاريگەرييان لەسەر هەڵسوڕێنەرانى ڕەوتى ئيسلاميىو كۆمەڵێك گەنج هەبوو[2].

---

[1] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٤٨.

[2] سەرچاوەى پێشوو، ل٤٨.

# بەشی سێیەم:

# ڕەوتی ئیخوان موسلمین

# ١٩٧٩ - ١٩٩١

## باسی یەکەم: هێڵی سدیق عەبدولعەزیز

### یەکەم: دروستبوونی

سەرەتای دەستبەکاربوونی ئەم هێڵە بۆ ساڵی (١٩٧٩) دەگەڕێتەوە، بە یەکەم ڕێکخستنی ئیخوان لە باشووری کوردستان دادەنرێت، لە دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیخوان لە ساڵی (١٩٧١)دا بە شێوەیەکی ڕێکخراو دەستی بەکار کردبێت، سدیق عەبدولعەزیز بناغەدانەری ئەم کارەیە[١]، ناوبراو یەکێکە لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان، بە گوتەی خۆیو سوبحی داودی، ئەندامی یەکەم شانەی ڕێکخستنی ئیخوانە لە هەڵەبجەدا[٢]، بە هۆی ئەوەی ناوبراو عەقڵیەتێکی ڕامیارییو ڕێکخراوەیی هەبوو، لەگەڵ زۆرێك لە سەرکردەکانی ئیخوان ناکۆکی بۆ دروست ببوو[٣]. دەستپێکردنی ئەم کارەش، دوای هەشت ساڵ لە وەستاندنی کاری ئیخوان لە عێراق، مایەی سەرنجو تێڕامانی ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان بوو، ئەوان ئەو کارەیان بە یاساغ دەزانی، بۆیە هەر لەگەڵ هەستکردنیان بە جموجۆڵی سدیق عەبدولعەزیز، کەوتنە دژایەتیکردنیو ساردکردنەوەی خەڵك لێییو دروستکردنی تەنگو چەڵەمە بۆی[٤].

سەرەتای کاری ئەم هێڵە لە هەڵەبجەوە دەستی پێکرد، پێدەچێت وێڕای ئەو هۆکارانەی لە بەشی پێشوودا، ئاماژەمان پێیاندا، دوورە دەستی هەڵەبجە لە سەنتەرەوە، ڕێگە خۆشکەر بووبێت بۆ جوڵەیەکی لەو شێوە، لە کاتێکدا، بۆ ماوەی هەشت ساڵ دەچوو، ڕێکخستنی ئیخوان وەستابوو، حکومەتی عێراق زیاتر چاودێری توندوتۆڵی خستبووە سەر شار گەورەکان، پێشبینی ئەوەی نەدەکرد لە شارۆچکەیەکی وەکو هەڵەبجەوە کاری ئیخوان سەرهەڵبداتەوە، بەڵام بوونی قوتابخانەو پەیمانگای ئیسلامییو حوجرەکان لە هەڵەبجەو دەوروبەری، هاوکات بوونی ڕیشەیەکی قوڵی

---

[١] حەکیم مەلا ساڵح: هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر ٢٠٠٤، ل٢٤٦؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( سوبحی داودی)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٩.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی ٢٠٠٥/١/٨.

تەریقەتەکانو دەیان مەلاو فەقێو مورید، لەگەڵ بوونی ڕیشەیەکی ئیخوانی، کارێکی لەو شێوەی ئاسان دەکرد. هەڵبەتە ئەمەش بەو مانایە نییە، کە حکومەتی بەعس هیچ چاودێرییەکی نەبووە، یاخود ئەگەر هەستی بە بوونی کاری ڕێکخراوەیی بکردایە بێدەنگ دەبوو*، بەڵکو بوونی هەر جوڵەیەکی ڕێکخراوەیی لە ژێر هەر ناوێکدا لە سایەی ڕژێمی بەعسدا، هەڵسوڕێنەرانی ڕووبەڕووی سزای مەرگ، یان توند دەکردەوە.

یەکەم شانەی ئەم ڕێکخستنە بریتیبوو لە: ( مەلا ئەحمەد شافعی، نازم عەبدوڵڵا، مەلا فەرەیدون)، دواتریش (موحەممەد ڕەئوف، ئومێد پارەزانی، مەولود باوەموراد) هاتنە پاڵ یەکەم شانەی ڕێکخستنو لەلایەن خودی سدیق عەبدولعەزیزەوە سەرپەرشتی دەکران[1].

ئەمانە کۆمەڵێ گەنج بوون، بوونە بەردی بناغەی ئەم باڵە، دیارە دژایەتی ئیخوانە دێرینەکان هێندە توند بووە، بۆیە کەسیان ئامادە نەبوون بێنە ناو ئەم ڕێکخستنەوە، ئەمەش وای لە سدیق عەبدولعەزیز کردووە، کە ئەم گەنجانە بکاتە جێداری ئەوان. ئەمەش هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵێ گرفتی بۆ دروستکردوون، لەسەروی هەموویانەوە کەم ئەزموونی ئەم گەنجانەیە لە کاری ڕێکخراوەیدا، بەڵام دواتر ئەم گەنجانە بوونەتە بناغەیەکی پتەوی کارەکە.

لێرەوە، ئەم باڵە ڕووبەڕووی دوو گرفتی گەورە بۆوە، لەلایەکەوە، بە مەبەستی خۆپاراستن لە دەزگا سیخوڕیەکانی بەعس، پێویست بوو ئەوپەڕی نهێنی لە کارەکانیاندا پەیڕەو بکەن، لەلایەکی ترەوە، بەرەنگاربوونەوەی هەڵوێستی ڕەقو

---

* بە پێی دوو نوسراوی بەڕێوەبەرێتی ئەمنی سلێمانی لە (١٩٧٩/٤/٥، ١٩٧٩/٩/٦) کە وێنەیەکی بۆ سەرجەم معاونیەتەکان نێردراوە داوا دەکات راپۆرتی مانگانە دەربارەی چالاکی هەریەك لەو گروپانە ئامادەبکەن کە ناویان هاتووە، هەروەها داوا دەکات کە سانی سەر بە پارتە ئایینییەکان ماوە ماوە بگرنو ئازادیان بکەن، تا وا گومان بەرن کە چاودێری چالاکییەکانیان دەکرێت. بڕوانە بەلگەنامەکانی ژمارە (٤٠، ٤١).

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی ٢٠٠٥/١/٨. بەڵام بە گوتەی موحەممەد ڕەئوف، سەرەتا یەکەم شانە پێکهاتبوو لە (نازم عەبدوڵڵا، مەلا ئەحمەد شافعی، موحەممەد ڕەئوف) پاشانیش (مەولود باوەموراد) هاتە ناو شانەکەوە. چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

چاودێری توندی ئیخوانە دێرینەکان، کە کاری ڕێکخراوەییان بە مەترسیدار دەزانی‌و بەردەوام بە بیانوی نەبوونی ڕەسمییەت، ئاستەنگیان بۆ هەرکەسێك دروست دەکرد، بەو ناوەوە کاری بکردایە[1].

ئیخوانە دێرینەکان، لە سەرەتادا کاری ئەم باڵەیان بە کەفوکوڵ‌و هەڵچوونێکی دەروونیی کاتی دەزانی، بەڵام زیادبوونی جموجۆڵی ئەم باڵەو بەرفراوانبوونی کارەکەیان، پێویستی بەرەنگاربوونەوەی ئەم باڵەی لای ئیخوانە دێرینەکان چەسپاند، کەوتنە ململانێ‌و دژایەتیکردن‌و ئاستەنگ دروستکردن بۆ کاری ئەم باڵەو سارکردنەوەی ئەندامانیان لە کارکردن، تەنانەت هەندێ جار لەوەش تێیاندەپەڕاندو دەکەوتنە تانەو تەشەردان لە خودی سدیق عەبدولعەزیزو بە شیاوی ئەو کارەیان نەدەزانی[2]. ئەم هەڵوێستەی ئیخوانە دێرینەکان چەند دەرەنجامێکی لێکەوتەوە:

١- ئەو ململانێیە تاڕادەیەك بووە ڕێگر لە گەورەبوون‌و پەلهاویشتن‌و بڵاوبوونەوەی کاری ئەو باڵە لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا.

٢- چەند کەسێ لەو ململانێیەدا، نەیانتوانی خۆیان ڕاگرن‌و، وازیان لە کاری ئیسلامیی هێنا.

٣- متمانەی هەردولا بە یەکتر کزبوو، لێکترازان‌و پەرتبوونی زیاتر کەوتە نێوانیان.

٤- ئەم باڵە بۆ بەرگریکردن لە سەلماندنی بوونی مافی کارکردن‌و بەرپەرچدانەوەی تۆمەتەکانی بەرامبەر، وزەو توانایەکی زۆری بەفیڕۆدا[3].

## دووەم: کارو چالاکی ڕێکخراوەیی‌و پەروەردەیی

ئەم کۆمەڵە هەر لە سەرەتای دەست بەکاربوونییەوە لە چەند گەڕەکێکی هەڵەبجە کەوتنە چالاکی ڕێکخراوەیی، بەڵام چالاکییەکانیان تا ماوەی دوو ساڵ لە سنورێکی بەرتەسکدا بەڕێوە دەچوو، لە سەرەتای هەشتاکاندا بە سێ ئاراستە سنوری کارو چالاکیان فراوان بوو، ئەمەش بە گۆڕانێکی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی ئەو باڵەدا،

---

[1] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل١٥.

[2] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل١٤.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل١٤ - ١٥.

ئاراستەی یەکەمیان بریتی بوو لە هەوڵدان بۆ دروستکردنی ڕێکخستن لە ناو شاری سلێمانی، بۆ ئەو مەبەستەش (نازم عەبدوڵلا) دیاری دەکرێت، ناوبراو بە گەیشتنی بە سلێمانی لە ساڵی (١٩٨١) چالاکانە دەکەوێتە کار، چەند ئەڵقەیەکی ڕێکخستن دروستدەکات[١]، یەکەم ئەڵقەی ڕێکخستن لە (فەرحان عومەر، ئیسماعیل فەتحوڵلا، عەبدوللەتیف فەتحوڵلا، عەبدوڕڕەحمان غەفوور) پێکهات، دواتریش ئەڵقەی دووەم لە پەیمانگای ئیسلامیی سلێمانی دانرا[٢]. کاری ئەم باڵە لە سلێمانی، بەشێوەیەکی بەرفراوان گەشەی کرد، لە نێوان ساڵانی (١٩٨٣ ـ ١٩٨٥) توانییان وانەی گشتی لە زیاتر لە (٣٠) مزگەوت دابنێن[٣].

ساڵی (١٩٨٢) هەریەکە لە (موحەممەد ڕەئوف) لە زانکۆی بەغدادو (مەولود باوەموراد) لە زانکۆی موسڵ بوونە خوێندکار، ئەم دوانەش لەو دوو شارە لەناو خوێندکاراندا دەکەونە کار، چەند شانەی ڕێکخستن بنیاد دەنێن[٤].

لە زانکۆکاندا، خوێندکاری زۆربەی شارەکانی کوردستان بوونیان هەبوو، ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی کاری ئیخوان لەسەر دەستی ئەوان بگاتە ئەو شارانە[٥]، خوێندکاران توێژێکی ڕۆشنبیرو چالاك بوون، ئەمەش وای کرد بەزوویی کاری ئەم باڵە فراوان بێتو بگاتە زۆربەی شارەکان، ئەوانەش کە دەبوونە ئەندام بە زۆری لە چینی گەنجو خوێندکار بوون.

تا ساڵی (١٩٨٣) کار گەیشتبووە هەولێر، لە ساڵی (١٩٨٤) دا بە هۆی (خەلیل ئیبراهیم) کە خوێندکاری کۆلێجی شەریعە بوو لە بەغدادو بووە ئەندامی ئەم باڵە، توانرا ڕێکخستن بگەیەنرێتە دهۆك، ناوبراو ئەندامێکی چالاکی ئەم باڵە بوو[٦]، ئەوەی زیاتر ڕێگەی خۆشکرد بۆ بڵاوبوونەوەی کار لەو دەڤەرەدا، نەبوونی ململانێی نێوان باڵەکانی

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٦/١٢/٢٠٠٤.

[٢] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل١٦.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٦/١٢/٢٠٠٤.

[٥] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل١٦.

[٦] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل١٦.

ئیخوان بوو، بە پێچەوانەی هەڵەبجە کە ئیخوانە دێرینەکان دژایەتی هەر کارێکی نوێیان دەکرد، لە دهۆك دا ململانێی لەو شێوە بوونی نەبوو.

شێوازی ڕێکخستن لە سەرەتاوە وێڕای جەختکردنەوەی زۆر لەسەر نهێنی پارێزی، شانەکان لە یەك ئەندام پێکدەهاتو شێوازی پەیوەندی تاکی پەیڕەو دەکرا، واتە ئەندام تەنها دوو کەسی دەناسی، کەسێك لەسەرو خۆیو ئەوی دیکە لەخوار خۆی، ئەمەش زیاتر لەبەر خۆپاراستن بوو لە سیخوڕەکانی بەعس، بەڵام دواتر لەگەڵ گەورەبوونی کارەکەدا، شانەی ڕێکخستن لە (٣- ٥) کەس پێکدەهات کە بە خێزان (اسرة) ناودەبرا، پلەکانی ڕێکخستنیش بریتی بوون لە ( المصاحب، النصیر، العامل، النقیب، المجاهد، النائب) کاتێك ئەندام دەگەیشتە پلەی ( العامل) پەیمانو وەعدی لێوەردەگیرا[١].

واتە: ئەندامێك بۆ ئەوەی متمانەی پێبکرێت، دەبوو دوو پلەی ڕێکخستن ببڕێتو پاشان پەیمانی کارکردنی لێوەربگیرێت، ئەمەش ئامازەیە بۆ نهێنی پارێزی ڕێکخستن، تا پارێزگاری لە خۆیو کارەکانی بکات. ئەمەش هەمان شێوازە کە ئیخوان لە پەروەردەکردنی ئەندامەکانیدا پەیڕەوی لێدەکات. کاری ئیخوان لە قۆناغی یەکەمدا، کۆمەڵێك ئەندام پەروەردە دەکاتو پێیان دەگەیەنێتو بۆ قۆناغەکانی دواتری کار ئامادەیان دەکات.

ڕێکخستن لەم قۆناغەدا لەسەر بنەمای هەڵبژاردن (انتقاء) بوو، کەسێك دیاری دەکراو چاودێری ورد دەکراو هەڵدەسەنگێنرا، پاشان پەیوەندی پێوە دەکراو لەسەر ئەدەبیاتی ئیخوان پەروەردە دەکرا[٢]، باشترین جێگەش بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسە، قوتابخانەو حوجرەو زانکۆو پەیمانگاکان بوو. ئەو کەسە دەبوو تەواوی ئەو قۆناغە پەروەردەییانە ببڕێت، کە پێشتر ئامازەیان پێدرا.

پەروەردەکردنی تاك، پێگەیەکی گرنگی لە ئەدەبیاتی ئەم باڵەو سەرجەم کاری ئیخواندا هەبوو، دەبوو پەروەردەیەکی توندوتۆڵ بکرایە، بۆ ئەو مەبەستەش، بە پلەی

---

[١] سەرچاوەی پێشوو، ل١٩ ـ ٢٠.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

یەکەم سوود لە وانەی تایبەتی وەردەگیرا، لە پاڵ ئەمەشدا، بۆنە ئاینییەکانی وەکو ڕەمەزان‌و یادی لە دایك بوونی پێغەمبەر(د.خ)، دەقۆسترانەوەو وتاری تیادەدراو وانە گشتییەکانی مزگەوتیش ببوونە کەناڵێکی دیکەی کار[1].

ساڵی (١٩٨٣) بە ئومێدی گەشەپێدانی کار، چەندین لیژنەی تایبەتی‌و جۆراوجۆر دامەزرا، لەوانە لیژنەی قوتابیان، لەناو قوتابخانەو زانکۆکان، ئەم لیژنەیە لە بەغدادو موسڵ‌و سلێمانی‌و هەڵەبجە چالاکی دەنواند، دوای ئەوەی کاری لیژنەی قوتابیان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لیژنەی مامۆستایانیش لە چەند ناوچەیەك پێکهێنراو پاشان لیژنەی گەڕەکەکان دامەزرێنرا. هەر چەندە لیژنەکان هەڕەمێکی ڕێکخستنی تێرو تەسەلیان نەبوو، بەڵام ڕۆڵی بەرچاویان لە گەشەسەندنی کاری ئەم باڵەدا بینی[2].

ساڵی (١٩٨٢) سەرەتای چالاکی ڕۆشنبیری ئەم باڵەیە، لەو ساڵەدا یەکەم ژمارەی بڵاوکراوەی (ڕۆشنبیری ئیسلامی)[*]یان بڵاوکردوە، دوای دەرکردنی پێنج ژمارە ناوەکەی گۆڕا بۆ (نیگا)[3]، ئەم گۆڤارە گرنگی دەدا بە بواری پەروەردەیی‌و ڕۆحی‌و پێگەیاندنی کادرو ئەندامانی نوێ لەسەر کاری بانگەوازو قوربانیدان، هەروەها لایەنی بیر لەو بوارانە بوو کە بڵاوکراوەکە گرنگی پێدەدا[4].

بڵاوکراوەکە چەند نوسخەیەکی لەبەردا دەنوسرایەوەو زۆر بە نهێنی بەناو ڕێکخستندا بڵاودەکرایەوە، هەر چەندە ئەم بڵاوکراوەیە سادەو ساکار بوو، بەڵام وەکو سەلماندنی بوونی ئەم باڵە گرنگییەکی تایبەتی هەبوو، دەکرێت بە جۆرێك لە ڕاگەیاندن‌و پەیامی پەروەردەیی ناوخۆی ئەو باڵە ناوزەد بکرێت[5].

---

[1] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل١٧.

[2] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٢١.

[*] بۆچوونی ئەوەش هەیە ئەم بڵاوکراوەیە ناوی (ڕۆشنبیری) بووبێت. بڕوانە: هەژار حاتەم: ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق ١٩٨٢ ـ ١٩٩١، لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کۆمەڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٢٥.

[3] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٢١ ـ ٢٢.

[4] هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١٢٩.

[5] سەبارەت بە گرنگی‌و ناوەڕۆکی بڵاوکراوەکە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل ١٢٤ ـ ١٣٠.

ساڵی (١٩٨٣) لیژنەی ڕۆشنبیری دروستکرا، سەرەتا لیژنەکە پێکهاتبوو لە (ئیکرام کەریم، ئارام قادر، تۆفیق کەریم، عەبدوڕڕەزاق حامید، وەرزێر حەمەسەلیم)[1] دواتریش (کامیل عەبدوڵڵا، حەمەعەلی ڕەحیم) بەشداربوون[2]. لیژنەی ڕۆشنبیری، کەوتنە چالاکی نواندنو چەند کتێبو نامیلکەیان نووسیو وەریانگێڕایە سەر زمانی کوردی، پاش ئەوەی چەند نوسخەیان لەبەر دەنووسرایەوە، بە نهێنی بەناو ڕێکخستنندا بڵاودەکرانەوە[3].

لیژنەی ناوبراو، هەر سێ زنجیرەی (ناودارانی ئیسلام، هەڵکەوتوانی ئیسلام، دوژمنانی ئیسلام)ی بە نهێنی بڵاوکردەوە[4]. هەموو ئەمانە دەچوونە پاڵ سەرچاوە پەروەردەییەکانی تری ئەم باڵەو ئەندامەکانی خۆی لەسەر پەروەردە دەکرد.

## سێیەم: دیدو تێڕوانینو سەرچاوەی پەروەردەیی

کاتێك بمانەوێت قسە لەسەر دیدو تێڕوانینی ئەم باڵەی ئیخوان بکەین، تووشی گرفت دەبینو بەڵگەی ئەوتۆمان بەردەست ناکەوێت، هۆکاری سەرەکی ئەم حاڵەتەش دەگەڕێتە بۆ شێوازی کاری نهێنی ئەم باڵە، چونکە ئێمە باس لە قۆناغێك دەکەین، کە ئەم باڵە وەکو گروپێکی نهێنی کاری کردووەو ئاشکرا نەبووە، ئەوکاتە، لە قۆناغێکدا

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١.

[2] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٢٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

[4] ئەم زنجیرانە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٣ ـ ١٩٨٧) بڵاوکراونەتەوە، زنجیرەی ناودارانی ئیسلام، ژیانو بەسەرهاتی چەند کەسایەتیی لەخۆگرتوە، لەوانە (ئیمام شافعی، ئەحمەد کوڕی حەنبەل، سەعید نوورسی، موحەممەد عەبدە،... هتد)، هەروەها زنجیرەی هەڵکەوتوانی ئیسلام، تەرخانکرابوو بۆ خستنەڕووی ژیانو تێکۆشانی هەڵکەوتوانی ڕابوونی ئیسلامیو کەسایەتییە ئیسلامییە هاوچەرخەکان لەوانە (ئەحمەد کوڕی عیرفان، ئەبوئەعلای مەودودی، حەسەن بەننا، سەید قوتب،... هتد)، هەروەها زنجیرەی دوژمنانی ئیسلام، تایبەت بووە بە باسو لێدوان دەربارەی هەر فیکرو ئایدیاو جوڵانەوەیەك، کە دژی ئیسلامو موسڵمانان بوونو پلانو نەخشەیان بۆ داگیرکردنی جیهانی ئیسلامیی داڕشتبێت، لەوانە ( دەربارەی جولەکە، مژدەدەران، ڕۆژهەڵاتناسان،... هتد). هەندێ نامیلکەو کتێبیش وەرگێڕدرانە سەر زمانی کوردی، لەوانە (شەوانی تورکستان، بۆ گەنجەکان،... هتد) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو بڵاوکراوانە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل ١٣٠ ـ ١٣٦.

بوون زیاتر سەرقاڵی پەروەردەکردن و دروستکردنی ڕێکخستنێکی تۆکمە بوون، نەك کاری سیاسیی، بۆیە بە درێژایی تەمەنی ئەم باڵە، تا ساڵی (١٩٨٥)، تەنها یەك بەیاننامەی دەرکردووە کە تاڕادەیەك مەدلولێکی سیاسیی تیادەخوێندرێتەوە، ئەم بەیاننامە، لە ساڵی (١٩٨٣) دا دەرچوەو تێیدا هاتووە: "ڕێکخستنی نوێ درێژەپێدانی برایانە، لەم بارودۆخە ئاڵۆزەدا دەیەوێت دەستی گەلی کوردی تینو بگرێت بۆ سەر کانی زوڵاڵی ئیسلام، تا دەست بەکاربوونەوەی ڕێکخستنی گشتی، لەوکاتەدا ڕێکخستنی نوێ سەربازێکی گوێڕایەڵ دەبێت"[1]. ئەم بەیاننامە، جگە لە ئەندامانی ڕێکخستن، نیشانی ئەندامە دێرینەکانی ئیخوانیش درا[2].

لەم بەیاننامەدا، ئەوە دەخوێندرێتەوە، کە ئەم باڵە وێڕای ئەوەی خۆیان وەکو درێژەپێدەری ئیخوان ناساندووە، خۆیان بە بەشێك لە ئیخوانی عێراق زانیوە، هەر بۆیە لە کاتی دەست بەکاربوونەوەی ئیخوان لە عێراق، ئەم گروپە دەبێتە سەربازێکی گوێڕایەڵی ئەو ڕەوتە. پێدەچێت مەسەلەی نەبوونی ڕەسمییەتی کارکردن لەو کاتەدا، کە هەمیشە لەلایەن ئیخوانە دێرینەکانەوە جەختی لەسەر دەکرایەوەو ببوە چەکێك بۆ دژایەتیکردنی ئەم باڵە، هێندە کاریگەر بوبێت کە ئەم باڵەیان ناچارکردبێت بەیانێکی لەوشێوە دەربکەن، هەر بۆ هێورکردنەوەشیان ناچاربوون بەیاننامەکەیان نیشان بدەن، چونکە ئیخوانە دێرینەکان پێیان وابوو دەبێت چاوەڕێ بن، تا لە بەغداوە بڕیاری کارکردن دەدرێت، خۆ ئەگەر بڕیارێکی ناوەند(مرکز)ی لەو شێوە نەبێت، ئەوە نەك کارکردن، بەڵکو هیچ کەس مافی ئەوەی نییە بیر لەو مەسەلانە بکاتەوە[3].

سەبارەت بە سەرچاوەی پەروەردەیی ئەم باڵە، وەکو هەر ڕێکخستنێکی دیکەی ئیخوان، بەرهەم و نووسراوی بیریارانی ئیخوان پلەی یەکەم داگیر دەکات، نووسینەکانی (سەعید حەوا، فەتحی یەکن، سەید قوتب، مەودودی، حەسەن بەننا) برەوی باشیان هەبوو، کتێبی (ماذا یعني انتمائي للإسلام) لە نووسینی فەتحی یەکن، بە شێوەیەکی

---

[1] لە: هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٢١؛ نووسەرێکی نەزانراو، هەمان سەرچاوە، ل١٨.

[2] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل١٨.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

مەنهەجی نووسراوەو لە پێگەیاندنی عەقڵیەتی مەنهەجی ڕۆڵی بەرچاوی دەبینیو لە وانەکاندا دەوترایەوە[1]، لە سەرەتای کاردا گرنگی زۆر دەدرا بەو بابەتانەی، کە باس لە پاکردنەوەی دەروونو گەردنگیری بە ئیسلامەوە دەکەنو بە شێوەیەکی مەنهەجی نووسراون، لەو ڕووەوە بەرهەمەکانی گەیلانیو غەزالیو نوورسی دەخوێندران[2].

جارجارەش چەند دانەیەك لە گۆڤارەکانی (الدعوة، المجتمع، النذير، المسلمون) بە نهێنی دەگەیشتنە دەست ئەندامانی ڕێکخستنو دەستاودەستیان پێدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڤاری (التربية الإسلامية) تاکە نوسراوی عێراقی بوو ئەندامانی ڕەوتی ئیسلامیی لە باسەکانی سوودمەند دەبوون[3]. هەموو ئەمانە لە پاڵ ڕۆشنبیریەکی گشتی، لە ماوەی چەند ساڵێکدا ئەندامان وەریان دەگرتو لەسەری پەروەردە دەبوون.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەولود باوەموراد)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨.

[3] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٢٣.

## باسی دووەم: هێڵی سەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین

### یەکەم: دروستکردنی کۆمەڵی ئەنساری ئیسلامیی

یەکەم هەوڵی ئەم باڵە بۆ دەستپێکردنی کار، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٠)، لەسەروبەندی دەستپێکردنی جەنگی عێراق – ئێران دا لە کۆبوونەوەیەکدا لە هەڵەبجە کە ( سەلاحەددین موحەممەد، حەسەن شەمێرانی، ئیبراهیم ڕێشاوی، عەلی موحەممەد،...) تێیدا بەشدار بوون، بیرۆکەی دەستپێکردنەوەی کار گەڵاڵە کرا، بۆ ئەو مەبەستە، وەفدێك پێکهێنرا لە (سەلاحەددین موحەممەد، ئیبراهیم ڕێشاوی، عەلی موحەممەد، حەسەن شەمێرانی)و سەردانی شارەکانی کەرکوکو موسڵو هەولێرو سلێمانی کرد[1]، لەو سەردانانەدا، ژمارەیەك لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان بەسەرکرانەوەو بیروڕایان ئاڵوگۆڕ کرد، بەڵام هیچ ئاکامێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوە[2]. بیرۆکەی ئەم کۆبوونەوەیەش لەلایەن خودی سەلاحەددین موحەممەدەوە پێشنیاز کرابوو[3]. ناوبراو، یەکێکە لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوانو لە ساڵی (١٩٦٧) بۆتە ئەندامی ئیخوان[4].

دەستپێکردنی جەنگی عێراق - ئێران، ژمارەیەکی زۆر گەنجی ڕاپێچی بەرەکانی شەڕ کرد، زۆرێکیش هەڵاتن(فیرار) بەرەو گوندەکان، یاخود ئێران، سەلاحەددین موحەممەد، یەکێك بوو لەوانەی بەرەو ئێران هەڵات، لە ماوەی دوو ساڵی یەکەمی شەڕدا، ژمارەیەك لە ئەندامانی ئیخوان ئاوارەی ئێران ببوون، ژمارەیەکیان لە شارەکانو هەندێکیان لە ئۆردوگاکاندا نیشتەجێ بوون، لەوێ بە مەبەستی دەستپێکردنی کاری ڕێکخراوەیی جۆرێك لە پەیوەندیکردنیان بەیەکەوە دروستکرد[5].

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[2] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، ل٦.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[4] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل٥؛ لە یادی سێزدەهەمین ساڵڕۆژی وەفاتی خواناسی موجاهید مامۆستا علی محمد بهاالدین دا،، ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە (٧٢)، ١٩٩٥/١٢/٢٢.

[5] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل٦.

سەرەنجامی ئەم پەیوەندییانە بەوە گەیشت، کە مانگی (مایسی ١٩٨٢) نزیکەی (١٥ ـ ٢٠) کەس لە ئوتێلی (ئەلوەندرود) لە تاران کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا، لەناویاندا ( سەلاحەددین موحەممەد، شێخ عەبدوڕڕەحمان ئازادی ـ بەرزنجی، فاتح کرێکار، عەلی موحەممەد، حەسەن شەمێرانی، بورهان موحەممەد ئەمین، موحەممەد حەسەن، دارا، ئەبو حامید (عەرەب بوو)، ئەبو داود (عەرەب بوو)، راضی)[1]. سەبارەت بە هەمان کۆبوونەوە حەسەن شەمێرانی بەم شێوەیە ناوی بەشداران دێنێت (سەلاحەددین موحەممەد، شێخ عەبدوڕڕەحمان ئازادی، عەلی موحەمەد، حەسەن شەمێرانی، بورهان موحەممەد ئەمین، فاتح کرێکار، ئەبو یاسر، موحەممەد حەسەن، ئەبو حەمید)[2]. هەروەها فاتح کرێکار بەم شێوەیە ڕیزبەندی ناوی بەشداربوان دەکات: ( سەلاحەددین موحەممەد، شێخ عەبدوڕڕەحمان بەرزنجی، بورهان موحەممەد ئەمین، حەسەن شەمێرانی، موحەممەد حەسەن، ئەبویاسر ئەلبەیاتی ـ تورکمان، أ. ج ئەلباوی ـ عەرەب، فاتح کرێکار)[3]. بەڵام سەلاحەددین موحەممەد بەم شێوەیە ناوەکان ریزبەند دەکات: (شێخ عەبدوڕڕەحمان ئازادی، بورهان موحەممەد ئەمین، حەسەن شەمێرانی، سەلاحەددین موحەممەد، عومەر عەبدولعەزیز، عەلی موحەممەد، موحسین جوامێر، ئەحمەد حەسەن – ئەبو یاسر، فاتح کرێکار، موحەممەد حەسەن، موحەممەد ئەمین مەحمود، موحەممەد ئەمین ئیمامی)[4]. دوای وتووێژو ڕاگۆڕینەوە، لەسەر ئەوە پێکهاتن کە:

"١ـ پارتێك دروست بکرێت، بەکۆی دەنگ ناوی کۆمەڵی ئەنساری ئیسلامی (جماعة الأنصار الإسلامية) بۆ پارتەکە دیاری کرا.

٢ـ وەفدێك پێکبێت و سەردانی ئێرانییەکان بکات و پێیان ڕابگەیەنێت کە:

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (بورهان موحەممەد ئەمین) سلێمانی، ٢٠٠٥/٢/٦

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ئابراو، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[3] الحركة الإسلامية في كردستان العراق واقع وأمل، ل٤٦.

[4] نامەی (سەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین) بۆ توێژەر، ٢٠٠٩/٥/٩.

أ ـ ئێمە کاری ڕێکخراوەیی‌و پەروەردەیی دەکەین، دەبێت ئێران ڕێگەمان بدات پەیوەندی بەوکەسانەوە بکەین کەلەژێر دەستی بەعس هەڵدێن، یاخود لە ئۆردوگاکان دا نیشتەجێن.

ب ـ ڕێگەمان بدات دوو بارەگا لە پاوەو مەریوان بکەینەوە.

ج ـ ئێمە کۆمەڵێك ئەندامی ئیخوان موسلمینین‌و ئێستا بەو شێوە دژی بەعس کاردەکەین"[1].

بە گوتەی فاتح کرێکار، داواکارییەکانی کۆمەڵی ئەنسار لە حکومەتی ئێران بریتیبوون لە:

١ـ پێدانی چەکی پێویست.

٢ـ پشتیوانیکردنی سیاسیی‌و سەربازی‌و ڕاگەیاندن.

٣ـ دیاریکردنی بۆدجەی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی تا لەسەر پێی خۆی بوەستێ.

٤ـ کردنەوەی بارەگا لە تاران‌و شارە سنوورییەکان.

٥ـ دروستکردنی سەربازگەی مەشقکردن‌و سەرپەرشتیکردنی لەلایەن لیژنەی سەربازی کۆمەڵی ئەنسار.

٦ـ ڕێگە بدرێت بە هێنانە دەرەوەی هەر پەنابەرێك لە ئۆردوگاکانی پەنابەران کاتێك پەیوەندی بکات بە ڕیزەکانی تیپە چەکدارییەکانەوە.[2]

هەر لەوێدا، شێخ عەبدوڕڕەحمان ئازادی بە کەسی یەکەم‌و سەلاحەددین موحەممەد بە جێگری دەستنیشان کران، بەڵام پاش ماوەیەك سەلاحەددین موحەممەد کرایە بەرپرسی یەکەم[3]. وەفدێکیش کە پێکهاتبوو لە: (سەلاحەددین موحەممەد، بورهان موحەممەد ئەمین، عەلی موحەممەد) سەردانی جێگری سەرەك وەزیرانی ئێرانی کردو

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[2] الحركة الإسلامية في كردستان العراق واقع وأمل، ل٤٦.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

بە ئامادەبوونی (جەواد خالسی) خواستەکانیان خستەڕوو، ئەویش بەڵێنی پێدان داواکاریەکەیان بگەیەنێتە حکومەتەکەی[1].

ئەم کۆمەڵە پەیڕەوو پرۆگرامیان بۆ پارتەکەیان داناو لەناو ئاوارەکاندا کەوتنە کارکردن، ژمارەیەك گەنجیان لێ کۆبۆوە[2]، هەر لەو ماوەشدا گۆڤاری (ئەنسار) وەکو زمانحاڵی پارت دەرچوو[3].

هەر چەندە لە خواستەکانی ئەم پارتەدا ئەوە هاتووە کەسەر بە ئیخوان موسلمینن، بەڵام ئەو کارە ڕەزامەندی بەرپرسانی ئیخوانی لەسەر نەبوو، واتە کارێکی خودسەری بوو[4]. هەر چەندە سەلاحەددین موحەممەدو حەسەن شەمێرانی، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە کۆمەڵی ئەنسار کاری ڕێکخراوەیی‌و پەروەردەیی دەکردو ئامادەیی چەك هەڵگرتنیان نەبوو[5]، بەڵام بە گوتەی فاتح کرێکار[6] مەسەلەی چەکداری لە پێشینەی کاری کۆمەڵی ئەنسار بووە، هەر لەو ڕووەوە نووسەری (هاڵەکۆك) بۆچوونەکەی فاتح کرێکار پشت ڕاست دەکاتەوەو دەڵێت:"بنەماکانی (انصار) لە دوو خاڵی سەرەکیدا خۆی دەبینیەوە: بانگەشەی جیهاد، سەربەخۆیی لە برایان"[7]، هەروەها باس لەوە دەکات کە ئەم پارتە فاتح کرێکار دەستنیشان دەکات، تا لە ئۆردوگای خوڕەم ئاباد مەشقی سەربازی بە لاوەکان بکات[8].

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (بورهان موحەممەد ئەمین)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٢/٦.

[2] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل٦.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[4] وەلامێك بۆ ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی، گۆڤاری جەماوەر، ژمارە (٤٧)، ١ کانونی یەکەمی ١٩٩٥، ل٢٠.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦؛ نامەی (سەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین) بۆ توێژەر، ٢٠٠٩/٥/٩.

[6] بە گوتەی سەلاحەددین موحەممەد ئەوا فاتح کرێکار لە کۆتایی دانیشتنەکاندا هاتووەو بەشداری لەگەڵدا کردوون‌و هاوکاری کردون. نامەی (سەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین) بۆ توێژەر، ٢٠٠٩/٥/٩.

[7] هیوا، ل١٨.

[8] سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

ئەم پارتە ماوەی ساڵێك بەردەوام بوو، بەڵام ئێران بە بوون و نەبوون وەڵامی نەدانەوە، ئەمەش دامەزرێنەرانی هێنایە سەر ئەو ڕایەی، کە ئێران خواستەکانیان بەدی ناهێنێ، بۆیە باشتر وایە دەستبەرداری ئەم پارتە بن، لەم ڕووە سەلاحەددین موحەممەد باس لە کارو چالاکی و چارەنووسی پارتەکە دەکات و دەڵێت: "...ئیتر ئەو هەوڵ و کۆششە لە کۆکردنەوەی گەنجەکان لەخۆمان و بۆ ڕەسمی کردنی کارەکە بەردەوام بوو. بەڵام خاڵی دووەم (واتە ڕەسمی کردنی کارەکە) سەری نەگرت چونکە پەیوەندی بە هاوکاری برا شیعەکان و حکومەتی ئێرانەوە بوو، خاڵی یەکەم بەردەوام بوو، هەر بۆیەش ناوی (انصار) کاڵ بوەوەو چووینەوە سەر ناوەڕۆکەکەی خۆمان (برایان)"[1]. ئەم دەقە ئەو ڕاستییەی پێشوومان بەتەوای بۆ دەچەسپێنێت کە ئەو پارتە لە بنەڕەتدا سەر بەئیخوان نەبووە.

## دووەم: سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ڕێکخستنی ئیخوان

بە هەڵوەشاندنەوەی ئەنسار زۆربەی دامەزرێنەرانی پەرتەوازە بوون، بەڵام ئەوانەی مابوونەوە لەناو ئاوارەکاندا درێژەیان بەکارداو کەوتنە چالاکی و توانییان ژمارەیەکی زۆر گەنج لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە[2]، ئەمەش بووە سەرەتایەك بۆ فراوان بوونی چالاکی ئەو باڵە.

دوای دەرچوونی حەسەن شەمێرانی و عەلی موحەممەد لە ئۆردوگا، لە پاوە ژوورێك بە کرێ دەگرن، هەر لەو سەروبەندەشدا سەلاجەددین موحەممەد لە پاوە دەبێتە پێشنوێژی مزگەوتی بیلال، پاشان بورهان موحەممەدو چەندین کەسی تر ڕوودەکەنە ئەوێ، ئەوان لە پاوە بە دوو ئاراستە کەوتنە کارکردن، ئاراستەی یەکەمیان، پەیوەندییان کرد بەو کەسانەی لە عێراقەوە دەهاتن، یاخود لە ئۆردوگاکاندا نیشتەجێ بوون، ئاراستەی دووەم، لەناو خەڵکی پاوە کەوتنە جموجۆڵ و وانە بۆ کۆمەڵێك کەس دادەنێن، هەندێك لەوانە خوێندکاری ئامادەیی بوون[3].

---

[1] لە: باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل٦.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

دوای ئەوەی، ڕێکخستنێکی تا ڕادەیەك تۆکمە دروست دەکەن، بیر لەوە دەکەنەوە پەیوەندی بە ئیخوانەکانی باشووری کوردستانەوە بکەن، بەو هیوایەی کاری ڕێکخستنی تێدا بنیاد بنێن، بۆ ئەو مەبەستە (حەسەن شەمێرانی، عەلی موحەممەد) دیاری دەکرێن، ئەم دوو کەسە لە ساڵی (١٩٨٣) گەڕانەوە باشووری کوردستان[1].

کاتێك ئەم دوو کەسە گەڕانەوە، جگە لە باڵی سدیق عەبدولعەزیز، چەندین کەسایەتی لە ناوچەکانی هەڵەبجەو سەیدسادقو هەولێرو سلێمانی، بە شێوەی سەربەخۆ دەستیان بەکاری پەروەردەیی کردبوو، کاری ئەمانە زیاتر بە شێوەی گروپ گروپ بوو، هەر مامۆستایەك کۆمەڵێك قوتابی لەدەوری خۆی کۆکردبوویەوە وانەی پێدەوتن[2]. ژمارەیەك لەو مامۆستایانە پێشتر ئەندامی ئیخوان بوون، سەرچاوەی پەروەردەییان هەمان ئەدەبیاتی ئیخوان بوو. لەپاڵ ئەمانەشدا کۆمەڵێك کەسایەتی هەبوون، ئیخوان نەبوون، بەڵام ڕۆڵی بەرچاویان بینی لە بەرەو پێشبردنی ڕەوتی ئیسلامیی، تەنانەت هەندێك لەو کەسایەتییانەش بە توندی دژی ئیخوان دەوەستانەوە[3].

کاتێك (حەسەن شەمێرانیو عەلی موحەممەد) گەڕانەوە، پەیوەندییان کرد بە هەندێك لە مامۆستایانەوەو توانیان ژمارەیەکییان لە چوارچێوەی ڕێکخستنەکەی خۆیاندا کۆبکەنەوە، لەوانە (حەسەن پێنجوێنی) لە سلێمانی، (حەمەڕەشید ماوەتیو محەیدین گەلاڵی) لە سەید سادق، (ئیبراهیم ڕێشاوی) لە هەڵەبجە، (موحەممەد ئەحمەدو هیوا میرزا سابیر) لە زانکۆی موسڵ[4]. ئەو هەنگاوە گوڕێکی باشی بەو باڵە داو تاڕادەیەك بەرەو پێشچوونێکی کارەکانیان بوو. دواتر لە ساڵی (١٩٨٤) بورهان موحەممەد ئەمین دەگەڕێتەوەو ئەویش لەپاڵ ئەواندا دەکەوێتە چالاکی نواندن[5].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل١٧ ـ ١٨؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەولود باوە موراد)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨.

[3] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٢٠. لە بەشی دووەم بە درێژی باس لە کاری ئەو قۆناغە کراوە.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (بورهان موحەممەد ئەمین)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٢/٦.

بە گوتەی بورهان موحەممەد ئەمین، لەو ماوەیەدا سەلاحەددین موحەممەد، توانیبووی چەند ئەڵقەیەك بۆ پەیوەندی كردن لە نێوان باشوورو ڕۆژهەڵاتی كوردستان دروست بكات، بەمەش ئاگاداری كاری ڕێكخستنی باشووری كوردستان دەبوون[1]. تەنانەت خودی سەلاحەددین موحەممەد، لەو ماوەدا چەند جارێك بە نهێنی سەردانی باشووری كوردستان دەكاتو لە نزیكەوە چاودێری بەرەو پێشچوونی كارەكان دەكات[2].

هەر چەندە ئەم باڵە توانییان شانەی ڕێكخستن لە باشووری كوردستان دروست بكەن، بەڵام بە كردەوە (فعلی) ئێران ببوە مەیدانی كاركردنیان، بە تایبەتیش لەناو ئاوارەكاندا كارو چالاكیان هەبوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٨٣ ـ ١٩٨٤) چەند ئامێرێكی چاپ پەیدا دەكەنو كتێبی ( ماذا يعني انتمائي للإسلام)یان وەرگێڕایە سەر زمانی كوردیو دواتریش فارسیو چاپیان كرد[3].

هەروەها لە ساڵی (١٩٨٤)، گۆڤارێكی وەرزییان بەناوی (نداء الغريب) بە هەرسێ زمانی كوردیو عەرەبیو فارسی دەركرد، ئەم گۆڤارە زیاتر گرنگی بە بابەتی ئایدۆلۆژیاو تەفسیرو پەروەردە دەدا[4]، دەكرێت ئەم گۆڤارە بە زمانحاڵی ئەو باڵە دابنێین.

بە هەمان شێوەی باڵی سدیق عەبدولعەزیز، مەسەلەی نەبوونی ڕەسمییەتی كاركردن، لەو كاتەدا ببوە گرفتی سەرەكی ئەو باڵە، بۆ نەهێشتنی ئەو ئاستەنگە، سەلاحەددین موحەممەد لە بیری پەیوەندی كردن بە سەركردایەتی ئیخواندا بوو، بۆ ئەو مەبەستە، ساڵی (١٩٨٥) دەچێتە وڵاتی ئیماراتی عەرەبیو لەوێ چاوی بە ئیخوانە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] چاوپێكەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٦/١/٢٠٠٥.

[3] چاوپێكەوتنی توێژەر لەگەڵ ( بورهان موحەممەد ئەمین)، سلێمانی، ٦/٢/٢٠٠٥.

[4] عمر عبدالعزيز: گۆڤاری (نداء الغريب) نۆبەرەی كاری ڕۆژنامەگەری ئیسلامیی لە كوردستان، ڕۆژنامەی یەكگرتوو، ژمارە (١٨٤)، ٢٤/٤/١٩٩٨؛ بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەڕۆكو ڕۆڵو كاریگەری گۆڤارەكە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٤٩ ـ ٥٢.

عێراقییە دێرینەکان دەکەوێت، ئەوان مۆڵەتی ڕەسمی کارکردنی پێدەدەن‌و دەیکەنە بەرپرسی یەکەمی ئیخوان لە ئێران[1]، دەربارەی چۆنێتی دروستکردنی ئەم پەیوەندییە، سەلاحەددین موحەممەد دەڵێت:"ساڵی ١٩٨٥ کە بەڕەسمی لە ئێران پەیوەندیمان کرد بە تنظیمی جیهانی برایانەوە لەڕێگەی برا عێراقیەکانی دەرەوەی عێراقەوە"[2].

ئەم هەنگاوە بە وەرچەرخانێکی گرنگ دادەنرێت لە مێژووی ئەو باڵەدا، بەهۆی ڕەسمییەتی کارکردن، توانی تێکڕای کاری ئیخوان لە ئێران بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە[*]، لە هەمان کاتدا بوە پاڵپشتێکی گەورە بۆ کاری ئەم باڵە لەناو ئەندامە دیرینەکانی ئیخوان لە باشووری کوردستان، تا چیتر بەناوی نەبوونی ڕەسمییەتی کارکردن دژایەتی نەکەن.

لە لایەکی ترەوە، بەم هەنگاوە، کاری ئەو گروپە بە کردەوە بووە بەشێك لە کاری ئیخوانیی، ئەمەش پاڵپشتێکی مادی گەورەی بۆ دروستکردن، چونکە لەو کاتەدا، ئیخوان پڕۆژەیەکی بەناوی (فەتحی ئێران) دەستپێکردو بۆ ئەو مەبەستە بنکەیەکی لە

---

[1] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل١٩؛ نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٣٠.

[2] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل٧.

[*] سەبارەت بە کاری ڕەوتی ئیسلامیی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو خۆی لە چەند باڵێکدا دەبینییەوە، لە حەفتاکانەوە زانای ناسراوی کورد، ئەحمەدی موفتی زادە لەژێر ناوی (مەکتەب قورئان) دەستبەکار ببوو، هەروەها ڕەوتی ئیخوان موسلمین کارو چالاکی هەبوو، ناسری سوبحانی دیارترین کەسایەتی ڕەوتی ئیخوان بوو، بەڵام دەبێت سەرنج لەوە بدەین لە کاتێکدا ئیخوان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان کارو چالاکی هەبووە، جۆری پەیوەندییان بە باڵی سەلاحەددین موحەممەدەوە چۆن بووە؟، چونکە ناوبراو لە سنووری جوگرافی ئەواندا کاری دەکرد. هەڵبەتە بەپێی مادەی (٤٧) لە پەیڕەوو پڕۆگرامی گشتی ئیخوان موسلمین پەسەندکراو لەلایەن شورای گشتی لە (١٩٨٤/٧/٢٩)، هەر ئەندامێکی ئیخوان لە تاراوگە، ملکەچی سەرکردایەتی ئیخوانی ئەو وڵاتە دەبێت کە بۆی چووە، بەم پێیە دەبێت سەلاحەددین موحەممەد بچوایەتە ژێر فەرمان‌و سەکردایەتی ئیخوانەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، نەك بە باڵێکی سەربەخۆ کار بکات. بەڵام تا ئێستا هیچ زانیاریەکمان لەبەردەستدا نییە وردەکاری ئەو مەسەلە ڕون بکاتەوە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پەیڕەوو پڕۆگرامی گشتی ئیخوان موسلمین بڕوانە: مجموعة من الباحثين: الحركة الإسلامية رؤية مستقبلية أوراق في النقد الذاتي، تحرير وتقديم: د. عبدالله النفيسي، الطبعة الأولى، مكتبة مدبولي، القاهرة ١٩٨٩، ل٤٠١ ـ ٤١٦.

ئەردەن کردەوەو بڕێکی زۆر پارەی بۆ تەرخان کرد، بەشێکی ئەو پارەیەش بەر ئەم باڵەی ئیخوان کەوتو بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکانیان لێی سوودمەند بوون*.

---

* لە سەرەتای هەڵایسانی شۆڕشی ئیسلامیی لە ئێران، ڕازگری ڕێکخستنی دەوڵی ئیخوان موسلمین، پەیوەندی بە بەرپرسە ئێرانییەکانەوە کردو دەربارەی چۆنێتی هاوکاریکردنی یەکتر وتوێژیان کرد، ئێرانیش لەلای خۆیەوە (کەمال خەرازی) بە نوێنەری خۆی دەستنیشان کرد، تا پەیوەندی بە ئیخوانەوە بکات، لە (١٩٧٩/٥/١٤) ڕازگری ڕێکخستنی دەوڵی ئیخوان، لە شاری لۆگانۆی سویسرا کۆبوونەوەیەکی ئەنجامداو چەند بڕیارێکی بەپەلەی سەبارەت بە ئێران دەرکرد لەوانە:

١. وەفدێکی پێکهێنا لە (عەبدوڕڕەحمان خەلیفە ـ ئەردەنی، جابر رزق ـ میسری، سەعید حەوا ـ سووری، غالب هیممەت ـ سووری، عەبدوڵڵا سلێمان عوقەیل ـ سعودی). ئەم وەفدە لە (حوزەیرانی ١٩٧٩) سەردانی ئێرانی کرد، بە بۆنەی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامییەوە پیرۆزبایی ئیخوانیان بە سەرانی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران گەیاند.

٢. دەرکردنی چەند کتێبێك دەربارەی شۆڕشی ئێرانو برەودان بە باسکردنی لایەنی ئیجابی شۆڕشو سەرکردەکانی.

٣. دروستکردنی پەیوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ بزافی خوێندکارانی موسڵمان لە ئێران لە ڕێگەی یەکێتی جیهانی قوتابیانی موسڵمانو چالاك کردنی بزووتنەوەی وەرگێڕان بۆ فارسی بە تایبەتی وەرگێڕانی کتێبو ئەدەبیاتی ئیخوان.

٤. کۆمەکیکردنی ئێران لەڕووی ڕاگەیاندنەوە تا ببێتە پاڵپشتی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران.

هەر چەندە ئیخوان هەنگاوی پەلەی نا لە چونە پێشەوە لە ئێران، بەڵام سەرکردەکانی ئێران هێندە گەرموگوڕ نەبوون، هەر بۆیە هەردوولا لە نێوان سالانی (١٩٨٤ ـ ١٩٨٥) زانیان نێوانیان ئاسمانو ڕێسمانە، لێرەوە ئیخوان هەڵوێستی گۆڕیو لیژنەیەکی پێکهێناو پرۆژەی (فەتحی ئێران)ی کردە ئامانجو لە عەممانی پایتەختی ئەردەن بارەگایەکی بۆ کردەوەو بۆدجەی تایبەتی بۆ پرۆژەکە تەرخان کرد، ئامانجی سەرەکی ئەو پرۆژەیە، گۆڕینی شیعەکانی ئێران بوو بۆ سوننە. ئەمەش بەڵگەی کەمی هۆشیاری سیاسییە لای سەرانی ئیخوان. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مجموعة من الباحثين: الحركة الإسلامية رؤية مستقبلية أوراق في النقد الذاتي، ل٢٤٨ ـ ٢٤٩. خرۆشاو گەرمیانی دەربارەی خەرجکردنی پارەی ئەو پرۆژەیە نووسیویەتی: "ئەو پارەیەی کۆکرابوەوە بۆ فتحی ئێران بەکاردەهێنرا بۆ دژایەتی کردنی خەتەکانی تری ئیخوان لەناو ئێرانداو سەرکوتکردنی جەماعەتی شیخ مفتی زادەو ساردکردنەوەی خەڵکی لە بزوتنەوەی ئیسلامیو جیهادکردن". سەبارەت بەو بۆچوونەی خرۆشاو گەرمیانی زانیاری ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییەو نازانین ئاخۆ لە واقیعدا وابووە یان نا؟. ئیخوان لە تەرازووی شرعو واقعدا، بەشی یەکەم، ب. ش، ب. م، ل٢٦.

## باسی سێیەم: کاری هەردوو باڵ لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥ - ١٩٩١

### یەکەم: کاری هەردوو باڵ لە نێوان ساڵانی ١٩٨٥ - ١٩٨٧

#### ١- یەکگرتن لەگەڵ ئیخوانەکانی عێراق

هەر لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، بیرۆکەی ڕێکخستن لە زۆربەی شارەکانی عێراق و کوردستان سەریهەڵدا، زۆربەی هەلگرانی ئەم بیرۆکەیە پێشتر ئەندامی ئیخوان موسلمین بوون، ئەو بیرانەش لە چوارچێوەی عێراقیبوون دەرنەدەچوون، بەردەوام لە هەوڵی وەرگرتنی مۆڵەتی کارکردن و شەرعییەت پێدانی سەرکردایەتی کاری عێراقی لە ناوەوەو دەرەوەدا بوون[١].

بەهێزترین ڕێکخستن لە باشووری کوردستان، لە باڵی سدیق عەبدولعەزیزدا خۆی دەبینیەوە، بەڵام گەورەترین گرفتی ئەم باڵە نەبوونی ڕەسمییەت و ڕەزامەندی سەرکردایەتی ئیخوان بوو، لەلایەکی دیکەوە، ئەم ڕێکخستنە لە سەرەتاوە جۆرێك لە خۆجێیەتی بۆ دروست بوو، ئەم حاڵەتە دۆخێکی وای خوڵقاندبوو کە سەرکردەکانی بەدوای چارەسەرو بەدیهێنانی مۆڵەتی کارکردندا بگەڕێن[٢]، ئەمەش بە پلەی یەکەم دەرەنجامی دژایەتی ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان بوو.

کاتێك، لە سەرەتای هەشتاکاندا، چەند ئەندامێکی ئەم باڵە دەچنە شارەکانی بەغدادو موسڵ، لە ڕێگەی (سەید ئەحمەد عەبدولوەهاب) بە گروپێکی تری ئیخوان ئاشنا دەبن، ئەو گروپە لە سەرەتای هەشتاکانەوە، لە ژێر ناوی (جماعة الراية) دەستیان بە کار کردبوو، لە شارەکانی ناوەڕاستی عێراق ڕێکخستنیان هەبوو[٣]. گرنگترین کەسایەتییەکانی ئەو ڕێکخستنە بریتیی بوون لە (دکتۆر عەبدولمەجید –ئەبو زەر، دکتۆر عیسام ئەلڕاوی، موحەممەد فازیل سامەڕائی، موحەممەد ئیبراهیم، عەلی ئەبولحەسەن)[٤].

---

[١] هادی علی: هەمان سەرچاوە، ل٦٠.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەولود باوەموراد)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨.

[٣] سەرچاوەی پێشوو.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (هیوا میرزا سابیر)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨.

ئەو گروپە زیاتر لە ناو زانکۆکاندا دەجولآنو کارو چالاکییان هەبوو، ژمارەیەك پزیشكو ئەندازیارو ئەفسەرو خاوەن بڕوانامەیان لێکۆبوویەوە، دواجاریش توانییان ڕێکخستنی دەولی ئیخوان موسلمین ڕازی بکەن، کە ڕەسمییەتی کارکردنیان بداتێ، ئەوەش چەکێکی بەهێزی ئەو گروپەبوو بۆ بێدەنگ کردنی ئیخوانە دێرینەکانی ناوخۆ، هەروەها ژمارەیەك لەو ئیخوانانەی بە شێوەیەکی پەرتەوازە جموجۆڵیان هەبوو گەردنگیری ئەو گروپە بوون[١].

سەرجەمی ئەو باڵانەی بە ناوی ئیخوانەوە لە باشووری کوردستان کاریان دەکرد، پێویستی مادیو مرۆیی تەواویان نەبوو، ئەمەش یەکگرتنو لێك نزیکبوونەوەی ئەو باڵانەی پێویست دەکرد. دوای یەکترناسینو دروستبوونی متمانەو ئاگاداربوون لە کاری یەکتر، دکتۆر عیسام ئەلراوی چەند جارێك دێتە هەڵەبجەو کۆبونەوە لەگەڵ سدیق عەبدولعەزیز[٢]و سەلاحەددین موحەممەد دەکات، کە لە ساڵی (١٩٨٤) بە نهێنی هاتبۆوە ناوچەکە[٣]. ئەنجامی ئەم سەردانو چاوپێکەوتنانە، ڕێکەوتنی نێوان باڵی سدیق عەبدولعەزیزو ئیخوانەکانی ناوەڕاستی عێراقی لێکەوتەوە لە ساڵی (١٩٨٥) دا[٤].

دوای ئەم ڕێکەوتنە، باڵی سەلاحەددین موحەممەد، پەیوەندی بە ناوبراوەوە دەکەن، تا هەڵوێستی خۆی دەربارەی بەشداری کردن لەو یەکگرتنە دەربڕێت. ئەویش ئاگاداریان دەکات، کە باشتروایە کارەکان بکەن بە یەك[٥]. ئەم یەکگرتنە، جگە لە چەند کەسێکی کەمی ئیخوان کە پێی ناڕازی بوونو بەشداریان لەو پرۆسەدا نەکرد، سەرجەم باڵەکانی ئیخوانی کردەوە بەیەك[٦]، لە لایەکی ترەوە کاری ئیخوان لە کوردستان

---

[١] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل ٣٧.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزین)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزین)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەسەن شەمێرانی)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ( بورهان موحەممەد ئەمین)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٢/٦.

[٦] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٢٢.

بەشێوەیەکی ئۆرگانی بە ئیخوانی عێراقەوە بەسترایەوە، چونکە تا کاتی ئەو یەکگرتنە ئیخوانەکانی کوردستان تەنها بە فکر ئیخوان بوون، نەك بە شێوەی ئۆرگانی.

بەپێی ئەم ڕێکەوتنە دەبوو کاری کوردستان بدرێتە دەست کوردەکانو سەرجەم ڕێکخستنەکانی ناوەڕاستیش بدرێتە دەست ئیخوانە عەرەبەکان، لە کوردستان شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، کرایە بەرپرسی یەکەمی ئیخوان، دانانی ناوبراو وەکو چارەسەرێکی ناوەندی بوو بۆ نەهێشتنی ئەو حاڵەتە دەروونیەی لە ئەنجامی ململانێی باڵەکاندا لە کوردستان دروست ببوو، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز مایەی ڕەزامەندی سەرجەم باڵەکانو جێگەی متمانەی هەموان بوو، بەڵام بە شێوەیەکی کردەیی سدیق عەبدولعەزیز هەڵسوڕێنەری کارەکان بوو[1].

ئەگەر بمانەوێت دەربارەی هۆکاری ئەم یەکگرتنە بدوێین، ئەوا لێکدانەوەی جیاواز لەخۆ دەگرێت، موحەممەد ڕەئوف کە ئەوکاتە ئەندامێکی چالاکی باڵی سدیق عەبدولعەزیز بووە، دەربارەی ئەم یەکگرتنە دەڵێت:"ڕێکخستنەکانی ناوەڕاست، بەر لە ئێمە پەیوەندییان بە باڵەکەی ترەوە (سەلاحەددین موحەممەد ـ توێژەر) کردبوو، بەڵام نەگەیشتبوونە ئەنجامو لێکترازابوون، بۆیە بەدوای جێداردا دەگەڕان کە بۆشایی کوردستانیان بۆ پڕ بکاتەوەو هاوکات فشارێکیش بێت لەسەر باڵەکەی تر، ئێمەش بچووك بووینو پێویستیمان بەوە بوو لەگەڵ کەسانێکدا تێکەڵ بین، کە پێداویستی مادیو مرۆییمان بۆ دابین بکات"[2]. بەڵام حەسەن شەمێرانی هۆکاری سەرەکی دەگێڕێتەوە بۆ ویستی سدیق عەبدولعەزیز بۆ یەکگرتن، چونکە ئەو حەزی بەوە دەکرد زوو دەست بداتە کاری سیاسیی[3].

نووسەری (کاروانی ڕێ) دەربارەی هۆکاری ئەم یەکگرتنە نووسیویەتی:

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢؛ نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٣٩.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٢٦.

أ – ڕێکخستن خۆی بە ئیخوان دەزانی، لەو تاقە بەیانەشدا کە دەریکردبوو، بەڵێنی دابوو هەر کاتێك ئیخوان دەستبەکار بوو، ئەو پێیانەوە پابەند دەبێت، ئەو ڕێکخستنەش مۆڵەتی ڕەسمییان وەرگرتبوو، دەبوو ڕێکخستن پێوەی پابەند بێت.

ب – ئەو یەککگرتنە گرفتی نەبوونی ڕەسمییەتی کارکردنی چارەسەر دەکرد، کە ببوە چەکی دەستی ئیخوانە دێرینەکان بۆ دژایەتی کردنی ئەم ڕێکخستنە نوێیە.

ج – ئەم یەککگرتنە دەبووە هۆی پێکەوەبەستنی سەدان کادرو ئەندام، ئەمەش سنوری کارەکەی فراوان دەکردو ڕێکخستن دەبووە هێزێکی گەورە.

د – ئیخوانەکانی دیکەش مەبەستیان بوو ئەم یەککگرتنە بکەن، چونکە کارەکەیان بەرفراوانو گەورە دەبوو، هاوکات دەبووە کارتێکی بەهێز بۆ زیاتر وەلآمدانەوەو هاتن بەدەم خواستەکانیانەوە لەلایەن ئیخوانی دەرەوە[1].

**٢- ئاشکرابوونی ڕێکخستنو ئاوارەبوونی ئێران**

دوای یەککگرتن، ڕێکخستن تێکەڵ کراو بەرنامەی فراوان کردنی کار دارێژرا، بەڵام مانگی هەنگوینی ئەم یەککگرتنە درێژەی نەکێشا، دوای ساڵێكو لە کۆتایی (١٩٨٦) دا، بە هۆی گیرانی دوو عەرەبەوە سەرەداوی ڕێکخستن ئاشکرابوو[2]، بە هۆی ئەوانەوە دکتۆر عیسام ئەلڕاوی دەستگیر کرا. ناوبراو لە ژێر ئاشکەنجەدا ناوی زۆربەی هەڵسوڕێنەرانی کاری ئیخوانی ئاشکرا کرد[3]، حکومەتی عێراق، لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٧)وە هەڵمەتی دەستگیرکردنی کادیرەکانی ئیخوانی لە سەرتاسەری عێراقدا دەستپێکرد، سەرەنجام نزیکەی (٧٥) کەس گیرا، لەناویاندا ژمارەیەك کوردی تێدابوو، لەوانە (حەسەن شەمێرانی، حەسەن پێنجوێنی، دکتۆر فاتح، عومەر ئیسماعیل،...[4]). ژمارەیەکیش لەو سەرکردانەی لە هەڵمەتی بەعس ڕزگاریان بوو، بەرەو ئێران هەڵاتن، کە لە ناویاندا سدیق عەبدولعەزیز بوو[5].

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو، ل٣٨.

[2] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٢٣.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (هیوا میرزا سابیر)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨.

[5] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٢٣

ماوەیەکی زۆر بەسەر هەڵمەتی دەستگیرکردنی کادیرانی ئیخوان تێنەپەڕیبوو، لە (١٣/٥/١٩٨٧) هەڵەبجە خۆنیشاندانێکی جەماوەری بەخۆوە بینی، ئەم ڕاپەڕینە دژ بە سیاسەتیی ڕاگواستنی هاوڵاتیانی کورد لەلایەن بەعسییەکانەوە سازدرابوو، حکومەت بەتوندی کەوتە سەرکوتکردنی خۆنیشاندانەکە، دەرەنجامی بەرەنگاربوونەوەی بەعس کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی شارەکەی بۆ ئێران لێکەوتەوە. شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، کە ساڵی (١٩٨٥) کرابووە بەرپرسی ئیخوانەکانی کوردستان، سەرقافڵەی کۆچکردوان بوو[1].

بە هۆی هەڵمەتی بەعس‌و خۆنیشاندانی هەڵەبجەوە، زۆربەی سەرکردە کوردەکانی ئیخوان ئاوارەی ئێران بوون، بەڵام دەبێت سەرنج لەوە بدەین، کاتێك ئەوان چوونە ئێران، لەوێ ڕێکخستنێکی تری ئیخوان هەبوو، کە سەلاحەددین موحەممەد سەرپەرشتی دەکرد، ئەم باڵە لە ڕێکەوتنی ساڵی (١٩٨٥)دا تەنها ئەو کادیرانەیان هاتنە ناو ڕێکەوتنەکەوە، کە لە باشووری کوردستان بوون. خودی سەلاحەددین موحەممەدو ئەو کادیرانەی لە ئێران دەژیان نەهاتبوونە ناو ئەو یەکگرتنەوە، بەو پێیەی کاری سەرەکی ئەم باڵە لەناو ئاوارەکانی کورد لە ئێراندا بوو، لە هەڵمەتی دەستگیرکردنی بەعس ژمارەیەکی کەم ئەندامیان گیرا، ئەمەش وای کرد لەچاو باڵی سدیق عەبدولعەزیزدا، ڕێکخستنەکەیان هێندە مەترسی لەسەر نەبێت‌و دوای هەڵمەتی بەعس بۆ سەر ڕێکخستنەکانی ئیخوان ئەوەندە شپرزە نەبێت.

لەلایەکی ترەوە، ئەم باڵە لە ساڵی (١٩٨٥)وە، مۆڵەتی ڕەسمی کارکردنی لە سەرکردایەتی ئیخوان وەرگرتبوو، ئەمەش گروتینێکی باشی بە کارەکەیان دابوو.

---

[1] حەکیم مەلا ساڵح: هەمان سەرچاوە، بەرگی یەکەم، ل ٢٤٦؛ موجز عن الحركة الإسلامية في كردستان العراق، ل٢٤.

## دووەم: کاری هەردوو باڵ لە نێوان ساڵانی ١٩٨٧- ١٩٩١

### ١- هەڵوەشاندنەوەو لێکترازانی باڵەکانی ئیخوان

بە گەیشتنی سەرکردەکانی ئیخوان بۆ ئێران، لە (١٩٨٧/٥/٢٤) بەناوی کۆمەڵەی زانایانی کۆچەری (جماعة العلماء المهاجرين)ەوە بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە، زانایان لەو بەیاننامەدا ئۆباڵی نەهامەتیو ئەو کارەساتانەی بەسەر گەلانی عێراقدا هاتووە، دەخەنە ملی حکومەتی بەعسو دەڵێن: "ئەی نەوەکانی گەلی موسڵمان، ڕژێمی بەعسی عەفلەقی هەر لە کاتی دەسەلات گرتنە دەستەوە، سەدان تاوانی وەحشیگەرانەی ئەنجامداوە، دیارترینو کاریگەرترینیان ڕاگواستنی گەلی کوردی موسڵمانە لە شارو گوندەکانەوە بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان، کە لە ڕاستیدا زیندانێکی ترسناکە بۆ ئایینو بیرو گیانو لاشە...." [١].

لە بەشێکی تری بەیاننامەکەدا، ئاماژە بەوە دەکات کە ڕژێمی بەعس لە ڕۆژی دەستبەکاربوونییەوە جەنگی دژی ئیسلامو زانایانو بانگخوازان ڕاگەیاندووە، بە چەند شێوازێکی جۆراوجۆرو بەرنامە بۆ داڕێژراو کەوتۆتە دژایەتی کردنی ڕەوشتبەرزیو بڵاوکردنەوەی فەساد بێڕەوشتیو کوشتنو بڕینو سەرکوتکردنی ئازادییەکان [٢]. لە کۆتایی بەیاننامەکەشدا کۆمەڵەی زانایانی کۆچەریی، دلوا لە گەلانی عێراق دەکات، بەرەنگاری بەعس ببنەوەو ڕیزەکانیان یەکخەنو لەپێناو بەگژاچوونەوەی ستەمو زۆرداریو پلانەکانی کوفری جیهانی جیهاد لە پێناوی خوادا بەرپا بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش داوایان لێدەکات شوێن زانایانی کۆچەری بکەون، کە لە پێناو ستەملێکراوان شۆڕشی جیهادییان ڕاگەیاندووە [٣].

ئەم بەیاننامە لەلایەن (سەید ئەحمەد عەبدولوەهاب) لەسەر ڕەزامەندی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز نووسرا، بە دوو مەفرەزەی چەکداردا بەیاننامەکە نێردرایەوە

---

[١] بڕوانە بەلگەنامەی ژمارە (٨ ).

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

[٣] سەرچاوەی پێشوو.

کوردستان، لێپرسراوی دوو مەفرەزەکە (موحەممەد عومەر) بوو، (غازی موحەممەد ئەمین)یشی لەگەڵدابوو.[1]

لەو ماوەداو دوای چەند کۆبوونەوەیەك، بە بەشداری زۆرێك لە کادیرە ئاوارەکانی ئیخوان (بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستان/ عێراق) بە ڕابەرایەتی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، وەکو بزووتنەوەیەکی چەکداری ڕاگەیەنرا[*]، بەو پێیەی ڕابەری بزووتنەوە پێشتر بەرپرسی ئیخوانەکانی کوردستان بوو، چاوەڕێی ئەوە دەکرا، سەرجەم ئیخوانەکان لە دەوری بزووتنەوە کۆببنەوەو بەشداری کارا لە تۆکمەکردن‌و ڕاگیرکردنی ئەو پارتەدا بکەن، بەڵام ئەم خەونە نەهاتەدی‌و هەر لەگەڵ ڕاگەیاندنی بزووتنەوەدا، سەلاحەددین موحەممەد بەرپرسی ئیخوان لە ئێران، خۆی گەیاندە ئیماراتی عەرەبی‌و پەیوەندی کرد بە سەرانی ئیخوانەوەو نامەیەکی دکتۆر نوعمان عەبدوڕڕەزاق سامەڕائی بۆ ئیخوانەکان هێنا[2].

بە گوتەی سەلاحەددین موحەممەد ئەو نامەیە پەیامێکی روون بوو بۆ شێخ عوسمان کە بەوپێیەی خۆی بە برا ئەزانی‌و کەسایەتییەکی گەورەی برایانە، نابێ پێشەوای ئەو بزووتنەوە چەکدارییە بێ، نابێ فشار بخاتە سەر گەنجان بۆ چەکداری بەناوی جیهادەوە، چەکداری پرۆسەیەکی ئاڵۆزەو زینگەو کەش‌و هەواو ئەحکامی خۆی هەیەو بەو شێوەیەو لەژێر ئەو بارودۆخەدا کە جەنگی ئێران‌و عێراق بوو رەوا نییە. هەروەها تێیدا هاتبوو کە پێمان باشە کاری پێشەوایەتی بدەیتە دەست مەلا عەلی عەبدولعەزیز[**]ی برات، چونکە برایان لە ئێران قەوارەو شەرعییەتی خۆی هەیەو دەبێ هەموو لایەك پابەند بن پێوەی[3].

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

[*] لە بەشی (پێنجەم)ی ئەم توێژینەوەدا بە درێژی باس لە دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی دەکەین.

[2] میوا: هەمان سەرچاوە، ل٣٠؛ صالح حکیم: هوشیارکردنەوەی هوشیاری، ب.ش، ب.م، ل١٥.

[**] عەلی عەبدولعەزیز موحەممەد، لە (١٩٢٩) لەدایك بووە، هەر لە منداڵییەوە دەستی داوەتە خوێندنی زانستە شەرعییەکان‌و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (١٩٨٧) و بۆتە جێگری رابەری گشتیی، لە (١٩٩٧) بۆتە رابەری گشتیی بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و دواتریش رابەری بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، لە (٢٠٠٧/٣/١٧) کۆچی دوایی کردووە.

[3] نامەی (سەلاحەددین موحەممەد بەهائەدین) بۆ توێژەر، ٢٠٠٩/٥/٩.

دەربارەی کاریگەری ئەم نامەیە بۆ سەر ڕەوتی ئیسلامیی باشووری کوردستان، بۆچوونیجیاواز هەیە، لەو ڕووەوە سەلاحەددین موحەممەد دەڵێت: "بە رای من نامەکە زۆر گرنگ بوو بۆ جیاکردنەوەی ئاراستەکانو خاڵ خستنە سەر پیتو حەسم کردنی هەڵوێست، بەو نامەیە بزووتنەوە بە گشتیو مامۆستا بە تایبەت کەوتە دەرەوەی حاڵەتو جەمعی برایانو دابڕانێکی کرداری ڕوویدا کە یەکلاکردنەوەو ڕاستکردنەوەی تیا بوو، پێویست بوو بۆ ڕزگابوونی گەنجەکان لە فەتواو فشاری سەرکردایەتی بزوتنەوە"[١]. بەڵام هەر لەو بارەوە سدیق عەبدولعەزیز دەڵێت: "ئەگەر ئەو نامە نەبوایە ئەو هەموو گەنجەی لە ئێراندا بوون دەستبەرداری بزووتنەوە نەدەبوونو واقعێکی تر دروست دەبوو، بزووتنەوە ڕەوتی ئاسایی خۆی وەردەگرت"[٢]. سەلاحەددین موحەممەد ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە ئەو نامەیە هەڵەیەکی مێژوویی ئیخوان بێت لەو کاتەداو لەو بارەوە دەڵێت: "ئەو نامەیە هەڵوێستی مێژوویی گرنگ بوون چونکە بزووتنەوە لە ژینگەو بارودۆخێکی تایبەتو ڕاگوزەردا لەدایك بوو، هەرگیز توانای ئەوەی نەبوو کە ستراتیژێکی مەحکەمو دیدێکی ڕوونی بێ، کەچی دەیویست بیکاتە ئەمری واقعو هەموو گەنجانی برایان بخاتە ژێر باڵی ئەو حاڵەتە ناسەقامگیرە، بزووتنەوە هەنگاوێکی بەرێنو بێ پلان بوو لە لایەك، خاوەنی ئاراستەیەکی مەرجدارو پابەندیەکی ناساز بوو لە لایەکی تر، بۆیە هاوهەنگاویو پابەندی کارێکی ئاسان نەبوو"[٣]. بەدەر لەو بۆچوونانەی پێشوو ئەم نامە سەرەتای پەرتەوازەبوونێکی گەورەی ئەو ڕەوتە بوو، بە گەیشتنی نامەکە، ڕەوتی ئیخوان بوونە سێ پارچە:

أ ـ شێخ عوسمانو کۆمەڵێك کەسایەتی تر، بەرپەرچی بڕیارەکەیاندایەوەو لەناو بزووتنەوەی ئیسلامیی درێژەیان بەکاردا[*].

---

[١] سەرچاوەی پێشوو.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[٣] نامەی ناوبراو بۆ توێژەر، ٢٠٠٩/٥/٩.

[*] نامەکەی دکتۆر نوعمان بێزارییەکی زۆری لای شێخ عوسمان عەبدولعەزیز دروستکرد، کاتێك نامەکەیان پێدا، ناوبراو وتی: "(بسم الله)ی بڕیارەکە لابەرن با ئەویتری بخەمە ژێر پێمەوە". هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٣٠ ـ ٣١.

ب ـ باڵی سەلاحەددین موحەممەد، تێکڕا پابەندی بڕیارەکەبوون‌و وێڕای هاوکاری نەکردنی بزووتنەوە کەوتنە دژایەتی کردنیشی.

ج ـ باڵی سدیق عەبدولعەزیز، لە نێوان بزووتنەوەو هێڵی سەلاحەددین موحەممەددا، هەڵوێستێکی لەرزۆکیان هەبوو. لە بزووتنەوە کشانەوە، بەڵام تێکەڵ بە باڵی سەلاحەددین موحەممەدیش نەبوون‌و بەناوی ئیخوانەوە سەربەخۆ کەوتنە کارکردن[1].

ئەگەری ئەوە هەیە دوای ئاوارەبوونی شێخ عوسمان‌و سەرکردەکانی تری ئیخوان، سەلاحەددین موحەممەد داوای لێکردبن گوێڕایەڵی ئەو بن‌و بچنە ژێر سەرکردایەتی ئەوەوە، بەڵام ئەوان ناڕازی بوون بەو کارە، بۆیە ناوبراو هانای بۆ کاغەزی سەرانی ئیخوان بردووە، ئەوەی ئەم بۆچونەش پشتڕاست دەکاتەوە گوتەی سەلاحەددین موحەممەدە، نابراو سەبارەت بە ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی دەڵێت:" شایانی باسە کە بڕیاری کار لە ئیخوان دا وایە هەر کەس لە برایان لە عێراقەوە کە دەچووە هەر شوێنێك دەبێ ئیلتیزام بکا بە کاری برایانی ئەو شوێنەوە. هەربۆیە داوا کرا لە هەموو ئەو بەڕێزانەی لە عێراق دا لە ڕیزی برایانی موسڵمان دا کاریان کردبوو پەیوەندی بکەن بە کاری برایانەوە لە ئێران، ئەوەبوو گشت برا عەرەب‌و تورکمان‌و کوردەکان ئیلتیزامیان کرد بەو بڕیارەوە جگە لە هەندێکیان کە دوایی بە هاوکاری برایانی رابتەی زانایانی کوردستان کە تا ئەو کاتە عەلەمداری ئاشکرای ئەو مەیدانە بوو. بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانیان پێکهێنا..."[2].

---

[1] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل۳۰؛ نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٤٩ ـ ٥٠.

[2] لە: باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل۷. مادەی (٤۷) لە پەیڕەوو پڕۆگرامی گشتی ئیخوان موسلمین، پەسەندکراو لەلایەن شورای گشتی لە (۱۹۸٤/۷/۲۹)، بۆتە پاڵپشتێکی یاسایی سەلاحەددین موحەممەد، تا داوا لەو ئەندامانەی ئیخوان بکات کە لە عێراقەوە هاتوون ملکەچی فەرمانی ئەو بن‌و بچنە ژێر سەرکردایەتییەوە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پەیڕەوو پڕۆگرامی گشتی ئیخوان موسلمین بڕوانە: مجموعة من الباحثين: الحركة الإسلامية رؤية مستقبلية، ل٤٠١ ـ ٤١٦.

### ٢- یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی ئیخوان لە ئێران

هەر وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد، دوای هەڵوێستی سلبی سەرکردایەتی ئیخوان لە دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامییو کاری چەکداری، ئیخوان بوونە سێ پارچە. باڵی سەلاحەددین موحەممەد تۆکمەترین باڵ بوو، چونکە ئەوان بەدرێژایی چەند ساڵی رابردوو لەناو ئاوارەکاندا کاریان دەکردو هاوکات ڕەسمیەتی کارکردنیان لە سەرکردایەتی ئیخوان وەرگرتبوو، لەپاڵ ئەوەشدا، لە هەڵمەتی دەستگیرکردنی سەرکردەکانی ئیخوان لەلایەن حکومەتی بەعسەوە، لە چاو باڵەکەی تر، زیانی کەمتریان بەرکەوتبوو. هەموو ئەم هۆکارانە وای کردبوو، کە ئەو باڵە بێ گیروگرفت لەسەر هەمان ڕەوتی پێشووی بەشێوەیەکی چالاك لەکاردا بێت.

بەڵام باڵی سدیق عەبدولعەزیز، لە دوای دامەزراندنی بزووتنەوەو هەڵوێستی سلبی سەرکردایەتی ئیخوان لەو هەنگاوە، کەوتنە نێوان بەرداشی بزووتنەوەو هەڵوێستی ئیخوان، ئەم باڵە لەو دەمەدا پەیڕەوی لە سیاسەتیی (خورمژ دەخۆم)ی دەکرد، وایان ڕاگەیاند کە ئیخوانن، لە سەرێکی ترەوە پشتگیری بزووتنەوەیان دەکردو ژمارەیەك کادیریان لەناو بزووتنەوەی ئیسلامیی کاریان دەکردو چالاکییان دەنواند[1]. هاوکات لە بیری ئەوەدابوون پەیوەندی لەگەڵ سەرچاوەی ئیخواندا بکەنو پەیوەندییەکەیان ڕێك بخەنەوە[2]. بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو، پێویستی بە هەوڵو ماندووبوونی زۆر هەبوو، حاڵەتێکی لەو شێوەش سەرکردەکانی ئەو باڵەی توشی دڵەڕاوکێ کردبوو[3].

سەرەنجام ئەم باڵە، دوای وتوێژو دڵەڕاوکێیەکی زۆر لە ناوخۆدا، بڕیاریاندا نوێنەر بنێرن بۆ لای ئیخوانی دەرەوە، تا کێشەکەیان بۆ یەکلاکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە ڕاپۆرتێکیان نووسیو بە (مەلا موحەممەد عومەر)دا، لە وەرزی حەجی ئەو ساڵەدا ناردیانە دەرەوە، ناوبراو لەو سەفەرەدا چاوی بە سەرانی ئیخوان کەوت، ئەوانیش پێیان ڕاگەیاندبوو کە مەسەلەی چەکداری هەڵەیەو نزیکی نەکەونەوە، ئەمەش

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٥٠ ـ ٥١.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەولود باوەموراد)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨.

[3] سەرچاوەی پێشوو.

جەختکردنەوەبوو لەسەر هەمان هەڵوێستی پێشوو، کە لە نامەکەی دکتۆر نوعماندا دەریان بڕیبوو [1].

باڵی سدیق عەبدولعەزیز، دوای گەڕانەوەی موحەممەد عومەرو دڵنیابوون لە هەڵوێستی سەرکردایەتی ئیخوان، خۆیان یەکلاکردەوەو کەوتنە ڕێکخستنەوەی ریزەکانیان لە ئێران‌و دەستیان کردەوە بە کارکردن‌و بە تەواوی لە بزووتنەوەی ئیسلامیی کشانەوە، لە ماوەی (تشرینی یەکەمی ١٩٨٧) تا (تشرینی یەکەمی ١٩٨٨) ئەم هەنگاوانەیان نا:

١- ڕێکخستن خرایەوەگەڕ، ئۆردوگاو ناوچەکان کە کوردی عێراقی تیابوو بەسەر کادیرانی ڕێکخستن دابەشکران، دوای کیمیاییبارانەکەی هەڵەبجە توانرا ئەندامانی خۆیان بەسەر بکەنەوەو ریزەکانیان ڕێکبخەنەوە.

٢- لەناو کوردەکانی ئێراندا کەوتنە جموجۆڵ‌و چالاکی، لای (کەندەسوورە)ی نزیك بانە، مەلا ئەحمەد شافعی قوتابخانەیەکی زانستی شەرعی کردەوە، ئارام قادر لە (جۆانڕۆ) شانەیەکی لە کوردەکانی ئێران پێکهێناو ئەو ئەندامە نوێیانەش کەوتنە کارکردن.

٣- هەوڵیاندا پەیوەندی لەگەڵ (مەکتەب قورئان)ی ئەحمەدی موفتی زادە دروست بکەن، ئەمەش تا تێکەڵبوونەوەی هەردوو باڵەکەی ئیخوان لە ئێران بەردەوام بوو.

٤- گرنگیدان بە بواری ڕاگەیاندن‌و دەرکردنی ژمارە (١)ی گۆڤاری (پێشەوا) و چەند کتێبی وەکو (دراسات اسلامیة)ی سەید قوتب‌و (وجود الله، حقیقة التوحید)ی قەرزاوی بە چاپ گەیەنرا.

٥- دروستکردن‌و دامەزراندنی شوورا [2].

دوای خۆڕێکخستنەوە، لە (ئەیلولی ١٩٨٨) لە ئۆردوگای کامیران لە ئێران، کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتیان کرد، لەو کۆبونەوەدا بڕیاریاندا، جگە لە (سدیق

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو، هەمان سەرچاوە، ل٥١.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

عەبدولعەزیز، موحەممەد ڕەئوف، مەولود باوەموراد) سەرجەم ئەندامانیان بگەڕێنەوە عێراق و جارێکی تر دەستبکەنەوە بە ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانیان[1].

ئەم کۆبوونەوەیە، زیاتر لە هەفتەیەکی خایاند، بۆ یەکەمجار پەیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆ دانراو بەرنامەی پەروەردەیی ڕێکخرا، لەم کۆبوونەوەدا جگە لە سدیق عەبدولعەزیز، ئەمانەش بەشداربوون (موحەممەد ڕەئوف، موحەممەد عومەر، عەلی عەبدوڵڵا، مەلا ئەحمەد شافعی، مەولود باوەموراد، ئارام قادر، ئیکرام کەریم، غازی حەمەئەمین، ئومێد پاڕەزانی، ئەبو خوبەیب، تۆفیق کەریم)، بە تێکڕای دەنگ (نازم عەبدوڵڵا، دانا غەفوور)، کە لە کوردستانی عێراق مابوونەوەو سەرپەرشتی کارەکانییان دەکرد، بە ئەندامی شوورا دانران[2]. ئەم بڕیارە جێبەجێ کراو لە (٦ تشرینی یەکەمی ١٩٨٨) دا، دوا کاروانی ئەم باڵە گەڕانەوە عێراق[3].

باڵی سدیق عەبدولعەزیز، تا کاتی بڕیاری گەڕانەوەی ئەندامەکانی، نەیانتوانیبوو پەیوەندی بە سەرکردایەتی ئیخوانەوە گرێبدەنەوە، لە کۆتایی مانگی (تشرینی یەکەمی ١٩٨٨)، دکتۆر عەبدولمەجید (ئەبوزەڕ) کە لێپرسراوی ئیخوان بوو لە ناوخۆی عێراق و دوای هەڵمەتەکەی بەعس بەرەو دەرەوەی عێراق هەڵاتبوو، بە نوێنەرایەتی ئیخوان هاتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و چاوی بە هەریەکە لە سدیق عەبدولعەزیزو سەلاحەددین موحەممەد کەوت[4].

دوای چەند کۆبونەوەیەک لە (١٩٨٨/١١/٩) دا، ڕێکەوتنێك لە نێوان هەردوو باڵەکەدا واژۆ کرا، ڕێکەوتنەکە لە نێوان (دکتۆر عەبدولمەجید) بە نوێنەرایەتی باڵی سدیق

---

[1] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٣٦.

[2] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٥٢ ـ ٥٤.

[3] هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٣٦. لە (کاروانی ڕێ)دا نووسراوە: ئەم بڕیارە نەتوانرا بەتەواوی جێبەجێ بکرێت و زۆرێك لە ئەندامانی ڕێکخستن لە گەڕانەوە دواکەوتن، جێبەجێ کردنی بڕیارەکەش لە دوایدا شوێنەواری سلبی جێهێشت، هۆکاری سەرنەگرتنی بڕیارەکەش پەیوەست بوو بە هاتنی دکتۆر عەبدولمەجید (ئەبوزەڕ) بۆ ئێران بە مەبەستی یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی سەلاحەددین موحەممەدو سدیق عەبدولعەزیز. بڕوانە: نوسەرێکی نەزانراو، ل٥٤.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

عەبدولعەزیزو (عومەر ڕێشاوی) بەنوێنەرایەتی باڵی سەلاحەددین موحەممەد کرا، ناوەڕۆکی ڕێکەوتنەکە بەم شێوەیە بوو:

بسم الله الرحمن الرحيم

٣٠ ڕەبیعی یەکەمی ١٤٠٩ك

١٩٨٨/١١/٩

الحمد لله وحدة، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده، وعلى اله وصحبه وجنده. خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی ( وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ).

بڕیار

لەبەر سوربوونی برایانی کارکەری ئیخوان موسلمین، لە ناوخۆو دەرەوەی عێراق، لەسەر یەکڕیزی موسڵمانان‌و نەهێشتنی هۆکارەکانی ئاکۆکی‌و پەرتەوازەیی‌و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، بە سەرخستنی ئاینەکەی بە یەکڕیزی‌و ئولفەتگرتن، نوێنەرانی برایانی کارکەر، لە ناوخۆو دەرەوەی عێراق کۆبونەوەو پێکهاتن لەسەر:

یەکەم: پێویستە سەرجەم برایانی کارکەر لەناوخۆی عێراق پابەندی سەرکردایەتی گشتی کاری ئیخوانی ڕێکخراوی ناو عێراق بن.

دووەم: پێویستە سەرجەم برایانی کارکەر لە دەرەوەی عێراق پابەندی سەرکردایەتی کاری ئیخوان بن لە دەرەوەی عێراق لە ماوەی مانەوەیاندا لەو وڵاتەی تێیدا نیشتەجێن.

سێیەم:

أ ـ پەیوەندی ڕێکخستن لەگەڵ هەر ئەندامێک دەپچڕێت ئەگەر گەردنگیری ئەم بڕیارە نەبێت.

ب ـ ئەم بڕیارە لە ماوەی سێ مانگ لە مێژووی دەرچوونییەوە جێبەجێدەکرێت، لەو ماوەدا دانیشتن‌و چاوپێکەوتنی برایانە بۆ ڕێکخستنی لەوەودوا دەکرێت.

چوارەم: ئامۆژگاری سەرجەم برایانی گەردنگیر دەکەین بە لەخواترسان‌و پابەندبوون بە فەرمانەکانی کۆمەڵ، کە ڕێکخستنەکانی ناوخۆو دەرەوەی عێراق لەسەری کۆکن، لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورەو گوێڕایەڵی وتەی خوا ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾.

داوا لە خوای گەورە دەکەین هەموان دامەزراو بکات لەسەر گوێڕایەڵی‌و لەخواترسان، بمانگێڕێت بە دڵسۆز لە نیەتماندا، کردەوەکانمان چاک بکات، بمانگێڕێت بە سەربازێکی کارکەر بۆ بەرزکردنەوەی قورئانەکەی، درودو سڵاو لە گەورەمان موحەممەدو کەس‌و کارو هاوەڵانی.

واللّه أكبر ولله الحمد[1]

دوای واژۆکردنی ڕێکەوتنەکە، عومەر ڕێشاوی بووە بەرپرس‌و کەسی یەکەم، بەڵام لە واقیعدا ناوبراو تەنیا ڕووکارێك بوو، سەلاحەددین موحەممەد بەکردەوە بڕیاردەرو بەرپرسی یەکەمی کارەکەبوو[2]. بە مەبەستی تێکەڵاوکردنی کارو یەکخستنەوەی ڕێکخستنەکان، هەڵبژاردنێك بۆ دەستنیشانکردنی شوورای نوێ کرا، لەو هەڵبژاردنەدا لە هێڵی سدیق عەبدولعەزیز تەنیا (سدیق عەبدولعەزیزو موحەممەد ڕەئوف) بۆ شوورا هەڵبژێردران[3]. ئەندامانی هێڵەکەی تریش کە بوونە ئەندامی شوورا بریتی بوون لە: (عومەر ڕێشاوی، سەلاحەددین موحەممەد، ئەمین زەردۆیی، موحەممەد فەرەج، هادی عەلی، ئیبراهیم ڕێشاوی، سەید ئەحمەد، زوهێر خۆشناو).

هەندێك لەو بڕوایەدان، خودی ڕێکەوتنەکەو دەرنەچوونی ئەندامانی هێڵی سدیق عەبدولعەزیز لە هەڵبژاردنی شوورای نوێدا، جۆرێکە لە پلان‌و کاری نەخشە بۆکێشراوی هێڵی سەلاحەددین موحەممەد، لەو ڕووەوە نووسەری (هوشیارکردنەوەی هوشیاری)

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ( ٩).

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەولود باوەموراد)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٨؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (سدیق عەبدولعەزیز)، سلێمانی، ٢٠٠٥/١/٨.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

نووسیویەتی: " ئامانج لەم ڕێکەوتنە قۆستنەوەو لەباربردنی باڵی سدیق عەبدولعەزیز بوو، ئەو هەڵبژاردنەش کە ئەنجام درا تەنها ڕووکەش بوو"[1]. هەر دەربارەی هەڵبژاردنی شورای نوێ نووسەری (هاڵەکۆك) نووسیویەتی:" دواتر بڕیاردرا هەڵبژاردنێکی عادیلانە بکرێ، بەڵام وادەرنەچوو (ملابسات)و ژێر بەژێریەکانی ئەو هەڵبژاردنە بۆ خەڵکانی ئەو (کارەساتە) بەجێ دەهێڵم. جا ئەگەر توانیمان تەپوتۆزی سەر ئەو (فیتنە)یە نەتەکێنین چاکترە، شوێنەوارە سەلبیەکانی ئەو ڕێکەوتنە دواتر دەرکەوت"[2].

لە دوای ئەم ڕێکەوتنە، تا ڕاپەڕینی (ئازاری ١٩٩١) ئیخوان لەناو ئاوارەکان بە گەرمی کەوتە کارکردن، چالاکی ڕۆشنبیری‌و پەروەردەیی‌و خزمەتگوزارییان هەبوو. لەلایەن ژمارەیەك کادیری ئیخوان موسلمینەوە، کە پێشتر هێڵی سدیق عەبدولعەزیز بوون، لە ئۆردوگای جوانڕۆ (کۆمەڵەی ئەدەب دۆستانی ئۆردوگای جوانڕۆ)یان پێکهێناو گۆڤارێکیان بەناوی (گزنگ) دەرکرد، ئەم گۆڤارە بە چەند قۆناغێك تا ڕاپەڕینی (١٩٩١) بەردەوام بوو[3].

لە بواری خزمەتگوزاریشدا، لەساڵی (١٩٨٨)ەوە (یەکگرتوی ئیسلامیی کورد) وەکو ڕێکخراوێکی خێرخوازی دروستکرا[4]. ئەمەش گرۆتینێکی باشیدا بەکاری ئیخوان، چونکە ئەو ڕێکخراوە لەلایەن سەرکردایەتی ئیخوانەوە پشگیری‌و کۆمەکی دەکراو هەڵسوڕێنەرەکانیشی کادیرەکانی ئیخوان بوون.

ئەو ئەندامانەی ئیخوان، کە لە دوای هەڵمەتی دەستگیرکردنی بەعس‌و خۆنیشاندانی هەڵەبجە، لە باشووری کوردستان مابوونەوەو بەرەو ئێران نەڕۆیشتبوون، زانیارییەکی ئەوتۆیان دەربارەی یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی ئیخوان لە ئێران نەبوو، بە شێوەیەکی نهێنی لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بوون، هێڵی سدیق عەبدولعەزیز، لەو قۆناغەدا لەلایەن (نازم عەبدوڵڵاو دانا غەفوور) سەرپەرشتی دەکرا[5].

---

[1] صالح حکیم، ل١٠.

[2] هیوا، ل٣٨.

[3] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو کۆمەڵەیە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١٠٨ ـ ١١٤.

[4] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (موحەممەد ڕەئوف)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٦.

[5] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٥٩.

هێڵی سدیق عەبدولعەزیز، لە کۆبوونەوەی شوورا لە ( ئەیلولی ١٩٨٨)، بڕیاریاندابوو، جگە لە چەند کەسێکی کەم، تەواوی ئەندامانیان بگەڕێنەوە عێراق، لەو ماوەدا (غازی حەمەئەمین، تۆفیق کەریم، ئارام قادر) گەڕانەوە عێراق‌و لەپاڵ (نازم عەبدوڵڵاو دانا غەفوور) کەوتنە جموجۆڵ‌و چالاکی[١].

دوای یەکگرتنەکەش، ژمارەیەك ئەندامی هێڵی سەلاحەددین موحەممەد، گەڕابوونەوە باشووری کوردستان، بەڵام بە گوتەی نووسەری (هاڵەکۆك)، کە ئەودەمە لە هێڵی سدیق عەبدولعەزیز کاری کردووە، ئەو ئەندامانەی هێڵی سەلاحەددین موحەممەد، کە گەڕابوونەوە عێراق سیمای کاری ڕێکخراوەییان پێوە دیار نەبووە، تەنانەت حەزیشیان نەدەکرد باس‌و خواسێکی لەو جۆرە بە گوێیاندا بدرێ[٢]. ناوبراو درێژە بە باسەکەی دەدات‌و دەنووسێت: "چەند برایەکیشیان ڕایانگەیاندبوو دەبێت ئێمە لە پەرەپێدانی کاری ئیسلامیی دووربین، جا نازانم ئەو قسەیە بەعەمەلی وابوو یان مەبەستی چەواشەکردنی برایانی ئێمەبوو وەك تەکتیك"[٣].

نووسەری (هاڵەکۆك) لە برگەیەکی تردا، بەڵگە بۆ گومانەکەی دێنێتەوەو باس لەوە دەکات لە کاتی لێبوردنەکەی بەعس لە (تەمموزی ١٩٩٠) دا، عومەر ڕێشاوی‌و ئیبراهیم ڕێشاوی گەڕانەوە عێراق، هەر چەند عومەر ڕێشاوی وەکو دەمڕاستی ئیخوان ئەژمار دەکرا، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی بە یەکگرتنەکەی ئێران نەدا، تەنانەت هەوڵدرا بەرنامەیەکی دوولایەن دابنرێت، بەڵام ئەوان ئامادەییان نەبوو[٤].

سەبارەت بە چالاکی هێڵی سەلاحەددین موحەممەد، لەو ماوەداو لە باشووری کوردستان، هیچ زانیاریەکمان لەبەردەستدا نییە، بەڵام هێڵی سدیق عەبدولعەزیز هەر لە کارو چالاکی بەردەوام بوون، هەر چەندە چالاکییان سنووورداو کزو لاواز بوو، لیژنەی

---

[١] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٠.

[٢] هیوا، ل٣٩.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

[٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

قوتابیانو ڕۆشنبیریو داراییان پێکهێنا. لیژنەی قوتابیان چەند لیژنەی بچوکتری لەناو ئامادەییەکاندا دروستکرد[1]، لیژنەی ڕۆشنبیری بڵاوکراوەی (پەیام)یان دەرکرد[2].

لەو ماوەشدا، چەند ئەندامی ئەم باڵە لەلایەن دەزگاکانی بەعسەوە دەستگیرکرانو تووشی ئازارو ئەشکەنجە بوون، لەوانە (سەید ئیبراهیم) لە ڕانیە، (عەبدولواحید) لە باریکە، (ئوسامە، نەوزاد، عوسمان، حسێن، ئیبراهیم، مەحمود) لە سلێمانی[3].

---

[1] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٦١.

[2] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ستافو ناوەڕۆکی گۆڤارەکە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١٤٣ - ١٤٧.

[3] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٦٢.

## باسی یەکەم: بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق

### یەکەم: دروستبوونی

سەبارەت بە سەرەتای دروستبوونو دامەزرێنەرانی ئەم پارتە بۆچوونی جیاواز هەیە، دەربارەی سەرەتای دامەزراندنی، جگە لە (ئەحمەد عەبدوڵڵا دەلاك - حاجی مەهدی) کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئەم پارتەو سەرەتای بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم پارتە بۆ ساڵی (١٩٧٥ - ١٩٧٦ز) دەگێڕێتەوە[١]، سەرجەم سەرچاوەکان ساڵی (١٩٧٨ز) بە سەرەتای دامەزراندنی ئەم پارتە دادەنێن[٢]، ئەگەری ئەوە هەیە (ئەحمەد عەبدوڵڵا دەلاك) ویستی چەند کەسێك بۆ دروستکردنی ڕێکخستنێکی ئیسلامیی بە سەرەتای دامەزراندن بزانێت، بەڵام ئەم ویستە هەرگیز بە سەرەتای دامەزاندن دانانرێتو لەم ڕووەوە بۆچوونی دووەم بە بەهێزتر دەزانینو بەمەش ساڵی (١٩٧٨ز) دەبێتە سەرەتای دامەزراندنی ڕێکخستنی ئەم پارتە.

سەبارەت بە ناوی دامەزرێنەرانی ئەم پارتە، بەڵگەکان زانیاری ورد بەدەستەوە نادەن، ئەوانەی لەو پارتەدا کاریان کردووە لەپاڵ خۆیاندا ناوی کۆمەڵێك کەس دێنن، کە ڕۆڵیان لە دامەزراندنو قۆناغی کاری نهێنی ئەم پارتەدا بینیووە، لەم ڕووەوە (شێخ موحەممەد بەرزنجی) ناوی (مەلا موحەممەد خورماڵی، مەلا ئەحمەدی قازی[*]،

---

[١] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٧/٢/٢٠٠٥.

[٢] بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق، گۆڤاری بانگەوازی ئیسلامی، ژمارە(١) ساڵی یەکەم، کانوونی دووەمی ١٩٩٠ز، ل٢٧؛ موجز عن الحركة الإسلامية في كردستان، ل٢٣.

[*] مەلا ئەحمەدی قازی: ئەحمەد ڕەسوڵ حەمەد، ساڵی (١٩٣٠) لە گوندی (سەکتان)ی ناوچەی خۆشناوەتی لە دایك بووە، زانستی شەرعی خوێندووەو دوو جار مۆڵەتی زانستی وەرگرتووە، لە شۆڕشی ئەیلولدا دەبێتە قازی سەنگەسەر، لەسەر هەڵوێستی بوێرانەی چەند جارێك لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەعسەوە هەڕەشەی لێکراوە، سەرەنجام لە (١٩٨٦) لە وتاربێژی لایدەدەن، لە (١٢/١٠/٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: شەریف وەرزێر: مامۆستا ئەحمەدی قازی لە ئامێزی خزمەتکردنی ئیسلامو موسڵماناندا خەبات دژی عەلمانییەتی بەعسو نوچدانەدان لە بەرزڕاگرتنی شەرعی خوادا، کۆمەڵ، ژمارە (١١)، ٢٥/١٠/٢٠٠١.

عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، مەلا لەتیف پێنجوێنی*، مەلا عەلی بیارە، مەلا موحەممەد کونەفلوسی) ڕیزبەند دەکات[1]، بەڵام (ئەحمەد عەبدوڵڵا دەلاك) باسی ڕۆڵی (مەلا عوسمان مەردۆخی، عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، جەلال ئەحمەد ڕەشید، مەلا ئەحمەدی قازی) دەکات[2].

لەلایەکی ترەوە (عەلی باپیر) باس لەوە دەکات وێڕای خۆی ( عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، مەلا موحەممەد خورمالی، حەسەن حەمەخالید)و چەند کەسی تر تێیدا بەشدار بوون[3]، ناوبراو باس لەوەش دەکات کۆبوونەوەکان لە هەڵەبجە لەلایەن مەلا موحەممەد خورماڵی بەڕێوەدەبرا[4].

بۆچونێکی دیکە ئەوەیە، کە سەرەتای جموجۆڵی ئەم پارتە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی حەفتاکانو سەرەتای هەشتاکان، بزوێنەری ئەم جوڵانەوەیش عەبدوڕڕەحمان نەورەسی بوو، ناوبراو سکرتێری بەڕێوەبەری ئەوقافی سلێمانی بوو، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر مەلاو کەسایەتیی ئیسلامییدا هەبوو، لەو ڕێگەیەوە توانیبوی کاریگەرییان لەسەر دروست بکاتو ژمارەیەك لەوانە لە شێوەی کارێکی ڕێکخراوەیی زۆر سادەدا کۆبکاتەوە، لە سەرەتای کارەکەدا ئەندامە کاراکانیان بریتی

---

* مەلا لەتیف پێنجوێنی: لەتیف مەحمود، ساڵی (١٩٤٨) لە پێنجوێن لە دایك بووە، ساڵی (١٩٧٣) پەیمانگای ئیسلامیی تەواو کردووەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لە پێنجوێن دەبێتە مەلاو لە مزگەوتی (حاجی ڕەشید) قوتابخانەی (ئیمام غەزالی) بۆ زانستی شەرعی دەکاتەوە، دەیان قوتابی هەبووەو وانەی پێوتوون، لە (١٩٨٥/٧/١٣) دەچێتە شاخ، پاش ماوەیەك دەبێتە بەرپرسی ئەنجومەنی زانایان، لە (١٩٨٧/٨/١٨) لە گوندی (بۆسکان) بریندار دەکرێت، لەبەر سەختی برینەکەی ڕۆژی (١٩٨٧/٨/٢٩) کۆچی دوایی کرد، چەند دەستنووسی لە پاش جێماوەو بە چاپ نەگەیشتوون، لەوانە ( هیدایەت، بنەماڵەی پێغەمبەر، قورئان لە ئاوێنەی تەجویددا،...). لەگەڵ شەهیداندا، گۆڤاری دەنگی باوەڕ، ژمارە (٢، ٣)، تەمووز ـ ئاب ١٩٨٨، ل٤٣ ـ ٤٤.

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٢٣.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٥/٢/٢٧.

[3] لە: حوسێن محەمەد عەزیز: سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن، چاپی یەکەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی ٢٠٠٣، ل٤٦.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

بوون لە (عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، ئەحمەد عەبدوڵڵا دەلاك، حەسەن حەمەخالید، ئەسفەندیار - حەمەرەئوف، کەمال دۆڵپەمویی، شێخ عەبدوڕڕەحمان سەرگەڵویی، کامیل حاجی عەلی، عەبدولقادر برایەتی، مەلا سەلمان، موحەممەد هەولێری).

ئەگەر سەرنج لەو ناوانە بدەین، زۆربەی کادیرانی ئەم پارتە لە زانایانی ئایینین، ئەمەش تاڕادایەکی زۆر کاریگەری لەسەر ڕەوتی بزووتنەوەکە کردووەو وەکو بزوتنەوەیەکی زانایانی ئایینی دەرکەوتوە، لەلایەکی ترەوە، ئەم ڕێکخستنە زۆر سەرەتایی بووەو ڕێکخستنێکی ناوەندی نەبووە بە شێوەیەك کە هەموو ئەندامان لەسەر یەك شێوە بیرکردنەو دیدو تێڕوانینو کاری ڕێکخراوەیی کۆبکاتەوە، بەڵام ئەوەی هەموانی کۆکردبوویەوە پاشخانی هۆشیاری ئایینیو ستەمی بەعس بوو[1].

ئەم پارتە، دوای دامەزراندنی لە (١٩٧٨ز) بە نهێنی مایەوە، تا ژمارەیەك ئەندامیان چوونە شاخو لە (١٤/٩/١٩٨٤ز) بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی کوردستانی عێراق، بە فەرمی ڕاگەیەنرا* و شێخ موحەممەد بەرزنجی وەکو ڕابەر دەستنیشان کرا[2]. ئەمە بە سەرەتای قۆناغی کاری ئاشکرا لە مێژووی ئەو پارتەدا دادەنرێتو تا دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (١٩٨٧) بەردەوام بوو.

---

[1] حوسێن محەمەد عەزیز: هەمان سەرچاوە، ل٤٧.

* سەرەتا ناوی (پەیوەندی زانایانی کوردستان) بوون لەژێر ئەو ناوەدا توانیان خۆیان بە ئێرانییەکان بناسێنن، تا هاوکاری ئێران مسۆگەر بکەن، بەڵام دواتر لەگەڵ دروستبوونی مێژی سەربازی ناوی پارتەکە گۆڕا بۆ (بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق).

[2] موجز عن الحركة الإسلامية في كردستان العراق، ل٢٣؛ ئەرشیفی ڕۆژانی بەرگری، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (٤٠)، ٧/٩/٢٠٠٢. بە گوتەی یەکێك لە ئەندامانی بەشدار لە بزووتنەوەی پەیوەندی کە نەیویست ناوی لێرەدا ئاشکرا بکرێت، یەکەم شوورا کە لە کاتی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی پێکهات لە (١٢/٨/١٩٨٤) بوو نەك لە (١٤/٩/١٩٨٤) وەك پێشتر ئاماژەمان پێداوە، بەڵام بەڵگەی یەکلاکەرەوەمان لەبەردەستدا نییە کە ڕاستو دروستی ئەو بۆچوونانە بسەلمێنێت.

## دووەم: ڕەوشی ناوخۆو چالاکی ڕۆشنبیریو سەربازی بزووتنەوەی پەیوەندی

### ١- ڕەوشی ناوخۆ

هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، زۆربەی سەرکردەکانی ئەم پارتە زانایانی ئایینی بوون، ئەمەش لە قۆناغی ئاشکرادا گرفتی کارگێڕییو ڕامیارییی بۆ دروستکردو ئەو پارتەی بەرەو ڕووی ئاستەنگ کردەوەو لەو ڕووەوە کەموکورتی هەبوو[١]، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەم ئەزمونی سەرکردەکانی ئەو پارتە لە بواری ڕامیارییو کارگێڕیدا، چونکە لەو بوارەدا پێشنەیان نەبوو.

لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندی، شوورا پێکهات لە (عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، حاجی عەباس، مەلا لوقمان نەزیری[*]، عەقید، عەبدولجەبار، شێخ تاهیر عەبدولکەریم[**]، ئازاد عەزیز[***])، شوورا ئەم کارانەی ئەنجامدا:

أ- کردنەوەی قوتابخانەیەکی زانستە شەرعییەکان بە سەرپەرشتی عەبدوڕڕەحمان نەورەسی.

ب- خۆناساندن بە حزبە کوردییەکان.

ت- خۆناساندن بە حزبی دەعوەو ڕێکخراوی کاری ئیسلامییو ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراقو دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی حکومەتی ئێران.

---

[١] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٥٠.

[*] مەلا لوقمان نەزیری دواتر وازی لە بزووتنەوەی پەیوەندی هێنا، پارتێکی نوێی دروست کرد بەناوی (جوندوڵڵا)، بەڵام جوندوڵڵا هەر زوو پوکایەوە.

[**] شێخ تاهیر عەبدولکەریم، ساڵی (١٩٨٥) لە بۆردومانی شاری مەریوان لەلایەن فڕۆکەکانی حکومەتی عێراقەوە کوژرا.

[***] ئازاد عەزیز بەرزنجی، ساڵی (١٩٥٣) لە سلێمانی لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی تەواوکردووە، کادرێکی هەڵسووڕاوو بە توانا بوو، لە سەرەتای هەشتاکاندا چووە شاخ، لە بزووتنەوەی پەیوەندیدا بووە بەرپرسی نووسینگەی ڕاگەیاندن، لە ئەنجامی بۆردومانی شاری مەریوان لەلایەن فڕۆکەکانی عێراقەوە ڕۆژی (١٩٨٥/٣/٩) کوژرا. لەگەڵ شەهیداندا، گۆڤاری دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، کانوونی دووەمی ١٩٨٨، ل٤٥ ـ ٤٦.

پ- خۆناساندن بە جەماوەر.

ئەم پارتە تا ساڵی (١٩٨٧) سێ کۆنگرەی بەست، کۆنگرەی یەکەمی لە (١١ ئابی ١٩٨٥ن) بەستو تێیدا شێخ موحەممەد بەرزنجی بە ڕابەری گشتی هەڵبژێردرایەوە[١]، ناوبراو تا ساڵی (١٩٨٦) لەو پۆستەدا مایەوە، لەو ساڵەدا شێخ عەبدوللەتیف واژەیی (بەرزنجی)[*] چووە ئێرانو لە کۆنگرەی دووەمدا لە (٢ ئەیلولی ١٩٨٦ن) بە ڕابەری گشتی هەڵبژێردرا[٢]، لەو کۆنگرەدا (مەلا مەحمود ئازادی، ئەبوبەکر سدیقی) بە ئەندامی شووراو (مەلا عەلی بیارە) بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی هەڵبژێردران[٣]، هەر لەو کۆنگرەدا شێخ موحەممەد بەرزنجیو چەند کەسێکی تر بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی هەڵبژێردران[٤].

شوورای نوێ لە (١٢) کەس پێکهاتبوو، کە (٩) کەس لەو ئەندامانە مەلا بوون، هەر لەو کۆنگرەدا بڕیاردرا ئەم نووسینگانە دابنرێت:

أ- نووسینگەی کاروباری کۆمەڵایەتی

ب- نووسینگەی ڕێکخستن

---

[١] ئاوات کوێستانی: ئەرشیفی بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی بەرگری، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە(٦)، ٢٠٠١/٨/١٦.

[*] شێخ عەبدوللەتیف واژەیی: شێخ عەبدوللەتیف کوڕی شێخ عەبدوللا بەرزنجی، ساڵی (١٩٤٢) لە گوندی (کوڕەداوێ)ی شارباژێر لەدایك بووە، ساڵی (١٩٦٤) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو لەسەر خوێندن بەردەوام بووە، تا ساڵی (١٩٧٤) بڕوانامەی ماستەری لە (اصول الفقە) دا وەرگرتووە، نووسەرێکی بەتوانابووە، لە سەرەتای هەشتاکانەوە پەیوەندی بە بزووتنەوەی پەیوەندییەوە هەبووە، ساڵی (١٩٨٦) چووە شاخو بووە ڕابەری بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامییو تا ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەو پۆستەدا مایەوە، لە کۆنگرەی چوارەمو پێنجەمو شەشەمی بزووتنەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی هەڵبژێردراوەتەوە، لە (١٩٩٣/٦/٢١) لە ڕێگەی نێوان مهابادو بۆکان بە کارەساتی ئۆتومبیل گیانی سپارد. بڕوانە: پەیڤێك لە ژیانو خەباتی مامۆستا شێخ عبداللطیف بەرزنجی، ئا: ڕێگای یەکبوون، ڕۆژنامەی ڕێگای یەکبوون، ژمارە (٦٩)، ساڵی یەکەم، ٢٠٠٠/٧/٣.

[٢] ئەبوبەکری سدیقی: ڕۆژژمێری (١٩٨٦).

[٣] ئاوات کوێستانی: ئەرشیفی بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی بەرگری، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (٤)، ٢٠٠١/٧/١٩.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (شێخ موحەممەد بەرزنجی)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٢٣.

ت- نووسینگەی پەیوەندییەکان

پ- نووسینگەی ئیدارەو مالیە

ج- نووسینگەی ڕاگەیاندن

هەر لە کۆنگرەدا وەفدێك پێکهێنرا لە (مەلا عەلی بیارە، عەبدوڕڕەحمان نەورەسی، مەلا لوقمان نەزیری، عەقید، بەختیار، نافع، عەبدولکەریم خاکی)و بە مەبەستی وتوێژکردن لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان نێردران بۆ نەغەدە، وەفدی ناوبراو لەلایەن نوێنەری (مرکز بزرگ اسلامی)و مەکتەبی مونتەزیریو بەرپرسی قەرارگاو ئەحمەد کەریم بەرپرسی میحوەری مەریوان پێشوازییان لێکراو بیروڕایان گۆڕییەوەو لەسەر چەند خاڵێك پێکهاتن کە ئەوانیش بریتی بوون لە:

١- بزووتنەوەی پەیوەندی خۆی میحوەری شەڕو بەرەنگاربوونەوەی حکومەتی عێراق دەستنیشان بکات.

٢- ئەو کۆمەکیانەی (ئازووقە، پارە، چەكو تەقەمەنی) لە لایەن ئێرانەوە دەدرێتە بزووتنەوەی پەیوەندی، پەیوەندی خۆی بەسەر ئەندامەکانیدا دابەشی دەکاتو ئێران دەستی تێوەرنادات.

٣- بزووتنەوەی پەیوەندی پاسدارو چەکداری ئێران لەگەڵ خۆی نابات بۆ بەشداری شەڕ، مەگەر لەسەر خواستی بزووتنەوەی پەیوەندی داوای چەکار بکرێت لە کاتی پێویستدا.

٤- بزووتنەوەی پەیوەندی جێگای مەشقی سەربازی بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن*.

کۆنگرەی سێیەمی بزووتنەوەی پەیوەندی لە (کانوونی دووەمی ١٩٨٧) بەستراو تێیدا وێڕای پەسەندکردنی پەیڕەوو پڕۆگرامی ناوخۆ، ئەنجومەنی باڵای شوورا هەڵبژێردراو پێکهاتبوو لە:

---

* لە دوای کۆبوونەوەکە، ئێرانییەکان بەجیا لەگەڵ مەلا عەلی بیارەو عەبدوڕڕەحمان نەورەسیو مەلا لوقمان نەزیری کۆدەبنەوە، هەرچەندە ناوەڕۆکی کۆبوونەوەکە بە نهێنی ماوەتەوە، بەڵام دواتر مەلا لوقمان لە کاتی گەڕانەوەدا بە هاوڕێکانی وتووە: ئێرانییەکان درۆمان لەگەڵدا دەکەنو ئەو بەڵێنانەی پێیان داوین جێبەجێی ناکەن.

- شێخ عەبدوللەتیف واژەیی ( ڕابەری گشتی)

- مەلا عەلی بیارە (جێگری ڕابەری گشتی)

- مەلا مەحمود ئازادی (ئەندام)

- موحەممەد ڕازی (ئەندام)

- شێخ ئەنوەر تۆفیق بادینانی(ئەندام)[1]

**٢- چالاکی ڕۆشنبیری و سەربازی**

بزووتنەوەی پەیوەندی، هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنیەوە کەوتە نواندنی چالاکی ڕۆشنبیری، نووسینگەی ڕاگەیاندن دامەزرێنراو گۆڤاری (ئاسۆی ئیسلام)ی دەرکرد[2]، ئەم گۆڤارە وێڕای ڕاڤەی قورئان و فەرمودە گرنگی بەبابەتی ڕامیاری داوە و لەو بارەوە چەند وتارێکی نووسیوە، هاوکات بابەتی ئەدەبی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و تایبەت بە ئافرەتانی لەخۆگرتوەو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی پارتەکەی بڵاوکردۆتەوە[3].

ئەم پارتە، لە شارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کۆڕو سیمیناری تایبەتی ڕامیاری و جەماوەری سازداوە و لە بۆنە جیاوازەکاندا ئاهەنگی تایبەتی گێڕاوە[4].

لە ڕووی سەربازییەوە، بە گوتەی (عەلی باپیر) ئەم پارتە هەر لە سەرەتای کاری ڕێکخراوەیدا بڕوای بە چەك هەبووە، پێیان وابووە هەر ڕێکخراوێکی ئیسلامیی لە دژی بەعس کار بکات پێویستی بە هێز هەیە[5]، بەڵام بە شێوەیەکی کردەیی لە

---

[1] أخبار كردستان، مجلة ئالای ئیسلام، العدد (٥)، السنة (١) شباط - ازار ١٩٨٧، ل٢٥.

[2] مەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٤٤.

[3] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەڕۆك و گرنگی گۆڤاری (ئاسۆی ئیسلام) بڕوانە: مەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٤٤ - ٤٩.

[4] ژمارە (٢)ی گۆڤاری (ئاسۆی ئیسلام) زمانحاڵی بزووتنەوەی پەیوەندی نووسیویەتی: "لە ڕۆژی ٧ی ڕەمەزانی ١٤٠٥ ڕێکەوتی ١٩٨٥/٥/٢٨ کۆڕێکی موسوڵمانانە بەبۆنەی بیرەوەری شەهیدبوونی مامۆستای شەهید سەید قطب سازکرا کەلەم کۆڕەدا مامۆستای تێکۆشەر شێخ محمد بەرزنجی ووتارێکی گرنگی تیا پێشکەشکرد". بڕوانە: کاسێتی هەواڵەکان، ژمارە (٢)ساڵی دووەم، ١٤٠٥ ك / ١٩٨٥ز، ل٩.

[5] حوسێن محەمەد عەزیز: هەمان سەرچاوە، ل٤٦.

(١٩٨٥/٩/١٤ن) باڵی سەربازی ئەم پارتە پێکهێنرا، کە بە (لەشکری قورئان) ناوزەد دەکرێتو مەلا عەلی بیارە بەرپرسی ئەم باڵە سەربازییە بوو[1]، لەشکری قورئان بەسەر چوار هێزدا بەم شێوەیە دابەش کرا:

- هێزی خالید بۆ ناوچەی پێنجوێنو شارباژێڕو سلێمانی.
- هێزی سەلاحەددین بۆ ناوچەی هەورامانو هەڵەبجەو شارەزوورو گەرمیان.
- هێزی شافعی بۆ ناوچەی هەولێر.
- هێزی فارووق بۆ قەرەداغو کەرکووك[2].

ئەم پارتە، دوای پێکهێنانی لەشکری قورئان چەند بارەگایەکی کردەوە، بارەگای سەرەکی لە گوندی (بۆسکان)ی شارباژێر بوو، هاوکات بارەگا لە (مەلەکان، براله) دانرا[3]، هەروەها بارەگایەکیان لە گوندی (بێتوش) نزیك ناوچەی سەردەشت دانا، ئەم بارەگایە لە (١٢ ئەیلولی ١٩٨٦) لابرا[4]. لەو ناوچانەوە کەوتنە ئەنجامدانی چالاکی سەربازی دژی حکومەتی عێراق. بۆ نمونە لەمانگی ئایاری (١٩٨٧) پێشمەرگەکانی بزووتنەوەی پەیوەندی لەناوچەی هەولێر چەند چالاکییەکی سەربازییان ئەنجامداو گورزی کاریگەریان لە بەعس وەشاند[5].

لەگەڵ بەهێزبوونی بزووتنەوەی پەیوەندی، ناردنی مەفرەزەی پێشمەرگە بۆ ناوچە جۆربەجۆرەکان زیادیکرد، ئەو مەفرەزانە وێڕای کاری سەربازی، ئەرکێکی دیکەیان بەجێدەهێنا، کە کاری جەماوەریو ناساندنی بزووتنەوەی پەیوەندی بوو بە جەماوەرو هۆشیارکردنەوەی خەڵکی لە ستەمکاری بەعسو هاندانیان بۆ بەشداریکردنو پشتگیریکردنی خەباتی چەکداری ئیسلامیی، لەو بارەوە ئەبوبەکری سدیقی

---

[1] ئەرشیفی ڕۆژانی بەرگری، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (٤٠)، ٢٠٠٢/٩/٧.

[2] باوکی ئوسامە: بزووتنەوەی ئیسلامیی واجبێکی شەرعیو زەرورەتێکی واقعیە، بەشی سێیەم، گۆڤاری جەماوەر، ژمارە (٣٩)، ٢٥ ئاب ١٩٩٥، ل١٤.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (شێخ موحەممەد بەرزنجی)، سلێمانی، ٢٠٠٤/١٢/٢٣.

[4] ئەبوبەکری سدیقی: ڕۆژژمێری (١٩٨٦).

[5] مجلة ئالای ئیسلام، العدد (٦)، السنة الأولى، آيار ١٩٨٧، ل٥.

نووسیویەتی: "لە (١٥ حوزەیرانی ١٩٨٧) ژمارەیەك پێشمەرگەی لەشکری قورئان گەشتێکیان بۆ ناوچەی کۆیە دەستپێکرد، ئەم گەشتە نزیکەی مانگێکی خایاندو لە (١٥ تەمموزی ١٩٨٧) گەیشتنەوە (مەلەکان)، لە گەشتەکەدا گوندەکانی ( سوسێ، گۆمەشین، هەواری شاخەپیسکە، هەواری بایزاغا، سماقە، ئۆمەرگومەت، کانی ڕەش، ئەسکەندەر بەگی، مامەڵیسی) بەسەرکرایەوەو گوندنشینەکان کۆدەکرانەوەو قسەیان بۆ دەکرا"[1].

## سێیەم: پەیوەندییەکانی بزووتنەوەی پەیوەندی

لەسەر ئاستی ناوخۆی کوردستان، بە گوتەی شێخ موحەمەد بەرزنجی لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی هەبوو[2]، لەو بارەوە (ئەبوبەکری سدیقی) لە ڕۆژمێرەکەیدا نووسیویەتی: "ڕۆژی (٩ ئاب ١٩٨٦) چونەتە گوندی ئەشکان بۆ سەردانی یەکێتیی". هەروەها نووسیویەتی: " لە (٢١ تشرینی یەکەمی ١٩٨٦) جەلال تاڵەبانی هاتۆتە سنەو لەگەڵ شێخ موحەممەد بەرزنجیو مەلا عەلی بیارە کۆبونەتەوەو لە نێوانیاندا ڕێکەوتن بەسترا"[3]. هەروەها ڕۆژی (٢٨ شوباتی ١٩٨٧) سەکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی نامەیەکی ناردوە بۆ بزووتنەوەی پەیوەندی، کە تێیدا یەکێتیی نیشتمانیی بە فەرمی دانینا بە بزووتنەوەی پەیوەندیدا[4]. دیارە بەر لەو مێژووە ناکۆکی کەوتبووە نێوان یەکێتییو بزووتنەوەی پەیوەندی، چونکە لە ساڵی (١٩٨٦) مەفرەزەیەکی پەیوەندی کەوتە بەردەم هێرشی یەکێتییو (٣) کوژراوو چەند بریندارێکیان هەبوو[5].

سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ پارتە کوردستانییەکانی تر، تەنها زانیاری ئەوە لەبەردەستدایە کە ڕۆژی (٢ ئەیلولی ١٩٨٦) لەگەڵ (دکتۆر عەلی کوێت) نوێنەری حزبی

---

[1] ڕۆژمێری (١٩٨٧).

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٣/١٢/٢٠٠٤.

[3] ڕۆژمێری (١٩٨٦).

[4] ئەبوبەکری سدیقی: ڕۆژمێری (١٩٨٧).

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ١٧/٨/٢٠٠٥.

سۆسیالست وتوێژکراوە دەربارەی پەیوەندییان لەگەڵ بزووتنەوەی پەیوەندی[1]. جگە لە یەکێتیی‌و سۆسیالیست زانیاری ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە، کە بزووتنەوەی پەیوەندی لەگەڵ پارتەکانی دیکەی کوردستان پەیوەندی هەبووبێت.

لەسەر ئاستی دەرەوە، ئەم پارتە پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ ئێران هەبوو، لەلایەن ئەو وڵاتەوە کۆمەکی دەکرا[2]، هەندێك جاریش ئەم پەیوەندیانە تووشی ئاڵۆزی هاتووە*. لە ساڵی (١٩٨٢)ەوە ئێران پرۆژەی کۆکردنەوەی ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامیی عێراقی بنیادنا، بۆ ئەو مەبەستە ( ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق) پێکهێنا، سەرجەم ڕەوتە ئیسلامییە عێراقییەکان تێیدا بوونە ئەندام[3]، کاتێك بزووتنەوەی پەیوەندی ڕاگەیەنرا لەم ئەنجومەنەدا بووە ئەندام‌و بە پێنج نوێنەر بەشداری کرد[4]، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ توندوتۆڵی پەیوەندی ئێران‌و ئەو پارتە لەلایەك‌و لەلایەکی ترەوە پەیوەندی توندوتۆڵی بە پارتە ئیسلامییە ئۆپۆزسیۆنەکانەوە.

---

[1] ئەبوبەکری سدیقی: ڕۆژژمێری (١٩٨٦).

[2] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٥٠.

* شێخ موحەممەد بەرزنجی هەڵوێستی بەرانبەر ئێرانییەکان نەرم بوو، بۆیە لە ماوەی رابەرایەتی ئەودا تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندی نێوان ئێران‌و بزووتنەوەی پەیوەندی باش بوو، بەڵام لە سەردەمی رابەرایەتی شێخ عەبدوللەتیف واژەیی، پەیوەندییەکان تا رادەیەك ئاڵۆزو ناجۆر بوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە رابەری نوێ زۆر بەدەم ئێرانییەکانەوەو ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی عێراقەوە نەدەچوو. بە بۆنەی سەردانێکی باقر ئەلحەکیم بۆ شاری سنە ئاهەنگێکی ڕێزلێنان سازدرا، شێخ عەبدوللەتیف وتارێکی بەو بۆنەیەوە خوێندەوە، بەڵام ناوبراو لە وتارەکەیدا بەخێرهاتنی باقر ئەلحەکیمی نەکردو هیچ ئاماژەیەکیشی بەو مەسەلەیە نەدا، لە دوای ئەم ڕووداوە گۆڕانێك لە هەڵوێستی ئێران بەرانبەر پەیوەندی بەدیدەکرا، تەنانەت شورای زانایانی کوردستان کە بەدەست بزووتنەوەی پەیوەندییەوە بوو، ئێران لە ژێر دەستی پەیوەندی دەرکردو کردیە کەناڵێك بۆ دژایەتی بزووتنەوەی پەیوەندی.

[3] محمد نوری بازیانی: هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

[4] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی پێنجەم، ل٦.

## باسی دووەم: لەشکری ئیسلامیی کورد

### یەکەم: دروستبوونو دیدو تێڕوانینی

لەشکری ئیسلامیی کورد، یەکەم پارتی ئیسلامیی ئاشکرای چەکدارە لە باشووری کوردستان، دەربارەی ساڵی دامەزراندنی ئەم پارتە دوو بۆچوون هەیە، هەندێ لە توێژەران ساڵی (١٩٨٠ن) بە ساڵی دامەزراندنی ئەم پارتە دادەنێن[١]، بەڵام بۆچوونی دووەم سەرەتای (شوباتی ١٩٨١) بە کاتی دامەزراندن دادەنێت[٢]، بەو پێیەی هەڵگری بۆچوونی دووەم لەو کاتەدا لە کوردستان ژیاوەو هاوکات خۆی لە ڕووداوەکاندا بەشداربوەو لە نزیکەوە ئاگادارە، بۆیە بۆچوونەکەی ئەو بە وردتر دەزانینو دەربارەی کاتی دامەزراندنی لەشکری ئیسلامیی کورد لەگەڵیدا هاوڕاین.

بە گوتەی (نەوشیروان مستەفا ئەمین) ئەم ڕێکخراوە بە کۆمەکیو بەرنامەی ئێران لە تاران ڕاگەیەنراو دامەزرێنەرانی بریتی بوون لە (عەباس شەبەك، شێخ قادر سۆتکەیی، مەلا حسێن مارۆنسی)، کەسی یەکەمی ئەم پارتە (عەباس شەبەك) بوو، ناوبراو ماوەیەك ئەندامی ئیخوان موسلمین بووە، پاشان بۆتە پێشمەرگەو دواتریش لە سەردانی لیبیاو سوریاو سعودیەدا دۆستایەتی لەگەڵ سەرانی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران پەیدا کرد[٣].

بەڵام بە بڕوای (مەسعود عەبدولخالق)، لەشکری ئیسلامیی، بە پلەی یەکەم لە ژێر کاریگەری لیبیادا بوو، چونکە (موعەمەر قەزافی) لەو کاتەدا بە شۆڕشی ئێران سەراسیمە بوو، لەلایەکی ترەوە ناوبراو هەر لە زووەوە سۆزێکی بەرامبەر کورد هەبوو، زۆرجار کۆمەکی بۆ پارتە کوردستانییەکان دەنارد، دەرەنجامی ئەوە قەزافی دەیویست بزووتنەوەیەك لە کوردستان دروست بکات[٤].

---

[١] جەمال نەبەز: بێدەسەڵاتە کوردەکانو برا موسڵمانەکانیان، وەرگێڕانی: تایەر حەمەمین، چاپی یەکەم، سلێمانی ١٩٩٨، ل١٣٢؛ مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٤٩.

[٢] پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، چاپی سێیەم، سلێمانی ١٩٩٨، ل٢٠١.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠١.

[٤] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٧.

به بڕوای ئێمه، کۆمەکی لیبیاو ڕێنمایی ئێران ڕۆڵی ڕاستەوخۆی لە دروستکردنی لەشکری ئیسلامیی کورد بینیو لەلایەن هەردولاوە کۆمەکیو پشتگیری دەکرا، لیبیا چەكو تەقەمەنی پێدا، ئێرانیش وێڕای کۆمەکی ماددی لە ڕووی سیاسییەوە کارئاسانی زۆری بۆ کرد.

ئەم پارتە، پێکهاتەیەکی ناجۆرو پێکەوە نەگونجاوی هەبوو، لەسەرەتادا لەسەر بنەمای بەرژەوەندیو بە هاندانی ئێران دامەزرا، هیچ بنەمایەکی ئایدۆلۆژیو ڕێکخراوەیی لە پشت دامەزراندنی ئەم پارتەوە نەبوو، بەمەش ببوە نموونەی پارتی بێ دسپلین[1].

ئەم پارتە، لە ماوەیەکی کەمدا توانی ژمارەیەکی زۆر چەکدار لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو چەندین بارەگا بکاتەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوگ (امتیاز)انەی دەدرایە هەر چەکدارێك کە بریتی بوو لە:

- پارەی مانگانەی ئەدرایە.

- چەکی نوێی ئەدرایە.

- ئەیتوانی ماڵو خێزانەکەی ببات بۆ ئێرانو خۆیشی بە ئازادی لەسەرانسەری ئێراندا بسوڕێتەوە.

- ئەیتوانی شەڕی حکومەتی عێراق نەکات[2].

دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین، کە بەشێکی لەشکری ئیسلامیی پێکهاتبوو لە خەڵکی پارتە کوردستانییەکانی تر کە ناردبویاننە ناو لەشکری ئیسلامیی، تا لەوێ بژینو لە کاتی پێویست سودیان لێوەرگرن[3]. ئەمەش لەپاڵ ئەو جیاوگانەی پێشمەرگەی لەشکری ئیسلامیی هەیبوو بووە هۆکارێکی گەشەکردنی خێرای پارتی ناوبراو لە ڕووی چەندێتییەوە بێ چۆنییەتی.

---

[1] مجموعـة مـن البـاحثين: رؤى في مسـار العمـل الإسـلامي في كوردسـتان، ل٤٩؛ فـاتح كريكـار: هـەمان سەرچاوە، ل٤٤.

[2] نەوشیروان مستەفا ئەمین: هەمان سەرچاوە، ل٢٠٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٢؛چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەسعود عەبدولخالق)، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٧.

سەبارەت بە دیدو تێڕوانینی لەشکری ئیسلامیی کورد، لە (سبیل المؤمنین)ی بڵاوکراوەی تایبەتی پارتی ناوبراودا هاتووە: "لە ئامانجەکانی لەشکری ئیسلامیی کورد یەکێتی کوردانە لەنێو یەکێتی موسوڵمانا ئەویش بە سەلماندنی ئەو مافانەی کە ئیسلام بۆ کوردو ئەوانی تریشی مسۆگەر کرووە. ئەو مافەی کە برا مسوڵمانە عەرەبو تورکو فارسەکان پێی شادن"[1]، لە بڕگەیەکی تردا هاتووە: " هەروەك چۆن ئەو برایانە فەرمان ڕەوان لە نیشتمانی خۆیاندا پێویستە کوردیش سەروەری نیشتمانەکەی خۆی بێت"[2].

گومانی تیا نییە ئەم ئامانجانە گەلێك دروستو پیرۆزن، بەڵام ئاخۆ پارتێك کە هەر لە سەرەتاوە لە لایەن وڵاتێکی نەیار بەم خواستانەوە کۆمەکیو هاوکاری دامەزراندنی کرابێت، دەتوانێت لە بەرژەوەندی ئەو وڵاتە دەربچێت؟! لەشکری ئیسلامیی کەوتۆتە نێوان ئەو بەرداشەوە، سەرەنجامیش ئەو خواستانەی نەهێنایەدیو هەڵوەشایەوە.

---

[1] لە: جەمال نەبەز: هەمان سەرچاوە، ل١٣٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣ ـ ١٣٤.

## دووەم: پەیوەندییەکانی لەشکری ئیسلامیی کورد

### ١ - پەیوەندییەکانی لە ئاستی کوردستاندا

لەشکری ئیسلامیی لە تاران دامەزرا، پاشان لە سێ ناوچە (بەری مەرگە، سەرگەڵو، حاجی مامەندە) بارەگایان دانابوو[١]، هەر لە سەرەتای کارکردنیانەوە زۆربەی پارتە کوردستانییەکان خەڵکی خۆیان ناردبووە ناو لەشکری ئیسلامییەوە، هەر لەو سەروبەندەدا ئێران داوای لە یەکێتیی نیشتمانیی کرد، کە کارئاسانی بۆ لەشکری ئیسلامیی بکات، لە بەرامبەریشدا ئێران کارئاسانی بۆ یەکێتیی دەکات، بەگوتەی (نەوشیروان مستەفا ئەمین) لەشکری ئیسلامیی بەڵێنیان بە یەکێتیی دابوو کاتێك هاتنە ناوچەکە:

- دەست نەخەنە ناو کاروباری خەڵك.
- دوژمنانی یەکێتیی‌و کەسانی گومانلێکراو لە ڕیزەکانی خۆیاندا وەرنەگرن.
- یارمەتی یەکێتیی بدەن بۆ گوێزانەوەی چەك[٢].

عەباس شەبەك پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەبوو، لەسەر ئەمانەتی ئەو هاتنە کوردستان. (مەسعود عەبدولخالق) کە لەو کاتەدا کارگێڕی لقی (١)ی یەکێتیی بووە، بە ناوی جەلال تاڵەبانییەوە چۆتە لای لەشکری ئیسلامیی‌و لە دیدارێکدا عەباس شەبەك پێی وتووە: "ئێمە لەشکری ئیسلامیمان لەسەر ئەمانەتی مام جەلال نارده کوردستان، ئێوەش ئاگاتان لێیان بێت"[٣].

ئەم پەیوەندیانە، تا سەر بەو شێوە نەمایەوە، ناکۆکی کەوتە نێوان یەکێتیی‌و لەشکری ئیسلامیی، کۆتاییەکەشی بەشەڕهاتنی هەردولاو نەمانی لەشکری ئیسلامیی لەسەر شانۆی ڕامیاریی لێکەوتەوە[*].

---

[١] نەوشیروان مستەفا ئەمین: هەمان سەرچاوە، ل٢٦٣.

[٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٢.

[٣] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٧.

[*] لە کۆتای ئەم باسەدا بە درێژی باس لە شەڕی نێوانیان‌و پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی لەشکری ئیسلامیی دەکەین.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان لەشکری ئیسلامیی‌و حزبی سۆسیالیست، هەڵکشان‌و داکشانی بەخۆوە دیوە، بەواتایەکی تر هەندێ جار پەیوەندییەکە دۆستانە بوەو هەندێ جاریش دوژمنکارانە. دەکرێت ئەو نامەیەی ڕۆژی (١٩٨١/٨/٢١) لەلایەن لەشکری ئیسلامییەوە ئاراستەی حزبی سۆسیالیست کراوە، تێیدا داوای لێبوردن لە سۆسیالیست دەکەن، چونکە نەیانتوانیوە پسوڵە بۆ چەند پێشمەرگەیەکیان بکەن تا پێی بچنە ئێران، بە نموونەی پەیوەندی دۆستانە دابنێین، چونکە ناگونجێت ئەگەر پەیوەندی دۆستانەیان نەبووبێت ئەو داوایەیان لێبکردنایە[١]. بە هەمان شێوە لە دوو نامەی تری لەشکری ئیسلامیی بۆ حزبی سۆسیالیست، ناکۆکی‌و ئاڵۆزی نێوان هەردو پارتی ناوبراودا بە شێوەیەك دەردەکەوێت کار گەیشتۆتە ڕادەی چەککردن‌و هەڵکوتانە سەر بارەگای لەشکری ئیسلامیی[٢].

### ٢ - پەیوەندییەکان لە ئاستی دەرەوەدا

هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەشکری ئیسلامیی لە ژێر ڕێنمایی‌و بە کۆمەك‌و هاوکاری ئێران دامەزرا، لە تەواوی هەڵوێست‌و چالاکیدا کەوتبوە ژێر هەژمونی ئێران، بەدرێژایی تەمەنی ئەو پارتە نەیتوانی خۆی لە پاشکۆیەتی ئێران ڕزگار بکات، بە بڕوای هەندێ نووسەر ڕۆڵی ئێران هێندە کاریگەر بووە، کە دواتر لە ژێر فشاری ئێراندا ئەم پارتە هەڵوەشایەوە[٣].

---

[١] محمد حاجی محمود: ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەك، بەرگی دووەم، ب. ش، ب.م، ل٤٦٨.

[٢] نامەی یەکەمیان ڕۆژی (١٩٨٢/٦/٢٣) لەلایەن مەکتەبی عەسکەری لەشکری ئیسلامیی نێردراوە بۆ حزبی سۆسیالیست، تێیدا وێڕای گلەیی دەربارەی چەککردن‌و تەقەکردن لە چەکدارەکانی لەشکر، ئامادەیی لەشکر بۆ گفتوگۆو وتوێژ نیشان دەدات. بڕوانە: محمد حاجی محمود: هەمان سەرچاوە، بەرگی دووەم، ل٥١٦. نامەی دووەمیان ڕۆژی (١٩٨٢/١١/١٥) لەلایەن شێخ قادر نێرراوە بۆ موحەممەد حاجی مەحمودو گلەیی ئەوەی لێدەکات لە کاتێکدا ئەوان هیچ دوژمنایەتیەکیان لە نێواندا نەبووە، بەڵام بارەگای لەشکری ئیسلامیی لە پەرخ لەلایەن سۆسیالیستەوە ڕوتکراوەتەوە، هەروەها باس لەوە دەکات کە نێردراوی خۆی ناردوە تا لەو بارەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکات. بڕوانە: محمد حاجی محمود: هەمان سەرچاوە، بەرگی‌دووەم، ل٥٥٩.

[٣] جەمال نەبەز: هەمان سەرچاوە، ل١٣٢.

لەلایەکی ترەوە، ئەم پارتە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ لیبیا هەبوو، لەلایەن ئەو وڵاتەوە کۆمەکی دارایی‌و چەك‌و تەقەمەنی دەکرا، موعەممەر قەزافی سەرۆکی لیبیا، لە وکاتەدا بە شۆڕشی ئیسلامیی ئێران کاریگەر بوو، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵدا دامەزراندبوو، لەشکری ئیسلامیی سوودی لەم پەیوەندییە بینی‌و لەلایەن لیبیاوە ژمارەیەکی بەرچاو چەك‌و تەقەمەنی درایە[1].

## سێیەم: هەڵوەشاندنەوەی لەشکری ئیسلامیی

دوای ئەوەی لەشکری ئیسلامیی لە چەند ناوچەیەك بارەگایان دانا، کەوتنە جموجۆڵ‌و چالاکی، ئەو ناوچانەش کە ئەوان بارەگایان لێدانا پێگەی جموجۆڵی یەکێتیی بوو، بە گوتەی ( نەوشیروان مستەفا ئەمین) دوای ئەوەی لەشکری ئیسلامیی جێ پێی خۆیان لە ناوچەکەدا کردەوە، وەکو حوکمڕان مامەڵەیان دەکرد، ئەم کارەیان بە دنەدانی ئێران بوو[2]، ئەم حاڵەتە وای لە یەکێتیی کرد بڕیاری چەککردنیان بدات، ئەم بڕیارە لە (تەمموزی ١٩٨٢) جێبەجێ کرا، هێرشکرایە سەر بارەگاکانی لەشکری ئیسلامیی، دوای ئەوەی بەرگرییەکی کەمیان کرد، دەست بەسەر تەواوی بارەگاکانیاندا گیرا[3].

ئەم تێکشکانەی لەشکری ئیسلامیی هێندە کاریگەر بوو، کە جارێکی دی نەیتوانی هەڵسێتەوەو چیتر ئەو پارتە لەسەر شانۆی ڕامیاری کوردستان چالاکی نەماو هەڵوەشایەوە[4].

---

[1] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي في كوردستان، ل٥٠.

[2] پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل٢٦٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٣؛ مەحمود سەنگاوی: بیرەوەرییەکانی سەنگاوی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠٤، ل١٥٢. لەشکری ئیسلامیی لەو شەڕانەدا زیانی گەورەی لێکەوت، مەحمود سەنگاوی باس لە قۆڵێکی شەڕەکە دەکات کە خۆی تێیدا بەشدار بووە، یەکێتیی (٢٣) مزەل‌و (٨٠) کلاشینکۆفی یەك لاق‌و (١٠) ژێرسەی دەسکەوت هەبوو. بیرەوەرییەکانی سەنگاوی، ل١٥٣.

[4] نەوشیروان مستەفا ئەمین: هەمان سەرچاوە، ل٢٦٣. هەر چەندە لەشکری ئیسلامیی بە شێوەیەکی فەرمی تا ساڵی (١٩٨٩) لەکارکردن بەردەوام بوو، بەڵام دەتوانین ساڵی (١٩٨٢)و تێکشکانی لە بەرامبەر یەکێتیی بە کۆتایی کردەیی ئەو پارتە دابنێین. فاتح کریکار: هەمان سەرچاوە، ل٤٥.

وێڕای ئەوەی باسکرا، بۆچوونی ئەوە هەیە، کە تێکچونی پەیوەندی نێوان لەشکری ئیسلامیی‌و ئێران هۆکاری بنەڕەتی هەڵوەشاندنەوەی بێت، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ داننەنانی ئێران بە کوردا، وەکو گەلێکی خاوەن زمان‌و مێژوو خاك، هاوکات لەشکری ئیسلامیی ئامادەنەبوو شان بەشانی سوپای ئێران شەڕی حکومەتی عێراق بکات، ئەمە سەرباری ئەوەی دوای دروستکردنی (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق) لە لایەن ئێرانەوە، لەشکری ئیسلامیی ئەوەی ڕەتکردەوە کە داکۆکی لەو ئەنجومەنە بکات[1].

بە بڕوای ئێمە، تێکچوونی پەیوەندی لەگەڵ ئێران، وەکو هۆکارێکی ڕامیاریی‌و تێکشکانی سەربازی لە بەرامبەر یەکێتیی، پێکەوە‌و شان بە شانی یەك بوونە هۆکاری هەڵوەشاندنەوە‌و پووکانەوەی لەشکری ئیسلامیی.

سەرهەڵدان‌و تێکشکانی لەشکری ئیسلامیی کورد، کاریگەری خۆی لە گۆڕەپانی کوردستاندا جێهێشت کە بریتی بوو لە:

١ـ سەرهەڵدانی لەشکری ئیسلامیی، ئەو بۆچوونەی لای بەشێکی ڕەوتی ئیسلامیی دروستکرد، کە دەگونجێت لەگەڵ بوونی چەند پارتی عەلمانی کوردی، پارتی ئیسلامیی چەکداریش هەبێت[2]. هاوکات کۆمەڵێکی تر پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیان لە مێشکدا چەسپا.

٢ـ سەرهەڵدانی لەشکری ئیسلامیی، مەفهومێکی وای لەناو خەڵکیدا چەسپاند، کە ئەوەی بەناوی ئیسلامەوە کار دەکات پیاوی دەرەوەیە‌و کرێگرتەیە، ئەمەش کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ئەو بزووتنەوە ئیسلامییە چەکدارییانەی دواتر دروست بوون، پێویستییان بە کاری زۆر بوو تا ئەو گومان‌و تۆمەتانە بڕەوێننەوە[3]. لەو ڕووەوە پارتە عەلمانییەکان ڕۆڵی کارایان بینی‌و برەویان بەو بۆچوونە دەدا.

---

[1] جەمال نەبەز: هەمان سەرچاوە، ل ١٣٢ ـ ١٣٣.

[2] فاتح کریکار: هەمان سەرچاوە، ل٤٥.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (مەسعود عەبدولخالق) هەولێر، ٢٠٠٤/١٢/١٧.

## باسی سێیەم: کۆمەڵی جیهادی ئیسلامیی‌و کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق

### یەکەم: کۆمەڵی جیهادی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق

سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵی جیهادی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ڕێکخستنێکی نهێنی کە لە سەرەتای هەشتاکانەوە دەستبەکاربوون[١]، مەلا ئەمین پیرداود خۆشناو دامەزرێنەرو بەرپرسی یەکەمی ئەم کۆمەڵەیە، ناوبراو، یەکێکە لە ئەندامە دێرینەکانی ئیخوان‌و لە سەرەتای حەفتاکانەوە وازی لە ئیخوان هێنابوو، هەڵوێستی بەرامبەر ئیخوان توندبوو، ئەهامەتی‌و لاوازیی بێداری ئیسلامیی دەخستە ئەستۆی ئیخوان‌و بڕوای وابوو بەرنامەی ئیخوان هەڵەو لادانی زۆری تێدایە[٢].

مەلا ئەمین بە هاوکاری (مەلا جەمیل، مەلا جەمال، مەلا یەحیا) دەستیان بە کار کرد[٣]، جگە لەوانەی پێشوو چەند کەسایەتی تری وەکو (حاجی عومەر، ئیبراهیم تاهیر – د.ئیبراهیم، ڕەشید – شەهید کەیفی، مەلا عومەر موورادی، ئازاد حوجرانی) لە ئەندامە هەڵسوڕاوەکان ئەژمار دەکرێن.

ئەمانە لە هەولێر کەوتنە جموجۆڵ‌و کارکردن‌و دواتر بوونە بەهێزترین باڵی ڕەوتی ئیسلامیی هەولێر لە هەشتاکاندا[٤]، تاڕادەیەکیش لە موسڵ‌و سلێمانی چالاکییان هەبوو.

کۆمەڵی جیهاد، ئەندامەکانی لەسەر ڕۆحیەتێکی جیهادی پەروەردە دەکرد، بۆ پەروەردەکردنی ئەندامان، زیاتر جەخت دەکرا لەسەر لەبەرکردنی قورئان‌و فەرمودەو گرنگیدان بە مێژوو[٥].

کۆمەڵی جیهاد، بە شێوەی ڕێکخستنێکی نهێنی توندوتۆڵ بەدرێژایی هەشتاکان چالاکی دەنواند، ئەندامانی کۆمەڵی جیهاد، پەروەردەیەکی جیهادی توندوتۆڵ دەکران.

---

[١] امین پیردلود خوشناو: القواعد الأساسية في الإسلام، عن مطبوعات جماعة الجهاد الإسلامي في كردستان العراق، مركز زاده للصحافة والنشر، اربيل ١٩٩٥، ل٦.

[٢] نووسەرێکی نەزانراو: هەمان سەرچاوە، ل٣٢.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

[٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

[٥] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەبدولستار مەجید)، ڕانیە، ٢٠٠٤/١٢/١١.

هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی پەیوەندیو بزووتنەوەی ئیسلامیی، بە مەبەستی ڕاگەیاندنی کاری جیهادیو پەیوەندی کردن بەو دوو بزووتنەوەیەوە، مەلا ئەمین چەند جارێك سەردانی ئێران دەکاتو چاوی بە سەرکردەکانی هەردوو بزووتنەوەی ناوبراو دەکەوێت، دوای وتوێژو ڕاگۆڕینەوە، مەلا ئەمین بە نیگەرانییەوە دەگەڕێتەوەو سەرکردەکانیان بە شایستەی سەرکردایەتیکردنی کارێکی جیهادی نازانێت، بۆیە ڕازی نابێت پەیوەندی بەو بزووتنەوانەوە بکات[1].

دوای چەند ساڵ لە خەباتی نهێنیو پەروەردەکردنی چەند کادیرو ئەندام، سەرکردەکانی کۆمەڵی جیهاد، لە ڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١) لە میحوەری هەولێرەوە پەیوەندییان کرد بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، ئەم پەیوەندیکردنە کارێکی بێ بەرنامەو لە ژێر فشاری ئەندامو کادیرانیاندا بوو، کە بە ڕۆحیەتێکی جیهادی پەروەردە کرابوون، هەر بۆیە دوای ماوەیەکی کەمو لە مانگی (حوزەیرانی ١٩٩١) کۆمەڵێك ناکۆکی لاوەکیان لەگەڵ بزووتنەوە بۆ دروستبوو، سەرەنجام لە بزووتنەوە جیابوونەوەو هەرسێ بارەگای (چۆمان، خەلیفان، حوجران) لەژێر دەستیاندا مایەوە، ئەمەش ڕیزەکانی پەرتکردنو ژمارەیەك ئەندامی چالاکیان دەستبەرداری کۆمەڵی جیهاد بوونو لە ناو ڕیزەکانی بزووتنەوە درێژەیان بە چالاکی خۆیاندا.

دواتر مەلا ئەمین هەوڵیدا لەگەڵ کۆمەڵەی ئیسلامیی کە فاتح کرێکار ڕایگەیاندبوو یەکبگرێت، دوای چەند دانیشتن لە نێوان هەردوولادا، بۆچوونەکانیان هێندە لە یەکتر دووربوون نەیانتوانی یەکبگرن، دوای ئەوە مەلا ئەمین دوو بارەگای تری لەدەستداو تەنها بارەگای خەلیفانی بەدەستەوە مایەوە[2].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] لەم توێژینەوەدا نەمانویست باس لە قۆناغی دوای ڕاپەڕین بکەین، ئەم چەند دێڕەش کە باس لە مێژووی کۆمەڵی جیهاد دەکات لە دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١) بەو مەبەستەیە کە خوێنەر ئاگاداری زنجیرەی ڕووداوەکان بێت، ئەگەرنا ئەوە قۆناغێکی نهێنیە لە مێژووی کۆمەڵەی جیهاد، دواتر بە شێوەیەکی فەرمیو ئاشکرا کەوتنە کارکردن، بنەما فکرییەکانیان لە کتێبی (القواعد الأساسية في الإسلام) دا لە نووسینی مەلا ئەمین ئەمیری کۆمەڵی جیهاد خستەڕوو، هەوڵدەدەین لە داهاتوودا توێژینەوەیەکی سەربەخۆ لەو بارەوە ئەنجام بدەین.

## دووەم: کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق[*]

ناکۆکیو ناجۆری ناوخۆی بزووتنەوەی ئیسلامیی، ڕێگەی خۆشکرد ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەو پارتە جیاببنەوەو ڕێکخراوێکی نوێ دامەزرێنن، هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەوە ئەو ناکۆکییە سەریهەڵدا، هەندێ جار دەگەیشتە لوتکەو هەندێ جاریش ئەو بارگرژیە خاودەبویەوە، لە ڕوونکردنەوەیەکدا کە ڕابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامیی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز دەریکردووە، دەرکردنی گۆڤاری (بانگەوازی ئیسلامی)، کە لەلایەن ژمارەیەك کادیرو ئەندامی بزووتنەوە لە شاری پیشاوەری پاکستان دەرچووە، بە کارێکی تاکەکەسی ناوزەد دەکاتو ڕایدەگەیەنێت بزووتنەوە بە دەرکردنی ئەو گۆڤارە ڕازی نییەو بە ناشەرعی دەزانێت[1].

پێدەچێت ئەم گۆڤارە لەلایەن فاتح کرێکارەوە دەرچووبێت، ناوبراو دواتر لە بزووتنەوەی ئیسلامیی جیابویەوەو پارتێکی دامەزراند بە ناوی (کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق). سەبارەت بە دامەزراندنی ئەم پارتە، موحەممەد نوری بازیانی ساڵی (١٩٩١) بە مێژووی دامەزراندنی ئەم پارتە دادەنێت[2]، بەڵام بەپێی بڵاوکراوەکانی خودی کۆمەڵەی ئیسلامیی، ئەم پارتە لە (١٦/٤/١٤١١ك - ٥/١١/١٩٩٠ن) دامەزراوە. بێگومان بۆچوونی دووەم وردترو ڕاسترە[3]، چونکە بڵاوکراوەی فەرمی پارتەکەیەو سەرچاوەی متمانەپێکراوە.

---

[*] ناوی تەواوی پارتەکە بە عەرەبی (الجماعة الإسلامية في كردستان العراق) کوردیەکەی دەبێتە (کۆمەڵی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق) نەك (کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق)، بەڵام ئێمە لەم توێژینەوەدا لەبەر ئەمانەتی زانستی (کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق) بەکاردەهێنین، چونکە لە ئەدەبیاتی خودی پارتەکەدا ناوەکە بەو شێوازە هاتووە.

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٢ )

[2] مستقبل الحركة الإسلامية في كوردستان العراق ل٥٧.

[3] بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (١٣، ١٤، ٦٦). لە بەڵگەنامەی ژمارە (١٣،١٤) ڕۆژی (١٦/٤/١٤١١ك) بە مێژووی دامەزراندن دانراوە، بەڵام لە بەڵگەنامەی ژمارە (٦٦) ڕۆژی (١٨/٤/١٤١١ك) بە ڕۆژی دامەزراندن دانراوە، لە هەموو بەڵگەنامەکانیشدا ئەو مێژوانە بەرانبەرن لەگەڵ ڕۆژی (٥/١١/١٩٩٠ن)، ئەم حاڵەتەش هەندێ جار لە بەرانبەرکردنی مێژووی ڕووداوەکان بە ڕۆژو ساڵی کۆچیو زایینی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.

دەربارەی ناوی سەرکردەکانی ئەم پارتە، جگە لە ناوی فاتح کرێکار، کە کەسی یەکەم بووە، هیچ زانیاریەکمان لەبەردەستدا نییە، سەبارەت بە دیدو تێڕوانینی پارتەکەش ئەوا لە میساقێکدا پوختەیەکی بڵاوکراوەتەوە[١].

ئەم پارتە تا ڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١) جگە لە دەرکردنی چەند بەیاننامەیەك‌و ژمارە (٨)ی گۆڤاری (بانگەوان) هیچ چالاکییەکی ئەوتۆی نەبووە، لە ئازاری (١٩٩١)یشدا گۆڤاری (الشهداء) دەردەکەن[٢]، هەر لەو سەروبەندەدا بە بۆنەی ڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١) بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە[٣]، دواتریش لە ناوچەی خەلیفان‌و حاجی ئۆمەران بارەگایان دانا، دواتر بە هەوڵی (وریا موحەممەد کەرکووکی‌و مەلا ئیبراهیم نولچکەو یاسر کەرکووکی - پشکۆ) ڕێکخراوەکە هەڵوەشایەوەو ئەندامەکانی چوونەوە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیی[٤].

---

[١] دەربارەی دیدو تێڕوانینی کۆمەڵەی ئیسلامیی بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (١٣، ١٤، ٦٦).

[٢] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی گۆڤارەکە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١١٨ - ١٢١.

[٣] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٥).

[٤] محمد نوری بازیانی: هەمان سەرچاوە، ل٥٧.

## باسی چوارەم: پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان لە کوردستان

### یەکەم: دامەزراندنی

سەرەتای دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە، دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵو کۆششی کۆمەڵێك هەڵسوڕاوی ڕەوتی ئیسلامیی لە هاندەران، ئەم ڕێکخراوە لە (٢٠حوزەیرانی ١٩٨٦) لەژێر ناوی (پەیوەندی قوتابیانی موسڵمانی کورد لە دەرەوە) لە شاری تۆرینتۆی کەنەدا ڕاگەیەنرا[١].

دەربارەی دامەزرێنەرانی ئەم ڕێکخراوە گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) زمانحاڵی ڕێکخراوەکە نووسیویەتی: " لەلایەن ژمارەیەك گەنجی موسڵمانی کوردی کوردستانی (عێراقو تورکیاو ئێرانو سوریا)وە دامەزراوە"[٢]. بەپێی ئەو زانیاریانەی لەبەردەستدان (ئازاد گەرمیانی « د. عوسمان عەلی ـ تویژەر»، دلێر هەمەوەندی، حاجی ئاسۆ، عائیشە کیسنجەر) لە دەستەی دامەزرێنەری ڕێکخراوەکەن[٣]. بەڵام هیچ زانیاریەك دەربارەی ناوی کەسانی دیکە کە ڕۆڵیان لە دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوەدا بینیبێت لەبەردەستدا نییە.

ڕێکخراوی پەیوەندی قوتابیان، ماوەی دوو ساڵ لەژێر ئەو ناوەدا کارو چالاکی ئەنجامداو لە کۆبونەوەی لیژنەی گشتی ڕێکخراوەکە لە (تەمموزی ١٩٨٨) ناوی ڕێکخراوەکە لە (پەیوەندی قوتابیانی موسڵمانی کورد لە دەرەوە) گۆڕا بۆ (پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان لە کوردستان)[٤].

گۆڕینی ئەم ناوە زیاتر بەو مەبەستەبووە کە ڕێکخراوەکە لە چوارچێوەی تەسکی کوردی بگۆڕێت بۆ چوارچێوەیەکی بەرفراوانتر کە کوردستانە، چونکە لە کوردستان جگە لە کورد کەمایەتی ترو عەرەبو تورکو فارس دەژینو بەمەش سڵەمینەوەیان لە

---

[١] في ذكرى ولادة الرابطة، ئالای ئیسلام، العدد (٦)، السنة الأولى، شعبان ـ رمضان ١٤٠٧/ آيار ١٩٨٧.

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

[٣] کامەران بابان زادە: پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان لە کوردستان، (دەستنووس).

[٤] الى قراءنا، ئالای ئیسلام، العدد (٥، ٦)، السنة الثانية ١٩٨٨، ل١٤

ئاست ڕێکخراوەکە کەم دەبێتەوەو ئامادەن لە چوارچێوەی ڕێکخراوەکەدا کار بکەن یاخود هاوکاری بکەن[1].

پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان لە کوردستان، لەژێر ئەم ناوەدا درێژەی بە خەباتو چالاکی خۆیدا، تا لە (٢٤ حوزەیرانی ١٩٩٢) لەگەڵ (یەکێتی ئیسلامیی قوتابیانو لاوانی کوردستان)* یەکیان گرتو ڕێکخراوێکی پیشەیی نوێیان بەناوی (پەیوەندی ئیسلامیی خوێندکارانو لاوانی کوردستان) ڕاگەیاند[2].

سەبارەت بە ناسنامەو دیدو تێڕوانینو ئامانجەکانی پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان لە کوردستان، کامەران بابان زادە نووسیویەتی: "پەیوەندی ڕێکخراوێکی ئیسلامیی خوێندکاریو پیشەییە بڕوای وایە ئیسلام بەرنامەی کارو بیروباوەڕە، قورئانو سوننەتی پێغەمبەر پەیڕەوو دەستوری کارکردنە"[3]. دەربارەی ئامانجەکانی پەیوەندی، گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) نووسیویەتی: " مەبەست لە دروستکردنی پەیوەندی قوتابیان ئەوەیە ببێتە دوانگەیەك بۆ ڕێنمایی کردنو گەشەپێدانی توانا زانستیو فکریەکانی لاوان، بە مەبەستی خزمەتکردنی کێشەی ئیسلامیی بە شێوەیەکی گشتیو کێشەی گەلی ستەملێکراوی کوردستان بە تایبەتی"[4]. دەتوانین پەختەی ئامانجەکانی پەیوەندی لەم چەند خاڵەدا بخەینەڕوو:

١ـ کۆکردنەوەی خوێندکارو لاوانی موسڵمان لە دەوری ڕێکخراوەکەو ڕێکخستنیان بەرەو بەدیهێنانی ئامانجە ئیسلامییەکانو بنیادنانەوەی کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیی لە کوردستان.

---

[1] الافتتاحية، ئاڵای ئیسلام، العد (١)، السنة الثالثة، آذار ١٩٨٩، ل٢.

* یەکێتی ئیسلامیی قوتابیانو لاوانی کوردستان: ڕێکخراوێکی پیشەیی بوو کۆمەڵێك خوێندکاری کورد کە لە هەشتاکانەوە لە ناو زانکۆکانی سەلاحەددینو موسڵو بەغداد بە شێوەیەکی نهێنی جموجۆڵو چالاکیان هەبوو، دوای ڕاپەڕینی (ئازاری ١٩٩١) ئەم ڕێکخراوەیان ڕاگەیاند.

[2] باوکی پەیوەند: لەیادی دامەزراندنی پەیوەندی ئیسلامی خوێندکارانی کوردستان دا، ڕۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی، ژمارە (٤٢)، ١٩٩٩/٦/٢٤.

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] في ذكرى ولادة الرابطة.

٢- دروستکردنی دوانگەیەکی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن تا لە ڕێگەیەوە کێشەی کوردو موسڵمانییەتیو ناسنامەی بخرێتەڕوو.

٣- بڵاوکردنەوەی هۆشیاری ئیسلامییو ناساندنی ناوەڕۆکی ئایدۆلۆژیاکانی ئەودەمەی گۆڕەپانی کوردستانو خستنەڕووی جێدار (بدیل)ی ئیسلامیی.

٤- هاوکاریو پاڵپشتی بزووتنەوەی جیهادی لە کوردستانو کۆمەکی لێقەوماوان.

٥- هەوڵدان بۆ یارمەتیدانی برازی خوێندکارانی ئیسلامیی لە جیهان.

٦- هاوکاریکردنی خوێندکارە موسڵمانەکانی کوردستان بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن[1] .

لە (نیسانی ١٩٨٨) لە ژێر دروشمی ( پشتگیری گەلی موسڵمان لە کوردستان) بە ئامادەبوونی نوێنەری چەند ڕێکخراوو پارتی ئیسلامیی، پەیوەندی قوتابیانی موسڵمان کۆنگرەی یەکەمی بەست، لەو کۆنگرەدا چەند بڕیارێك درا کە دەگونجێت وەکو ئامانجی ڕێکخراوەکە لەو دەمەدا ناوزەد بکرێت، بڕیارەکانیش بریتیبوون لە:

١- هاندانی موسڵمانانی تێکڕای جیهان بۆ هاوبەشیکردن لە ڕاگرتنی کۆمەڵکوژی گەلی کورد لە لایەن ڕژێمی عێراقو سەرەزەنشت کردنی مەرگەساتی هەڵەبجە کە (٥) هەزار کوژراوو (٨) هەزار برینداری لێکەوتۆتەوە.

٢- پشتگیریکردنو گرنگیپێدانی برازی ئیسلامیی لە جیهان وەکو ئەفغانستانو فەلەستین.

٣- بانگەوازکردن بۆ دروستکردنی سندوقی کۆمەکی بۆ لێقەوماوانی کورد.

٤- بەرپاکردنی هەڵمەتێکی جیهانی گشتگیر بۆ ناساندنی کێشەی کورد بە ڕای گشتیو جیهانو ڕیسواکردنی ئەو مومارەسە نامرۆڤانەیەی دەوڵەتان پێی هەڵدەستن بۆ زاڵبوون بەسەر گەلی کورد[2] .

---

[1] کامەران بابان زادە: هەمان سەرچاوە.

[2] قرارات المؤتمر الأول، ئالای ئیسلام، العدد (٤)، السنة الثانية، ذوالقعدة ـ ذوالحجة ١٤٠٨/ حزيران ـ تموز ١٩٨٨، ل٣.

## دووەم: کارو چالاکی پەیوەندی

پەیوەنی قوتابیانی موسڵمان هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە لێبڕاوانە تێکۆشاوەو بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی تەقەلای داوە، ئەم کارو چالاکیانەش بواری جۆراوجۆری لەخۆ گرتووەو لێرەدا لە سێ تەوەرەدا دەیخەینەڕوو:

**تەوەرەی یەکەم:** بەستنی کۆڕو سمینارو کۆنگرەو سازدانی چالاکی جۆراوجۆر بە مەبەستی ناساندنو داکۆکیکردن لە کێشەی کورد، ساڵی (١٩٨٩) لە شاری (کۆلن)ی ئەڵمانیا یەکەم کۆنگرەی ئیسلامیی جیهانی سازدا، لەو کۆنگرەدا دەیان کەسایەتییو پسپۆڕ بەشداری تێداکرد بە مەبەستی خستنەڕووی کێشەی کوردو جێداری ئیسلامیی بۆ چارەسەری کێشەکە[١].

لە ڕۆژانی (٢٣ ـ ٢٧ کانونی یەکەمی ١٩٨٨) موحسین جوامێر بە نوێنەرایەتی پەیوەندی بەشداری کرد لە کۆنگرەی (١١)ی (پەیوەندی لاوانی موسڵمانی عەرەب) لە شاری (تۆکلاهۆما) ، نوێنەری پەیوەندی لەو کۆنگرەدا (٢) وتاری دەربارەی کێشەی کورد پێشکەش کرد، لە پەراوێزی کۆنگرەکەشدا وەفدی پەیوەندی چەند دیدارو کۆبوونەوەی لەگەڵ بەشداربووانی کۆنگرە سازدا[٢]. هەروەها وەفدی پەیوەندی بەشداری کرد لە کۆنگرەی یەکەمی (لیژنەی فەلەستینی ئیسلامیی لە ئەمریکای باکوور) کە لە شاری (سانت لویس) لە (٢٣ ـ ٢٦ کانونی یەکەمی ١٩٨٨) ڕێکخرا وەفدی پەیوەندی چەند دیدارو کۆبوونەوەی لەگەڵ بەشداربووانی کۆنگرە ئەنجامدا[٣].

دیارە پێشتریش کۆمەڵێك کارو چالاکیان بۆ ناساندنو داکۆکیکردن لە کێشەی کورد ئەنجامداوە، لەوانە سازدانی ڕێپێوانێك لە شاری (تۆرێنتۆ)ی کەنەدا بۆ خستەڕووی کارەساتی هەڵەبجە، ژمارەیەکی زۆری دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کەنەدا لە تەلەفزیۆنو ڕۆژنامەکاندا ئەم ڕێپێوانەیان بڵاوکردەوە. هەر لەو ماوەدا وەفدێکی پەیوەندی

---

[١] لقاء مع الأستاذ شاخوان عبدالقادر سكرتير الرابطة الإسلامية للطلبة وشباب كردستان، أجرى اللقاء: سلمان عبد الرحمن، ئالای ئيسلام، العدد (٤)، السنة الحادية عشرة، شوال ١٤١٨/ شباط ١٩٩٨م، ل٣٦.

[٢] نشاطات فروع الرابطة، ئالای ئيسلام، العدد (١)، السنة الثالثة، آذار ١٩٨٩، ل١١.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.

سەردانی وەزارەتی دەرەوەی کەنەداو پەرلەمانی کەنەداو ڕێکخراوی مافی مرۆڤو چەند ڕێکخراوێکی ئیسلامیی‌و ڕزگاریخوازیی کرد، مەبەست لەم سەردانانە ناساندنی کێشەی کوردو کارەساتی هەڵەبجە بوو، ئێزگەی نیشتمانیی کەنەدی چاوپێکەوتنێکی (٣٨) خولەکی لەگەڵ وەفدی پەیوەندی ئەنجامداو وەفدەکە تیشکی خستەسەر تاوانەکانی سەددام حسێن دژی گەلی موسڵمانی کورد[١].

هەروەها پەیوەندی چەندین زنجیرە کۆڕی سازداوە، لە شاری ( سان دیاکۆ- کالیفۆرنیا) لە ژێر ناونیشانی(کێشەی کورد! جێدار؟) لە (٧ کانونی دووەمی ١٩٨٩) ئەم زنجیرە کۆڕەی سازدا:

١.دکتۆر موزەفەر بەرتۆمە: چارەسەری نێودەوڵەتی بۆ چارەی کێشە نێودەوڵەتییەکان.

٢.موحسین جوامێر: ئایا ئایینی ئیسلام مەبەستەکانی خۆی لە کوردستان جێبەجێ دەکات؟

٣.ئازاد گەرمیانی: ستراتیژیەتی ئیسلامیی بزووتنەوەی ئیسلامیی کورد بۆچی؟[٢]

هەروەها لە (٤ کانونی دووەمی ١٩٨٩) لە شاری (ناشفل - سنستانی) زنجیرە کۆڕێکی سازدا بەم شێوەیە:

١. دکتۆر شێخانی: نێونەتەوەیی ئیسلامیی‌و بیری نەتەوەیی.

٢. موحسین جوامێر: خستنەڕووی مێژووی کێشە کورد.

٣. ئازاد گەرمیانی: ڕەهەندی ئیسلامیی کێشەی کورد[٣].

هەروەها لقی بەریتانیای پەیوەندی، لە (١٦ کانونی یەکەمی ١٩٨٨) لە (زانکۆی مانشستەر) کۆڕێکی بە ناونیشانی (مەرگەساتی موسڵمانانی کوردو چارەسەری

---

[١] نشاط الرابطة، ئالای ئیسلام، العدد (٤)، السنة الثانية ذوالقعدة - ذوالحجة ١٤٠٨/ حزيران - تموز ١٩٨٨، ل٤.

[٢] نشاطات فروع الرابطة، ئالای ئیسلام، العدد (١)، السنة الثالثة، ل١٢.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.

ئیسلامیی) سازدا[1]. ئەمە وێڕای ئەوەی چەند پێشانگایەکی وێنەیی سەبارەت بە قوربانیانی چەکی کیمیایی لە کوردستان، لە مزگەوتو ناوەندە ئیسلامییەکانی بەریتانیادا کردەوە[2].

هەروەها لقی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە (١٨ نیسان ١٩٨٨) ئێوارە کۆڕێکی سەبارەت بە کارەساتی هەڵەبجە سازدا، لە کۆتایشدا فیلمێکی ڤیدیۆیی بەڵگەنامەیی نمایش کرا[3].

**تەوەرەی دووەم:** کۆکردنەوەی کۆمەکو یارمەتیو باربۆ بۆ خەڵکی لێقەوماوو ئاوارەی کورد، ئەمەش دوای ئەو کارەساتانە دێت کە لەسەر دەستی حکومەتی بەعس بەسەر کورد هات. پەیوەندی لە کۆنگرەی یەکەمدا بڕیاری دروستکردنی سندوقی کۆمەکی بۆ گەلی ورد دا، هەر لەو ڕووەوە گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) لە ژمارە (٥، ٦)ی ساڵی (١٩٨٨)دا داوا لە خوێنەران دەکات کۆمەکو یارمەتییەکان بگەیەننە ئەو سندوقەی ناونیشانی لە گۆڤارەکەدا بڵاوکراوەتەو بۆ کۆمەکی ئاوارەکان تەرخان کراوە[4]. ئەو کۆمەکو یارمەتیانەش لە ڕێگەی وەفدی پەیوەندی کە ڕاستەوخۆ دەهاتنە ناوچەکە بەسەر ئاوارەکاندا دابەش دەکرا[5]. بۆ نموونە لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٨) بە دوو قۆناغ بڕی (٣٠) هەزار دۆلاری کەنەدی بەسەر لێقەوماوانی هەڵەبجەو ئاوارەکاندا دابەشکرا[6]. هەروەها لە کۆتایی ساڵی(١٩٨٩) وەفدێکی پەیوەندی کە پێکهاتبوو لە ( ئازاد گەرمیانی، موحەممەد دەشتی، خەلیل) سەردانی کوردستانی ئێرانیان کردو بڕی (٥) ملیۆن تمەنیان بەسەر ئاوارەکاندا دابەشکرد[7]. هەروەها لقی (کەنەدا)ی پەیوەندی بڕی (١٠) تەن دەرمانو جلوبەرگی بۆ ئاوارەکان کۆکردەوە[8].

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.

[3] بقیة نشاط الرابطة، العدد (٤)، ل٧.

[4] الی قراءنا، ل١٤.

[5] کامەران بابان زادە: هەمان سەرچاوە.

[6] لقاء مع الاستاذ آزاد کرمیاني، ئاڵای ئیسلام، العدد (١)، السنة الثالثة، آذار ١٩٨٩ ل٩.

[7] زیارة، النفیر، العدد (٥) شباط ١٩٩٠، ل٤٣.

[8] نشاطات فروع الرابطة، ئاڵای ئیسلام، العدد (١)، السنة الثالثة، ل١٣.

**تەوەرەی سێیەم:** دەرکردنی گۆڤاری ئاڵای ئیسلام بە هەرسێ زمانی کوردیو عەرەبیو ئینگلیزی، ئەم گۆڤارە وەکو زمانحاڵی ڕێکخراوەکە بووە دەزگایەکیی مەعریفییو دەیان وتارو بابەتی بەپێزی مێژووییو کۆمەڵایەتییو فکرییو سیاسیی بڵاوکردەوەو لەو ڕووەوە جێدەستی لە مێژووی ڕەوتی ئیسلامییدا دیارە[1].

یەکەم ژمارەی گۆڤاری ئاڵای ئیسلام لە (تەمموزی ١٩٨٦) دەرچووە[*]، دەربارەی ئامانجی گۆڤارەکەش لە وتارێکی گۆڤارەکەدا هاتووە کە (٣) ئامانج لە پشت دەرکردنی گۆڤاری ئاڵای ئیسلامەوەیە کە بریتین لە:

١. بڵاوکردنەوەی بیری ئیسلامیی ڕەسەنو پەرەپێدانی ڕێنمایی ئیسلام لە ناو لاوانی کورد تا بتوانن چارەی ئیسلامییانەی کێشەی سیاسییو ئابوورییو کۆمەڵایەتیی گەلی کورد بکەن.

٢. زۆربەی بڵاوکراوە ئیسلامییەکانی کە لە ئەوروپاو ئەمریکا دەردەچن، ڕۆڵی کورد لە خزمەتکردن بە ئیسلام پشتگوێ دەخەنو گرنگی نادەن بە کێشەی کورد، لەو ڕوانگەوە گۆڤاری ئاڵای ئیسلام دەخوازێت چەوساوەیی گەلی کورد دەرخاتو سەرنجی ڕێکخراوو کەسایەتییە ئیسلامییەکان بۆ لای کێشەکەی ڕاکێشێت.

٣. زۆربەی بڵاوکراوە کوردییەکان کە لە ڕۆژئاوا دەردەچن، کولتوورو مێژووی ئیسلامیی کوردیان پشتگوێ خستووەو بە شێوەیەکی نابابەتی کێشەی کوردیان خستۆتەڕوو، ئەو بڵاوکراوانە بیرۆکەی نەتەوایەتییو لیبرالییو مارکسیی بە چارەی کێشەی کورد دەزانن، ئاڵای ئیسلام ئەو ئاراستە بە هەڵە دەزانێتو مەبەستێتی ڕاستی بکاتەوە[2].

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ڕۆڵو کاریگەری گۆڤاری ئاڵای ئیسلام لە خزمەتکردن بە ئاینو زمانو مێژوو کلتوری کورد بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٥٢ ـ ٥٩.

[*] دەربارەی مێژووی دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە (دکتۆر ئازاد گەرمیانی) زانیاری هەڵەی داوە بە(هەژار حاتەم)و دەڵێت: "یەکەم ژمارەی گۆڤاری ئاڵای ئیسلام لە ساڵی (١٩٨٧) دەرچووە". بەرگو چەند پەڕەیەکی ژمارە (١)ی گۆڤارەکەم دەستکەوت لە بەرگەکەی ئەو مێژووەی لەسەر نووسراوە کە لە سەرەوە ئامāژەم پێداوە. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣٩).

[2] ئازاد کرمیاني و کولالة ئاسنکر: لماذا ئالاي ئیسلام، ئالای ئیسلام، العدد (١)، السنة الاولی، تموز ١٩٨٦، ل١.

## باسی یەکەم: ڕاگەیاندنو ڕەوشی ناوخۆی بزووتنەوەی ئیسلامیی

### یەکەم: ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی

دوای خۆنیشاندانی هەڵەبجە لە (١٣ مایسی ١٩٨٧)، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانو کەسایەتییو جەماوەری هەڵەبجەو دەوروبەری بەرەو ئێران کۆچیان کرد، کە هەندێ لە سەرکردەکانی ئیخوانیان لەگەڵدا بوو، بە گەیشتنیان بە ئێران، لە (١٩٨٧/٥/٢٤) لە ژێر ناوی (کۆمەڵەی زانایانی کۆچەری) بەیاننامەیەکیان دەرکردو شۆڕشی چەکدارییان ڕاگەیاند[1].

ئەم بەیاننامە، سەرەتایەك بوو بۆ ڕاگەیاندنی پارتێکی نوێ، لەو کاتەدا بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی تاکە پارتی ئیسلامیی چەکداری گۆڕەپانەکە بوو، لەلایەن شێخ عەبدوللەتیف واژەیی ڕێبەرایەتی دەکرا، سەرکردەکانی ئەم پارتە پێشوازیان لە کۆمەڵەی زانایانی کۆچەری کردو لەسەر کاری چەکداری هانیان دەدان.

لە (حوزەیرانی ١٩٨٧) لە شاری (سنە) کۆبوونەوەیەك کراو تێیدا بڕیاری ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی بە ڕێبەرایەتی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز درا، بۆ ئەو مەبەستەش پڕۆژەیەکی (١٠) خاڵی ئامادەکرا، لە (١٩٨٧/٦/٢٥) لە چوارچێوەی سەردانێکدا بۆلای (هاشمی ڕەفسنجانی)و (عەلی خامنەئی) پێشکەشی دەوڵەتی ئێران کرا، خاڵەکانی پڕۆژەکە بریتی بوون لە:

١. بەوپێیەی گەلی کورد دەردەسەریو ناڕەحەتیو ناهەمواری زۆری دیوە لە عێراقی زامدار بە دەستی حوکمی عەفلەقی کافرەوە، بەو سیفەتەی میللەتێکی زۆرلێکراوە، ئەویش مافی ژیانی خۆی دەوێت، دەبێت وەکو هەموو گەلانی جیهان بە ئازادی بژی.

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ( ٨ )؛ لە بەشی (سێیەم) باسی (سێیەم) بە درێژی باسی ئەو بەیاننامەیە کراوە.

٢. سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە هەموو کاروبارێکی سیاسیی‌و جیهادی سەربەخۆیەو بە هیچ سەرکردایەتییەکی ترەوە پەیوەست نییە، مەگەر لە ڕووی هاوکاریی‌و هەڵسوڕانی کارەوە.

٣. بودجەیەکی ساڵانە بدرێت بە سەرکردایەتی بزووتنەوە، دەبێت ئەو بودجەیە بە شێوەیەك بێت لەگەڵ ئاستو قەوارەی بزووتنەوەدا بگونجێت.

٤. دەبێت بزووتنەوە سەربەستییەکی تەوای هەبێت لە پەیوەندیکردن بە جیهانی ئیسلامیی‌و بزووتنەوە ئیسلامییەکانەوە، تا پشتگیری بزووتنەوە لە ڕووی سیاسیی‌و ئابورییەوە بەهێزبێت.

٥. پێداویستی جەنگی بە سەرکردایەتی بزووتنەوە بدرێت‌و بە شێوەیەکیش بێت کە لەگەڵ ئاستی جەنگاوەریدا بگونجێت.

٦. ژیانی خێزانی موجاهیدو پەنابەرەکان مسۆگەر بکرێت، دەبێت بەر لە هاتنی وەرزی زستان هەموویان لە جێی ئاسایش‌و هێمندا نیشتەجێ بکرێن.

٧. سەرپەرشتی خێزانی شەهیدەکان بکرێت‌و بە جۆرێکی وا بایەخیان پێبدرێت کە لەگەڵ پلەو پایەی جیهادەکەیاندا بگونجێت.

٨. کردنەوەی ئێزگەیەکی تایبەت بۆ بزووتنەوە، هەروەها لە بوارەکانی تری ڕاگەیاندندا کارئاسانی بۆ بکرێت.

٩. بوار بکرێتەوە بۆ هەموو موجاهیدێکی موسڵمان لە جیهانی ئیسلامیدا کە بیەوێ بێتە ڕیزی بزووتنەوەوە.

١٠. ڕێگە بدرێت کە بزووتنەوە بارەگا دابنێ لە ناوچە سنورییەکاندا، لەو ناوچانەی خۆی دەیهەوێت[١].

هەر لە سەروبەندی ڕاگەیاندنی بزووتنەوە، لە (تەمموزی ١٩٨٧) کۆمەڵێك گەنج‌و کەسایەتیی ناوچەی بیتوێن‌و پشدەر چوونە ئێران‌و پەیوەندیان بە بزووتنەوەی

---

[١] بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، گۆڤاری بانگەوازی ئیسلامی، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم، کانونی دووەمی ١٩٩٠ز، ل٣٠.

ئیسلامییەوە کرد[1]، ئەمەش بوە پاڵپشتێکی جەماوەریو ڕێکخراوەیی باش بۆ بزووتنەوەو کارەکانی ئەو پارتەی بەگوڕتر کرد.

سەبارەت بە ڕاگەیاندنی بزووتنەوە، شێخ موحەممەد بەرزنجی باس لەوە دەکات لە دوای کۆچی زانایانو جەماوەری هەڵەبجەو گەیشتنی هەڵسوڕاوانی ڕەوتی ئیسلامیی لە دەڤەری بیتوێنو پشدەر لە (١٢ی ڕەبیعی یەکەمی) ئەو ساڵەدا کۆنفراسێك بەستراو چەند کارێکی بنەڕەتی ئەنجامدرا:

١. ناوی بزووتنەوەی پەیوەندی بە لابردنی وشەی (پەیوەندی) گۆڕا بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق).

٢. هەڵبژاردنی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بە ڕابەری گشتی.

٣. دامەزراندنی مەکتەبی سیاسیی نوێ.

٤. لە ڕووی سەربازییەوە چوار هێزی تر بە ناوی هێزەکانی (نەسر، حەمزە، ئازادی، حەسەن بەننا) بۆ بزووتنەوە زیادکرا[2].

زانیاریەکانی شێخ موحەممەد بەرزنجی لە ڕووی مێژووییەوە ورد نین، سەرەتا ئەوەی ئەو بە کۆنفراسی دادەنێت، تەنها کۆبوونەوەیەکی بەرفراوان بوەو تێیدا سەرکردایەتی بزووتنەوە هەڵبژێردرا، ئەمەش جیاوازە لەو کۆبوونەوەی لە مانگی (حوزەیرانی ١٩٨٧ز) لە شاری (سنە) لە ماڵی شێخ موحەممەد بەرزنجی ئەنجامدراو بزووتنەوەی تیا ڕاگەیەنراو شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بووە ڕابەر[3].

کۆبوونەوە بەرفراوانەکە کە شێخ موحەممەد بە کۆنفراس ناوزەدی دەکات لە (٢٥ سەفەر ١٤٠٨ك/ ١٨ تشرینی یەکەمی ١٩٨٧ز) لە (سنە) ئەنجامدراو لەناو (٣٠) پاڵێوراودا جگە لە ڕابەری گشتی کە لە پۆستەکەی خۆیدا مایەوە سەرکردایەتی بزووتنەوە هەڵبژێردرا کە بریتی بوو لە: (شێخ عەبدوللەتیف واژەیی، مەلا عەلی

---

[1] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی سێیەم، ل١٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

عەبدولعەزیز، مەلا عومەر عەبدولعەزیز، ئەحمەد کاکە مەحمود، مەلا مەحمود ئازادی، ئەبوبەکر سدیقی، ئەبوعەلی موسڵی، عەلی باپیر، مەلا عەبدولقادر کۆکۆیی، مەلا موحەممەد ڕازی، عەبدولقادر برایەتی، مەلا سەلمان، مەلا عەلی بیارە)[1]. ئەمە یەکەم دەستەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامییە.

دانانی (١٢ی ڕەبیعی یەکەم)یش بە ڕۆژی کۆنفراسەکە هەڵەیەکی مێژووییە، تەنانەت هەندێ سەرچاوەی دیکە (١٢ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤٠٨ك) بە مێژووی ڕاگەیاندنی بزووتنەوە دادەنێن. ئەمەش هەڵەیەکی مێژوویی گەورەیە، چونکە (١٢ی ڕەبیعی یەکەمی ١٤٠٨ك) بەرامبەرە لەگەڵ (٣ تشرینی دووەمی ١٩٨٧) ئەمەش کاتێکە کە چەند مانگێك بەسەر ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا تێپەڕیوەو لەگەڵ سەرچاوە مێژوویەکاندا دژ دەوەستێتەوەو هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لەبەردەستدا نییە ئەوە بسەلمێنێت کە بزووتنەوە لەو مێژووەدا ڕاگەیەنرا یاخود کۆنگرەی بەستووە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا سەرنجی لێبدرێت گۆڕانی ناوی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی بوو بۆ بزووتنەوەی ئیسلامیی، ئەمەش بەو مانایەیە کە بزووتنەوەی ئیسلامیی درێژەپێدەری بزووتنەوەی پەیوەندییە بە هەندێ گۆڕانکارییەوە، لەلایەکی ترەوە بزووتنەوەی پەیوەندی ناوی لەسەر شانۆی ڕامیاری دەسڕێتەوەو پارتێکی نوێی ئیسلامیی دێتە مەیدان کە لە بزووتنەوەی پەیوەندی بەهێزترەو چالاکی زیاتر دەنوێنێو ڕۆڵی زیاتر دەگێڕێت.

## دووەم: ڕەوشی ناوخۆی بزووتنەوەی ئیسلامیی

بزووتنەوەی ئیسلامیی لە سەرەتای ڕاگەیاندنیەوە لەسەر بنەماو پرەنسیپە حزبییەکان دانەمەزرا، هەلومەرجی ئەو کاتەی کوردستانو ناوچەکە بە تایبەتیش لەو کاتەدا ستەمو چەوساندنەوەی کورد لەلایەن حکومەتی عێراقەوە گەیشتبووە لوتکە، کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر پەلەکردن لە پێکهێنانی بزووتنەوەی ئیسلامیی، ئەم حاڵەتەش شوێنەواری لەسەر ڕێکوزەری ئەو پارتە جێهێشت. لەو بارەوە عەلی باپیر نووسیویەتی: "مسوڵمانان لە هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵ، بە هاندەری

[1] ئەبوبەکر سدیقی: ڕۆژمێری (١٩٨٧).

خوارازی کردن‌و بووژاندنه‌وه‌ی ئیسلام‌و رزگارکردنی خه‌لکی چه‌وساوه‌و بی‌شوان‌و، له ژێر ته‌ئسیری کوفرو سته‌م‌و چه‌وساندنه‌وه‌و خراپه‌کاری رژێمی به‌عسی کافرداو، له‌کاردانه‌وه (رد فعل)ی شه‌پۆلی دژی ئایینی‌و دژی ئه‌خلاقی خۆبه‌ده‌مراست زان‌و خۆبه‌شۆرشگێرو خه‌مخۆرانی نێو کوردستان دا، کۆبوونه‌وه‌و وه‌خۆکه‌وتن بۆ دروست کردنی کۆمه‌ڵ‌و بزووتنه‌وه‌یه‌کی ئیسلامی، که له سه‌ره‌تاوه ناوی (بزووتنه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی ئیسلامی) بوو، به‌ڵام دواتر که به هۆی ده‌ربه‌ده‌ربوون‌و کۆچکردنی ژماره‌یه‌کی زۆر له مسوڵمانانه‌وه‌و به‌شداری کردنیان له‌و پرۆژه (مشروع)ه جیهادیه‌دا، قه‌باره‌که‌ی گه‌وره‌تربوو جوغزی فراوانتربوو، پاش چه‌ند دانیشتن‌و کۆبوونه‌وه‌یه‌کی به‌په‌له‌و سه‌رپێیی (إرتجالي) هه‌ندێك گۆرانکاری رواڵه‌تی‌و ساده به‌سه‌ر پرۆژه‌ی ناوبراودا هاتن‌و سه‌ره‌نجام ناوه‌که‌شی گۆرا بۆ بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی له کوردستانی عێراق دا"[1]. به سه‌رنجدان له‌و ده‌قه بۆمان ده‌رده‌که‌وێت سته‌می به‌عس‌و شه‌پۆلی دژی ئایینی کاریگه‌ری هه‌بوو له‌سه‌ر په‌له‌کردن له راگه‌یاندنی بزووتنه‌وه‌.

بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامیی له رووی پێکهاته‌ی ناوخۆوه تا راده‌یه‌ك ناجۆر بوو، ئه‌وه‌ش به پله‌ی یه‌که‌م ده‌گه‌رێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی له سه‌ره‌تاوه دامه‌زرێنه‌رانی ئه‌م پارته له یه‌ك قوتابخانه‌ی فکریه‌وه نه‌هاتبوون، بنه‌مایه‌کی په‌روه‌رده‌یی‌و رێکخراوه‌یی پێشوه‌ختیان نه‌بوو، ئه‌وه‌ی ئه‌و پێکهاته ناجۆره‌ی کۆکردبوویه‌وه ئایدۆلۆژیای ئیسلام‌و پێویستی به‌ره‌نگاری به‌عس‌و تاوسه‌ندنی چه‌وساندنه‌وه‌ی گه‌لی کورد بوو.

سه‌رکرده‌کانی بزووتنه‌وه زۆربه‌یان زانای ئایینی بوون، پێشتر سه‌رقاڵی په‌روه‌رده‌و زانسته ئایینیه‌کان بوون، تێکه‌ڵ به ژیانی سیاسیی نه‌بوون‌و له‌و بواره‌دا که‌م ئه‌زموون بوون[2]، هه‌ر بۆیه له‌گه‌ڵ دامه‌زراندنی حزبی سیاسیی‌و سه‌رکردایه‌تی کردنی ئه‌و کاره، رووبه‌رووی گرفتی سیاسیی، فکریی، ستراتیژیی‌و دبلۆماسیی بوونه‌وه. ته‌نانه‌ت

---

[1] ده‌ردو ده‌رمانی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی، له بلاوکراوه‌کانی بزووتنه‌وه‌ی ئیسلامی له کوردستانی عێراق، چاپخانه‌ی شه‌هیدانی گردی ره‌مکان ١٩٩٠ز، ل٧.

[2] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي، ل٢٥٣.

هەڵبژاردنی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بە ڕابەری گشتی بزووتنەوە بە لەبەرچاو گرتنی نەریتی ئایینیو کۆمەڵایەتیی بوو، نەك پڕەنسیپو پێوەری حزبی [1].

ئەم پێکهاتە ناجۆرە، وای لەو پارتە کرد، بە مەبەستی دەرباز بوون لە قەیران خێرا خێرا کۆنگرە ببەستێت، تەنانەت لای زۆرێك لە کادیرانی بزووتنەوە ئەو بۆچوونە چەسپا کە کۆنگرە تەنها هەڵبژاردنی سەرکردایەتییە [2]، چونکە گرفتەکانی بزووتنەوە لە ئەستۆی سەرکردایەتیدایەو هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی ئەو گرفتە چارە دەکات.

بزووتنەوە لە نێوان سالانی (١٩٨٧ ـ ١٩٩٠) دوو کۆنگرەی بەست، کۆنگرەی یەکەمیان کە بە کۆنگرەی چوارەم [*] ناوزەد دەکرێتو لە ژێر دروشمی (سەرخستنی کارو چالاکی جیهادی) لە گوندی (براڵە)ی پێنجوێن لە ڕۆژانی (٢٢ ـ ٢٤ شوال ١٤٠٨ك/ ٦ ـ ٨ حوزەیرانی ١٩٨٨ز) بەستراو تێیدا بارودۆخی ناوخۆی بزووتنەوە هەڵسەنگێنراو پەیڕەوو پڕۆگرامی ناوخۆ پەسەند کراو بەیعەت درا بە شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بۆ ڕابەری گشتیو ئەنجومەنی شوورا هەڵبژێردرا [3].

بە هەمان شێوە لە ڕۆژانی (١٣ ـ ١٦ حوزەیرانی ١٩٩٠) لە ئۆردوگای (دزڵی) لە ژێر دروشمی (وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ)، کۆنگرەی پێنجەم بەستراو تێیدا وێڕای پەسەند کردنی پەیڕەوو پڕۆگرامی ناوخۆ، باس لە کارو چالاکی بزووتنەوە کراو پاشان ئەنجومەنی شوورا هەڵبژێردرا [4].

شوورای نوێ پێکهاتبوو لە: شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، شێخ موحەممەد بەرزنجی، شێخ عەبدوللەتیف واژەیی، عەلی باپیر، مەلا عەلی عەبدولعەزیز، ئەحمەد کاکە مەحمود، شێخ سدیق سەرگەتی، کامیل حاجی عەلی، مەلا مەغدید، مەلا مەحمود ئازادی، مەلا

---

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

[2] سەرچاوەی پێشوو؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەبدولستار مەجید)، ڕانیە، ٢٠٠٤/١٢/١١.

[*] بزووتنەوەی ئیسلامیی خۆی بە درێژەپێدەری بزووتنەوەی پەیوەندی دەزانی، بزووتنەوەی پەیوەندی تا کاتی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی (٣) کۆنگرەی بەستبوو، بۆیە ئەم کۆنگرەیە بە چوارەم دانرا.

[3] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٦، ١٧).

[4] هەواڵەکانی نـــاوخۆ، گۆڤاری دەنگی باوەڕ، ژمارە (١، ٢)، ساڵی سێیەم، ئاب ـ ئەیلول ١٩٩٠، ل ١١.

موحەممەد رازی، مەلا شەریف. دواتریش لە ناو شورا پۆستەکان بەم شێوەیە دەستنیشان کرا: شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بۆ رابەری گشتیی و مەکتەبی سیاسیش پێکهات لە: شێخ موحەممەد بەرزنجی، شێخ عەبدوللەتیف واژەیی، عەلی باپیر، مەلا عەلی عەبدولعەزیز، ئەحمەد کاکە مەحمود، شێخ سدیق سەرگەتی. هەر یەکە لە کامیل حاجی عەلی بۆ بەرپرسی مەکتەبی دارایی، مەلا مەغدید بۆ بەرپرسی کاروباری سەربازی، مەلا مەحمود بۆ بەرپرسی راگەیاندن، موحەممەد رازی بۆ بەرپرسی پەیوەندییەکان، مەلا شەریف بۆ بەرپرسی کاروباری کۆمەلایەتی دانران.

هەر لەو ماوەدا بەرنامەو پەیڕەوو پڕۆگرامی ناوخۆ دانرا، مەکتەبەکان پێکهێنران، پەیکەری ڕێکخستن دەستنیشان کرا، ئەرکو دەسەلاتو مافی ئۆرگانەکان دیاری کرا[1]، هەر چەندە لەو ماوەدا زۆربەی ئەو ئۆرگانو مەکتەبانە پێکهێنران کە لە پەیڕەوو پڕۆگرامدا هاتووە، بەلام لە ڕووی دەسەلاتو ئەرکو ومافەوە بە شێوەیەکی تیۆری مانەوە.

هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەوە چەند بالێك لەناو ئەو پارتەدا دروست بوو، ئەو بالانە لەناو خۆیاندا لە ململانێدابوون، ئەم ململانێیەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ کەسانی بەرژەوەندخواز لەسەر حسابی ناکۆکی ناوخۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان برەو پێبدەن، هەلبەتە هەر ململانێی ناوخۆ دەرگای لە بەردەم ئێرانو نەیارانی بزووتنەوەدا ئاوەلا کرد تا دەستخەنە ناو کاروباری حزبەکەوە.

شێخ عوسمان عەبدولعەزیز لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە بە ڕابەری گشتی هەلبژێردرا، هەر چەندە ناوبراو زانایەکی لەخواترسو شارەزای زانستە شەرعییەکانو جێگەی ڕەزامەندی هەمووان بوو، بەلام لە بواری سیاسیی و کاری ڕێکخراوەیدا کەم ئەزموون بوو، ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ کەسانێك لە دەوروبەری شێخ عوسمانو هەندێ ئەندامی بالای بزووتنەوە کە سوودی خراپ (سوء الاستفادة) لە پلەو پایەی ڕابەری گشتیی و دارایی و پەیوەندییەکانی بزووتنەوە وەربگرن[2]، لێرەوە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ١١.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەل (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

تەکەتول دروستبوو، یاخود باڵی دژ بە دەستێوەردان لە کاروبارەکانی بزووتنەوە دروست بوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو ناکۆکییە زەقتر دەبوویەوە، سەرەنجام دوو باڵ لە ناو بزووتنەوە دەرکەوت، باڵی یەکەم خۆی لە کەسانی دەوروبەری رابەری گشتیدا دەبینییەوە کە باڵی خاوەن بڕیاری ناو بزووتنەوە بوون، باڵی دووەم ئۆپۆزسیۆن یاخود ڕیفۆرمخواز بوون. دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە دوای تێپەڕبوونی چەند مانگ بەسەر راگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا هێشتا هێندێ ئەندامو لایەنگری بزووتنەوەی پەیوەندی نەهاتوونەتە ناو بزووتنەوەوە، هەر بۆیە مەکتەبی ئیرشادی بزووتنەوە لە (٨ جەمادی یەکەمی ١٤٠٨ک/٢٨ کانوونی یەکەمی ١٩٨٧ز) لە بەیاننامەیەکدا داوای پتەوکردنی ریزەکانی بزووتنەوەو دوورکەوتنەوە لە دروستکردنی گرووپی بچووک دەکات[1].

عەلی باپیر ڕێبەرێکی ڕیفۆرمخواز بوو، ناوبراو لە وتارو نووسینەکانیدا بۆچوونی خۆی دەربارەی کێشەو گرفتەکانی بزووتنەوەو شێوازی چارەکردنی خستۆتەڕوو، کتێبی (دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی) دیارترین بەرهەمی عەلی باپیرە کە تێیدا لە (١٨) خاڵدا کێشەو گرفتەکانی بزووتنەوە دیاری دەکاتو دواتریش چارەسەر پێشنیاز دەکات، ناوبراو پێی وایە دەبێت ئەو پێشنیازانە بکرێنە بنەمای کارکردنی بزووتنەوەی ئیسلامیی، چونکە نەبوونی ئەو بنەمایانە قەیرانو گرفتی بۆ بزووتنەوە دروست کردووە، کارکردن بەو بنەمایانە بزووتنەوە لە قۆناغی خڕبوونەوە (تجمع) دەباتە قۆناغی بزووتنەوەیەکی واقیعیەوە. ئەو پێشنیازانەش کە دەبێت بکرێنە بنەمای کارکردن بریتین لە:

١. پێکهێنانی کۆڕی ڕاوێژی ڕاستەقینە.
٢. پەیدابوونی مەرکەزیەتێکی شەرعی ڕاستو لێهاتوو.
٣. دانانی بەرنامەو پەیڕەوێك لەبەر تیشکی قورئانو سوونەتدا.
٤. تێگەیاندنو پێگەیاندنی کۆمەڵێکی هەڵبژاردەی پێشڕەو.
٥. ئازادی ڕا دەربڕینی بیروڕاو وەرگرتنی ڕەخنەو پێشنیازی بەجێ.

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥٦).

٦. مافی فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە بە هەموو کەس بدرێت.

٧. یەک دڵیو یەک ڕیزیو یەک هەڵوێستی.

٨. تەقواو لیهاتوویی بکرێتە سەنگی مەحەکی کار پێ سپێران.

٩. پەروەردەو بارهێنانێکی هاوسەنگ.

١٠. چاوکردنەوەو فێرکردنو هۆشیارکردنەوەی جەماوەر.

١١. چەسپاندنی دادگەری لە هەموو بوارێکدا.

١٢. بەتەنگ خەڵکەوە بوونو چارەسەرکردنی گیروگرفتیان.

١٣. کارکردنی بەردەوامو لێبڕانو گۆڕینی واقیع.

١٤. چاودێریو لێپرسینەوەی خەڵکی بە گشتیو کاربەدەستان بە تایبەتی.

١٥. پشت بە خوا بەستنو لەسەر لاقی خۆ وەستان.

١٦. پاراستنی عیززەتو ئابڕوی ئیسلام.

١٧. نەبەزینو پشوو درێژیو کۆڵنەدان.

١٨. خەڵك چاککردنو بەرەو خوا چوون[١].

لە پەیامێکدا کە ڕۆژی (١٩٨٨/٩/٢٧) لەژێر ناونیشانی (پەیامێکیدڵسۆزانە بۆ ڕابەرایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی) بەناوی (کۆمەڵە موسڵمانێکی خەمخۆرو دڵسۆزو پەرۆش بۆ ئیسلام) بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە دراوە بە گوێپێنەدانی یاساکانی ئیسلام لەلایەن سەرانو براگەورەکانی بزووتنەوەوە، کە ئەمەش بۆتە هۆی پەیدابوونی کەلێنو کونی زۆر لە بزووتنەوەدا، هەر لەو پەیامەدا کۆمەڵێك پێشنیاز بۆ چارەسەری ئەو گرفتانە دانراوە. پەیامەکە دەستنووسەو بە سەرنجدان لە خەتو شێوازی نووسینو داڕشتنی پێدەچێت لەلایەن عەلی باپیرەوە نووسرابێت کە لەو کاتەدا لێپرسراوی هێزی حەمزە بوو[٢].

---

[١] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی وردەکاری ئەم خاڵانەو میکانیزمی ڕیفۆرم لە دیدی عەلی باپیردا بڕوانە: عەلی باپیر: هەمان سەرچاوە، ل٦٢ ـ ١٢٩.

[٢] دەربارەی وردەکاری ئەو پەیامە بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥١)

له سەرەتای ساڵی (١٩٩٠) عەلی باپیرو ژمارەیەك کادیری بزووتنەوە لە ژێر ناوی (کۆڕی راوێژی یەککگرتوو) پێکهاتەیەکیان راگەیاند، ئەم پێکهاتەیە خۆی بە بەشێك لە بزووتنەوە زانیوەو وەك لە بڵاوکراوەکانیشیاندا ئاماژەیان پێداوە، مەبەستیان چاککردن‌و راستکردنەوەی بزووتنەوەیە نەك جوداخوازی[1].

بڵاوکراوەی ژمارە (٩)ی رۆژی (٢١ رەجەب ١٤١٠ك – ١٩٩٠/٢/١٦ن) بەراشکاوی ئاماژە بە ناکۆکی نێو ریزەکانی بزووتنەوە دەکات‌و لەو بارەوە نووسیویەتی: "هەموو لایەك ئاگادارن کە ماوەی (٧– ٨) مانگە پێشمەرگە رەش و رووت نەدارەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی یارمەتی‌یان وەرنەگرتوەو، مەگەر بەدەگمەن دەنا تێیا دا نیە کە قەرزدار نەبێت، جا لەم ماوەیەدا یارمەتی درا بە هەموو هێزەکانی بزووتنەوە، بەڵام هێزی (حمزة) "رضی الله عنه"و هێزی (شافیعي) "رحمه الله" لە یاسای یارمەتی وەرگرتن لەلایەن (رابەری گشتی)یەوە ریزپەڕ کران! خۆشتان دەزانن کە پێشمەرگە فیداکارو بە هەڵمەتەکانی ئەو دوو هێزە هیچیان لە پێشمەرگەی هێزەکانی دیکە کەمتر نیە!!!"[2].

هەردوو هێزی حەمزەو شافعی لە نەیارانی باڵی رابەری گشتیی بزووتنەوە بوون، یەکەمیان لە لایەن عەلی باپیرو دووەمیان لە لایەن هەولێرییەکانەوە سەرپەرشتی دەکرا، هەر بۆیە لە لایەن رابەری گشتییەوە پەراوێز خراون، ئەمەش تا رادەیەك لە بەیاننامەکەدا ئاماژەی پێدراوە، هەر چەندە هیچکام لەو بەیاننامانەمان لەبەردەستدا نییە کە بەر لە ژمارە (٨، ٩) بڵاوکراونەتەوە، بەڵام بە سەرنجدان لە ناوەڕۆکی هەردوو بەیاننامەی ژمارە (٨، ٩)ی کۆڕی راوێژی یەککگرتوو، ئەو راستیەمان لا دەچەسپێ کە

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥٣، ٥٤). بەڵگەنامەی ژمارە (٥٣) کە بەیاننامەی ژمارە (٨)ی کۆڕی راوێژی یەککگرتووە لە (٣ رەجەب ١٤١٠ك – ١٩٩٠/١/٢٩ن) بڵاوکراوەتەوە، واژۆی (٢٦) کەسی لەسەرە کە ئاگادارییەکی گشتییە بۆ سزادانی (٥) کەس کە لە کاتی پێکهێنانی مەفرەزەیەکی (١٠) کەسی جودابوونەوەو خۆیان تەسلیم بە رژێمی بەعس کردۆتەوەو بوونەتە مەفرەزەی تایبەتی بەعس‌و زیان بە بزووتنەوە دەگەیەنن. بۆزانیاری زیاتر لەو بارەوە بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥٣)

[2] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥٤)

ناکۆکی ریزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە ئاستێکی بەرزدا بووەو لایەنە ناکۆکەکان بە تەواوی لە یەکتر دڕدۆنگ بوون.

فاتح کرێکار یەکێکی تر بوو لە ڕێبەرانی ئۆپۆزسیۆن، ئەویش بە شێوەی باڵێکی سەربەخۆ کاری دەکرد، ناکۆکی کرێکار لەگەڵ سەرکردایەتی بزووتنەوە و بە تایبەتیش کەسانی دەوری شێخ عوسمان بە ڕێژەیەك پەرەی گرتووە کە ناوبراو لە (١٩٩٠/١١/٥) لە بزووتنەوە جیابوویەوەو پارتێکی نوێی بە ناوی (کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق)[1] ڕاگەیاند.

بە پێی بەیاننامەی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی ئیسلامیی، چەند خاڵێکی لاواز لە ناو بزووتنەوەدا بوونەتە هۆکاری جیابوونەوەی ئەوان، بە گوێرەی بەیاننامەکە ئەو خاڵانە بریتیین لە:

١- نەبوونی پەیکەرێکی تەنزیمی.

٢- نەبوونی بەرنامەو پرۆگرامی پەروەردەییانە بۆ یەکخستنی بیرو بۆچونی ئەندامان لە ڕووی عەقیدەیی‌و فیکرییەوە.

٣- گرنگی نەدان بە مەرجی تەنزیمی (متمانەو لاوازی – التوثیق والتضعیف) لە بواری تەزکیەو وەرگرتنی خەڵك لە ریزەکانی بزووتنەوە.

٤- لاوازی بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی[2].

بەیاننامەی ناوبراو، بە شێوەیەکی ڕوون باس لە گیرگرفتەکانی بزووتنەوە دەکات‌و ئۆباڵی نەهامەتییەکانی بزووتنەوە بە پلەی یەکەم دەخاتە ئەستۆی کەسانی دەوروبەری ڕابەری گشتیی‌و لەو بارەوە نووسیویەتی: "دیاردەی هەرە زەقی لاوازی بەڕێوەبەرایەتی بەشی دارایی شاردنەوەی چەندو چۆنیەتی پارە هاتن‌و خەرج کردنی بوو.. تەنانەت تێکڕای ئەندامانی شورای باڵا کەسیان ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاگاداری هیچ

---

[1] بۆزانیاری زیاتر دەربارەی کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستان بگەڕێرەوە بۆ (بەشی چوارەم) (باسی سێیەم).

[2] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٦٦).

مەسەلەیەکی دارایی نەبوون، لەسەر ئەم نالەباریەشەوە کۆمەڵێ مشەخۆرو گەنەی بەرژەوەند وویست لەدەوری رابەر چەکەرەیان کردبوو .. بەکەیفی خۆیان لەسەر پارەو ماڵی هەتیوو بێوەژنی هەناسە ساردی کورد دەلەوەڕانو کەس نەیدەزانی چۆنو بۆچی ئەو پارەو ماڵەی چاکەخوازان دەینێرن بۆ بزووتنەوە ئاوا دەخرێتە خزمەتی هەواو هەوەسی تاقمێك زەروو.."[1]. لە برگەیەکی تری هەمان بەیاننامەدا، باس لەوە دەکات کە باڵی ئۆپۆزسیۆن هەوڵێکی زۆریان خستۆتەگەڕ بۆ چاککردنی دۆخی بزووتنەوەو لەو ڕووەوە لە کاری خۆیان بەردەوام بوون، بەڵام کەسانی دەورووپشتی رابەر کۆسپی بەردەم چاکسازی بوون، هەر بۆیە بەیاننامەکە نووسیویەتی: "ئێمە لەکاری خۆمان بەردەوام بووین .. لەولاشەوە بەردەوام گەنە مشەخۆرەکانی دەورووپشتی مامۆستا مەلا عثمان کەندو کۆسپێکی زۆریان دەخستینە سەر رێ .. تا دەهات کار ئاڵۆز تر دەبوو.."[2].

باڵی ئۆپۆزسیۆن لە ناوخۆیاندا یەکگرتوو نەبوون، دەربارەی میکانیزمی ڕیفۆرم بۆچوونی جودایان هەبوو. دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە خەڵکانێك هەبوون خوازیاری ئەوەبوون بە ناوی ڕیفۆرمەوە بەرژەوەندی تایبەتییان دەستکەوێت[3]. لەگەڵ ئەوەدا کە ئۆپۆزسیۆن یەکڕیزو یەکگرتوو نەبوون، هاوکات پرۆژەیەکی گشتگیرو ستراتیژیشیان نەبوو، خۆشیان کۆمەڵێك گرفتو کەموکورتیان هەبوو، هەندێ جاریش ڕیفۆرمو بەرژەوەندی تایبەتییان تێکەڵ دەکرد[4]، تێکڕای ئەم هۆکارانە وای کرد لەو قۆناغەدا ڕیفۆرم ئامانجەکانی خۆی نەپێکێ.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر سەرنج لە پەیڕەوو پڕۆگرامی ناوخۆی بزووتنەوە ئیسلامیی بدەین، دەبینین هەر لە بنەڕەتەوە پەیڕەو پڕۆگرام نەك چارەسەری دەسەڵاتی ئۆرگانەکانی نەکردووە، بەڵکو بۆتە هۆکارێکی سەرەکی دروستبوونی کێشەی ناوخۆی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

[4] مجموعة من الباحثين: رؤى في مسار العمل الإسلامي، ل٢٥٢.

بزووتنەوە، بەشێکی کەمو کورتییەکە لەوەدایە کە ڕابەری گشتی هاوکات ڕابەری ڕۆحیو بەرپرسی مەکتەبی سیاسییو ئەنجومەنی شوورایە[1].

دەبوو ئەم هەموو دەسەڵاتە تێکەڵ نەکرایە، ڕابەری گشتیی پیرۆزی خۆی هەبوایەو ڕێبەری ڕۆحیو دەسەڵاتی یەکلاکردنەوەی ناکۆکی نێوان شووراو مەکتەبی سیاسیی هەبوایە، نەك بەرپرسی مەکتەبی سیاسییو شوورا بێت، هاوکات دەبوو مەکتەبی سیاسیی دەسەڵاتی جێبەجێکردن بێتو شووراش بەرنامەداڕێژی حزب. ئەگەر سەرنج لە واقیعی بزووتنەوە بدەین ڕاستیو دروستی ئەو بۆچوونەی پێشوومان بۆ دەسەلمێت، لە کاتێکدا تەواوی ئەندامانی بزووتنەوە لە ڕووی ئاینییەوە متمانەیان بە لێهاتوویی شێخ عوسمان هەبوو کە ببێتە ڕابەری گشتیی، بەڵام زۆرێك پێیان وابوو ناوبراو لە ڕووی سیاسییو کارگێڕییەوە کەم ئەزموونەو ناتوانێت کاروبارەکانی بزووتنەوە باش هەڵسوڕێنێ.

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٧٠). بەپێی نووسراوی نووسینگەی ڕابەری گشتی بزووتنەوە، ژمارە (١٨٧) ڕۆژی (٢٤ موحەڕەم ١٤١٠ك/ ٢٤ ئاب ١٩٨٩ز) ڕابەری گشتی بزووتنەوە جگە لەو پۆستانەی لە پەیڕەوی ناوخۆ پێی دراوە بۆتە بەرپرسی نووسینگەی سەربازیش، بێگومان ئەمەش جگە لە بەردەوام بوون لەسەر هەڵەی تێکەڵ کردنی دەسەڵاتەکان هیچی تر نییە. بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٤٣).

## باسی دووەم: پێگەی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا

### یەکەم: بواری سیاسیی

هەر چەندە بزووتنەوەی ئیسلامیی لە سەرەتای ڕاگەیاندنییەوە گیرۆدەی کۆمەڵێك گرفتی ناوخۆیی بوو، بەڵام لە گەلێك بواردا چالاکانە هەڵدەسوڕا، لە ڕووی سیاسییەوە لە گۆڕەپانی کوردستاندا ڕۆڵو کاریگەری هەبوو، هەوڵیدا لە دیدێکی ئیسلامییەوە کێشەی کوردو ڕێگە چارەی بخاتەڕوو.

بزووتنەوە لە بواری سیاسییدا چالاکی جۆراو جۆری دەنواند، لە (حوزەیرانی ١٩٨٧) لە شاری تاران خۆنیشاندانێکیان سازدا بۆ بەردەم باڵیۆزخانەکانیی سعودیە، بەریتانیا، فەڕەنسا، ئەردەنو بارەگای خاچی سووری نێودەوڵەتی، سەبارەت بە ستەمی بەعس نامەڕازیینامەیان ئاراستەی باڵیۆزخانەکان کرد[١].

هەروەها لە ساڵڕۆژی کارەساتی هەڵەبجەدا، ڕۆژی (١٩٨٩/٣/١٦) چەندین خۆنیشاندان لە ئۆردوگاو شارەکانی ئێران سازدرا[٢]. هەر لەو یادەدا ڕۆژی (١٩٨٩/٣/١٨) لە ژێر دروشمی (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ)، بزووتنەوەی ئیسلامیی، کۆنگرەیەکی لە شاری سنە ڕێکخست، نوێنەرانی پارتە کوردستانییەکانو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانو کۆماری ئیسلامیی ئێران بەشداریان تێداکرد، لەو کۆنگرەدا چەند وتار دەربارەی کارەساتەکە خوێندرایەوە، لە کۆتایشدا بەلاغێك ڕاگەیەنرا[٣].

بوارێکی دیکەی چالاکی بزووتنەوە، بەشداریکردن بوو لە کۆڕو کۆبوونەو کۆنگرە جیهانییەکاندا، لەو کۆنگرانەدا نوێنەرانی بزووتنەوە وتاریان پێشکەش کردوەو دیدارو کۆبوونەوەیان لەگەڵ بەشداربووانی کۆنگرە ئەنجام داوەو هەوڵیانداوە چەوساوەیی گەلی کوردو کێشەی کورد بە جیهانی ئیسلامیی بناسێننو پێویستی پشتگیریکردنی

---

[١] هەواڵەکان، گۆڤاری دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، کانونی دووەمی ١٩٨٨، ل ٤٨ ـ ٤٩.

[٢] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٨)، نیسان ـ مایس ١٩٨٩، ل ٢٦.

[٣] لەیادی یەکەمین ساڵی کارەساتی هەڵەبجەدا، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٨)، ل ١٤ ـ ١٦.

دۆزە ڕەواکەی بەدیاربخەن. لە ڕۆژانی (١٢ ـ ١٧ ڕەبیعی یەکەمی ١٤٠٨ك/ ٣ ـ ٨ تـشرینی دووەمی ١٩٨٧) لە تاران (کۆنفراسی جیهانی یەکێتیی ئیسلامیی ) بەسترا، چەند کەسایەتییو پارتی ئیسلامیی بەشداریان تێدا کرد، شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بە سەرۆکایەتی وەفدی بزووتنەوە بەشداری کرد، ناوبراو وتارێکی خوێندەوە، لە پەراوێزی کۆنگرەکەشدا وەفدی بزووتنەوە چەندین دیداری ئەنجامدا[1].

هەروەها وەفدی بزووتنەوە بە سەرۆکایەتی شێخ عوسمان، بە شداریکرد لە (کۆنفراسی جیهانی ئاسایشی حەج) کە لە (١ ـ ٥ ڕەبیعی دووەمی ١٤٠٨ك/ ٢٢ ـ ٢٦ تشرینی دووەمی ١٩٨٧) لە تاران بەسترا، شێخ عوسمان وتاری پێشکەش کردو لە پەراوێزی کۆنگرەکەشدا وەفدی بزووتنەوە چەندین دیداری ئەنجامدا[2]. هەر لەو ماوەدا شێخ موحەممەد بەرزنجی بەشداری لە (کۆنگرەی زانایانی موجاهیدی عێراق) لە شاری (قوم) کرد، ناوبراو وتارێکی خوێندەوە[3].

هەروەها لە ڕۆژانی (٣ ـ ١٩٨٩/١٠/٤) وەفدێکی بزووتنەوەی ئیسلامیی کە پێکهاتبوو لە (شێخ عوسمان عەبدولعەزیز، مەلا عەلی عەبدولعەزیز، مەلا مەحمود ئازادی) بەشداریان کرد لە ( کۆنگرەی جیهانیی ئەفغانستان) لە تاران، لەو کۆنگرەدا چەند کەسایەتیی ئیسلامییو نوێنەری پارتو ڕێکخراوە ئیسلامییەکان بەشدار بوون، وێڕای خوێندنەوەی وتارێك لەلایەن مەلا عەلی عەبدولعەزیزەوە، لە پەراوێزی کۆنگرەکەدا، وەفدی بزووتنەوە چەندین دیدارو گفتوگۆی لەگەڵ نوێنەری پارتو دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئەنجامدا[4].

هەروەها لە (٤ کانونی یەکەمی ١٩٩٠) لە تاران ( کۆنگرەی ئیسلامیی فەلەستین) بەڕێوەچوو، شێخ عوسمان عەبدولعەزیزو شێخ موحەممەد بەرزنجی بە نوێنەرایەتی بزووتنەوە بەشداریان تێدا کرد، لە پەراوێزی کۆنگرەکەدا دیدارو چاوپێکەوتنیان لەگەڵ

---

[1] هەواڵەکان، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل ٥٠.
[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠ ـ ٥١.
[3] سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١ ـ ٥٣.
[4] هەواڵو چالاکیەکان، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١٠، ١١)، تەمموز ـ تشرینی یەکەمی ١٩٨٩، ل ٢٥.

چەندین کەسایەتیی‌و ڕێکخراوی ئیسلامیی ئەنجامدا، لەو دیدارانەدا باس لە کێشەی کوردو پێویستی هاوکاریکردنی موسڵمانانی کوردستان کرا[1]. هەروەها وەفدی بزووتنەوە بەشداری کرد لە (کۆنگرەی خوێندکارانی ئیسلامیی جیهانی پشتگیری لە کوەیت) کە لە (٢٥ ـ ٢٨ تشرینی دووەمی ١٩٩٠) لە (شارقە) بەسترا، لە کۆتاییدا کۆنگرە پەیامێکی ئاراستەی گەلی کورد کرد[2].

بزووتنەوەی ئیسلامیی هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنییەوە، لە ژمارەیەك وڵاتی ناوچەکەو ئەورووپا نووسینگەی پەیوەندییەکانی کردەوەو پەیوەندی دامەزراند، ئەمەش لە ڕووی سیاسییەوە بۆ ناساندنی کێشەی کوردو بزووتنەوەی ئیسلامیی سوودی لێدەبینی، تا پەیوەندی بە جیهانی دەرەوەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکانەوە بکات[3].

سەرکردایەتی بزووتنەوە لە ڕێگەی نووسینگەی پەیوەندییەکانەوە، چەندین نامەو نووسراوی جۆراو جۆری ئاراستەی وڵاتانی جیهان‌و ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان کرد، ڕۆژی (٢٧ زیلقەعدەی ١٤٠٧ك/ ٢٣ تەمموزی ١٩٨٧ز) ڕابەری گشتی بزووتنەوە چەندین نامەی ئاراستەی وڵاتە ئیسلامییەکان‌و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤو کەسایەتییە ئیسلامییەکان کرد، شێخ عوسمان لەو نامانەدا باسی لە دڕندەیی ڕژێمی بەعس‌و ستەمی ئەو ڕژێمەی دەرحەق بە خەڵکی عێراق‌و کورد کرد، هەروەها داوای لێکردن چیتر هاوکاری‌و کۆمەکی حکومەتی عێراق نەکەن[4].

بە بۆنەی کارەساتی کیمیاییبارانی گوندو شارۆچکەکانی کوردستان، ڕابەری گشتیی بزووتنەوە لە (١٩٨٨/٣/٢٣) نامەیەکی ئاراستەی چەند ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی کرد، ناوبراو لەو نامانەدا ڕایدەگەیەنێت کە بێدەنگی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان ڕێگەخۆشکەر بووە بۆ تاوانەکانی ڕژێمی بەعس، لەو ڕووەوە نووسیویەتی: "بۆ جاری

---

[1] هەواڵ‌و چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٥، ٦)، ساڵی سێیەم، کانونی (١ ـ ٢) ١٩٩٠ ـ ١٩٩١، ل ١٢.

[2] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٢).

[3] محمد نوري بازياني: هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

[4] هەواڵەکان، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل ٤٩.

دووەم ئاگادارتان دەکەینەوە لە بێدەنگیو چاوداخستننتان بەرامبەر ئەو هەموو تاوانە درندانەی ڕژێمی بەعسی عێراقی کە ڕەشترین لاپەڕەی مێژووی بۆ خۆی نووسیوەو ئەو هەموو کوشتارو قەلاچۆکردنەی گەلی عێراقی هەژارو گەلی کوردی چەوساوە بە تایبەتی شێوە کارەساتو بنبڕ کردنێکی نەوەی مرۆڤە"[1]. هەر لەو نامەدا شێخ عوسمان ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت بۆ هاوکارییو ڕێنمایی نوێنەری ڕێکخراوەکان تا ئاکامی ئەو کارەساتە گەورە ببینن، لە کۆتایشدا ئەوەیان یاد دەخاتەوە کە ڕاستی ئەو ڕێکخراوانە لە کردەوەدا دەردەکەوێت نەك ناونیشانی بێ ناوەڕۆك[2].

بە هەمان شێوەی پێشوو، شێخ عوسمان لە (٢٥ تەمموزی ١٩٨٨) نامەیەکی دیکە دەنێرێت بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەککرتووەکان، ناوبراو لەو نامەدا جارێکی دیکە ئاماژە بە ستەمی بەعس دەکاتو داوا لە نەتەوە یەککرتووەکان دەکات بە ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی هەستێت کە گرنگیدانە بە کێشەی کوردو ڕزگارکردنیەتی لەو کۆمەلکوژییەی ماوەی (٢٠) ساڵە حکومەتی عێراق پەیڕەوی لێدەکات[3]. جارێکی دیکەش لە (بەهاری ١٩٨٩) شێخ عوسمان نامەی ناردووە بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەککرتووەکانو داوای لێکردووە نوێنەری خۆی بنێرێتە کوردستان تا ڕاستییەکانی بۆ دەرکەوێتو چەوساوەیی گەلی کورد ببینێ[4].

هەر لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (١٩٨٩/١٠/٢) یادخەرەوەیەکی دەربارەی تاوانو وێرانکارییەکانی حزبی بەعس لە کوردستان دایە ئەنجومەنەکانی پەرلەمانی (١٧) دەوڵەتی ئەورووپیو ئەمریکیو ئاسیاییو عەرەبی[5].

لەو چالاکییە جۆراو جۆرانەدا بزووتنەوەی ئیسلامیی توانیبووی خۆی وەکو نوێنەری کورد بناسێنێو مەزلومیەتو ڕەوایەتی کێشەی کوردو ستەمی بەعس

---

[1] بڕوانە بەلگەنامەی ژمارە (١٨).

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] بڕوانە بەلگەنامەی ژمارە ( ١٩).

[4] نامەیەك بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەککرتووەکان، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٨)، ل٢٢.

[5] هەواڵو چالاکیەکان، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١٠، ١١)، ل ٣١.

دەربخات، هەر بۆیە لە کارەساتو بۆنە جۆراو جۆرەکاندا نامەو نووسراو ئاراستەی ڕابەری گشتیو سەرکردایەتی بزووتنەوە کراوە، لە نامەی (فەزل ڕەحمان خەلیل) ئەمیری بزووتنەوەی موجاهیدین بۆ شێخ عوسمان بە بۆنەی کارەساتی هەڵەبجەوە کە سەرەخۆشی لێدەکات[1]، هەروەها نامەی (حیکمەت یار) ئەمیری حزبی ئیسلامیی ئەفغانستان بۆ شێخ عوسمان بە بۆنەی کارەساتی هەڵەبجەوە[2]، ئەو ڕاستییە دەردەکەوێت.

## دووەم: بواری سەربازی

بەر لە ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی، بزووتنەوەی پەیوەندی باڵێکی سەربازی هەبوو بەناوی لەشکری قورئان، لەگەڵ ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی، لەشکری قورئان بەهێزکراو گرنگی زیاتری پێدراو چەند هێزێکی بۆ زیادکرا[3].

هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەدا، چەند بەیاننامەیەکیان دەرکرد، لەو بەیاننامانەدا، بزووتنەوەی ئیسلامیی داوای لە هێزە سەربازییەکانی عێراق کردوە کە بەگژ ئەو ڕژێمەدا بچنەوەو بێنە ڕیزی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، لەو ڕووەوە بزووتنەوە لە پەیامێکدا ڕۆژی (١٩٨٧/١٢/٣) داوا لە چەکدارانی ڕژێمی بەعس دەکات، پەشیمان ببنەوەو دەستبەرداری ئەو کارە بن، لەجیاتی ئەوە چەکی جیهاد هەڵگرنو کاربکەن بۆ سەرخستنی ستەملێکراوان[4]. هەر لەو بەیاننامەدا، بزووتنەوە دوا لە سەرجەم چینو توێژەکان دەکات بۆ کۆتایهێنان بە ستەمی بەعس پشتیوانیو کۆمەکی پێشمەرگە بکەن[5]. لە بەیاننامەیەکی تردا لە (٤ ڕەجەب ١٤١١ک/ ١٩ کانونی دووەمی ١٩٩١ز) داوا دەکات هێزە سەربازییەکان ئەرکی خۆیان بەجێ بێننو هەستن بە ڕووخاندنی سەددامو داروودەستەکەی، بەو ئومێدەی عێراق لە نەهامەتی بپارێزن[6].

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٠).

[2] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢١).

[3] باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی سێیەم، ل١٥.

[4] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٣).

[5] سەرچاوەی پێشوو.

[6] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٤).

ئەگەری ئەوە هەیە دەربارەی کوشتنی ئەو جاش‌و سەربازو بەرگری میللی (جیش الشعبي)یانەی کەوا ڕژێمی بەعس هەندێکیانی بە زۆرلێکردن چەکدار کردووەو ناردونی بۆ بەرەکانی شەڕ، پرسیاری زۆر ئاراستەی سەرکردایەتی بزووتنەوە کرابێت، هەر بۆیە بزووتنەوە فتوایەکی بڵاوکردۆتەوەو تێیدا کوشتنی ئەوانە بە ئەرکێکی پیرۆز ناوزەد دەکات‌و لە بڕگەیەکی فتواکەدا هاتووە: "کوشتاری داروەستەو هێزە جۆر بە جۆرەکانی ڕژێمی بەعسی تێکدەری تاڵانکەر، بە سەدان بەڵگەی ئایەت‌و حەدیس‌و فتوای زانایان پیرۆزترین کارو گەورەترین ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە"[1].

هەروەها لە بڕگەیەکی تردا هاتووە: " کوشتاری هێزەکانی بەعس بە ئەمن‌و جاش‌و سەربازو جەیشی شەعبیەوە ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینەیەو بەشداری تیانەکردنی تاوانێکی گەورەیە بەرامبەر خواو ئیسلام‌و موسڵمانان"[2].

هەر لەو ماوەشدا کە حکومەتی عێراق چەند جارێك لێبووردنی گشتی دەرکردووە، بزووتنەوەی ئیسلامیی، لەو بارەوە لە چەند بەیاننامەیەکدا هەڵوێستی خۆی دەربڕیوەو داوا لە جەماوەر دەکات بەدەم ئەو بانگەوازەی ڕژێمی بەعسەوە نەچن[3]. لە بەیاننامەیەکیاندا هاتووە : "بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق بە جیهادی چەکدارانە داوا لە هەمووان دەکات بۆ یەکێتی‌و پتەوکردنی باوەڕو ڕیزەکان‌و هەرکەس توانای کاروانی سەختی جیهادی هەیە لووتکەی کێوەکانی کوردستان چاوەڕوانی دەکات جا سەرکەوتن‌و ئاسوودەیی دونیایی یان شەهیدی‌و ئاسوودەیی یەکجاری کە هەردووکیان سەرکەوتنن"[4].

هەروەها لە بڕگەیەکی ئەو بەیاننامەدا کە لە ژێر ناونیشانی (کێ شایانە عەفوو بکرێ؟!) بڵاوکراوەتەوە هاتووە:" یەکیەتی ڕیزەکانتان بپارێزن‌و با هەموو ئەندامێکی

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٥).
[2] سەرچاوەی پێشوو.
[3] بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (٢٦، ٢٧، ٢٨، ٢٩، ٤٢).
[4] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٦).

لەشتان‌و گیان‌و دڵو دەروونتان‌و وێردی سەر زوبانتان تۆڵەسەندنەوە بێت‌و هەرگیز تاوانەکانی بەعسی خوێن خۆرتان لە بیر نەچێت"[1].

لە تێکڕای بەڵگەنامەکاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، بزووتنەوە هەوڵیداوە لە ڕەهەندی ئایینی‌و سیاسیی‌و مرۆییەوە، ستەمکاری بەعس دەرخات‌و پێویستی بەرەنگاربوونەوەی بسەلمێنێت، دەرکردنی فتوای پیرۆزی کوشتاری کارەبەدەستانی بەعس‌و داروودەستەکەی، چەند بەیاننامە دەربارەی لێبووردنی حکومەتی عێراق، کە لەو بەیاننامانەدا بزووتنەوە داوا دەکات لە جیاتی گەڕانەوە ژێر دەستی بەعس، لە تۆڵە سەندنەوەو خەبات بەردەوام بن، بە گشتی دەچنە ئەو چوارچێوەوە.

بزووتنەوەی ئیسلامیی، لە سەرەتای ڕاگەیاندنییەوە لە هەوڵی ئەوەدا بوو پەرە بە چالاکی سەربازی بدات، لەو بارەوە بەڕێوەبەرێتی ئەمنی پارێزگای هەولێر بە نووسراوی ژمارە (ش. س ٣١٢/٥) لە (١٩٨٨/١/٧) چەند زانیارییەك لەسەر بزووتنەوە دەنێرێت بۆ بەڕێوەبەرێتی ئەمنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، لەو نووسراوەدا هاتووە: بزووتنەوەی ئیسلامیی مەکتەبی سەربازی هەیەو خاوەن چوار هێزەو لە کۆبوونەوەیەکی بەرفراواندا هەوڵیانداوە بەرنامەڕێژی بکەن بۆ چالاکی نواندن[2].

هێزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە چالاکی نواندن بەرامبەر ڕژێمی بەعس شێوازی جۆراوجۆریان دەگرتەبەر، یەکێك لەو شێوازانە نانەوەی بۆسەو دانانی کەمین‌و بۆمب بوو لەسەر ڕێگەی هێزە سەربازییەکانی حکومەتی عێراق، لە چەند نووسراوی بەڕێوەبەرێتی ئەمنی پارێزگای هەولێر باس لە کارو چالاکی مەفرەزەکانی بزووتنەوە کراوە کە لە سەر ڕێگە گشتییەکان بۆسەیان ناوەتەوەو بڵاوکراوەیان بەسەر هاوڵاتیاندا دابەشکردووەو ئاگاداریان کردوونەتەوە کە هاوکاری دەسەڵات نەکەن[3]، لێرەدا هەندێك لەو چالاکیانەی بزووتنەوە دەخەینەڕوو:

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٢٨).

[2] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣٠).

[3] بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (٣١، ٣٢).

ئێوارەی (١٩٨٧/١٢/١٦) پێشمەرگەکانی لقی (١)ی هێزی سەلاحەددین لە (بابەناوزن) کەمینێکیان دانا، هاوکات سەربازانی ڕژێم ویستیان لەو ناوچەدا کەمین دانێن، پێشمەرگەکان دەستپێشخەریان کردو هێرشیان کردە سەر سەربازەکانو ژمارەیەکیان لێ کوژراو بریندار بوو[1]. هەروەها مەفرەزەی شەهیدان سەر بە هێزی سەلاحەددین، شەوی (١٩٨٨/١/٧) چەند مینێکیان لەسەر ڕێگەی خورماڵ ـ ئەحمەداوا دانا، لە هەمان شەودا مینەکان تەقینەوەو بووە هۆی سووتانی زیلێکی سەربازیو کوژرانی (٣) سەربازو بریندار بوونی (٢) سەربازی تر[2].

ڕۆژی (١٩٨٩/٦/٧) مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین، لەسەر ڕێگای خورماڵ ـ شیرەمەڕ مینێکیان دانا، مینەکە تەقیەوەو بووە هۆی تێکشکانی ئیڤایەكو کوژرانی (٨) سەرباز[3]. هەروەها ڕۆژی (١٩٨٩/٦/١٦) مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین مینێکیان لەسەر ڕێگەی خورماڵ ـ ئەحمەداوا دانا، مینەکە بە لاندکرۆزەرێکی سەربازیدا تەقیەوە کە چەند لێپرسراوێکی بەعسی تێدابوو هەموویان کوژران[4]. هەروەها شەوی (١١ موحەڕەم ١٤١٠ك/ ١٢ ئاب ١٩٨٩) مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین مینێکیان لەسەر ڕێگەی خورماڵ ـ شیرەمەڕ دانا، مینەکە بە ئیڤایەکی سەربازیدا تەقیەوەو ئیڤاکە سووتاو سەرجەم سەرنشینەکانی کوژران[5].

مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین لە (١٨ ئەیلولی ١٩٨٩) مینێکیان لەسەر ڕێگەی شیرەمەڕ ـ یالانپێ دانا، مینەکە بە ئیڤایەکدا تەقیەوەو بووە هۆی کوژرانی (١١) سەربازو بریندار بوونی (٣) سەربازی تر[6]. هەروەها مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین

---

[1] چالاکیەکانی پێشمەرگە، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل٥٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦.

[3] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٩)، حوزەیران ـ تەمموز ١٩٨٩، ل٣٤.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨.

[5] چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١٠، ١١)، ل٣٨.

[6] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢؛ أخبار النفير، مجلة النفير، العدد (٥)، شباط ١٩٩٠، ل٤٢.

شەوی (١٩٨٩/١٠/١٧) مینێکیان لەسەر ڕێگەی ئەحمەداوا دانا، مینەکە تەقیەوەو وێڕای سووتانی ئیڤایەك (١٩) سەرباز کوژران کە سەرنشینی ئیڤاکە بوون[١].

لە مانگی (مارسی ١٩٨٨) پێشمەرگەکانی هێزی شافعی بۆسەیەکیان لەسە ڕێگەی هەولێر ـ کۆیە نایەوە، سەرەنجام (١٠) جاش کوژران‌و (٥)ی تریش بەدیل گیران بەم ناوانە (قاسم کلو قاسم، کشتار عەلی جلو، نەوزاد تاهیر عومەر، ئەحمەد جەوهەر، تەها عەبدوڵلا)[٢].

مەفرەزەیەکی هێزی شافعی لە (٢٢ کانونی دووەمی ١٩٨٨) لەسەر ڕێگای هەولێر ـ کۆیە بۆسەیەکی نایەوە، لە ئەنجامدا (٣) جاش بە دیل گیران لەگەڵ ئۆتۆمبیلێکی پیکاب. چەند ڕۆژێك دواتر لەسەر ڕێگەی کۆیە بۆسەیەکی دیکەیان نایەوە، سەرەنجام (٣) جاش بە دیل گیران لەگەڵ ئۆتۆمبیلێکی برازیلی. هەروەها لە (مارسی ١٩٨٨) لە گوندی (گۆمەتاڵ) کەمینێکیان داناو سەرەنجام (٢) جاش کوژران‌و چەندانی دیکە بریندار بوون[٣].

ڕۆژی (١٩٨٩/٥/١٢) مەفرەزەیەکی تیپی (١)ی هێزی خالیدی کوڕی وەلید لە نزیك چوارتا بۆسەیەکیان نایەوە، لە ئەنجامدا (٣) سەرباز بە دیل گیران بەناوی (یوسف حەمید ئەحمەد، موحەممەد عەبدوللەتیف ئەحمەد، مونعیم زەعلان عامر)، هەرسێکیان سەر بە فەیلەقی (١) وەحدەی (٢٠٧١) فەوجی (١) سریەی (٢) فەسیلی (٤) بوون، ئەمە سەرەڕای دەستکەوتنی (١) ئار بی جی، (١) کلاشینکۆف، ژمارەیەکی زۆر فیشەك‌و گوللە ئار بی جی[٤]. هەروەها مەفرەزەیەکی هێزی خالید ڕۆژی (١٩٨٩/٥/٢١) لە ناوچەی پێنجوێن بۆسەیەکیان داناو (٢) سەربازیان بە دیل گرت بەناوی (عەلی عەواد سلێمان، عزەدین عەبدولواحید عەلی)[٥].

---

[١] چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١٠، ١١)، ل٣٨.

[٢] هەواڵ‌و چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٢، ٣)، تەمموز ـ ئاب ١٩٨٨، ل٣٨.

[٣] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

[٤] هەواڵ‌و چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٩)، ل٣٨.

[٥] أخبار النفير، النفير، العدد (٤)، ذو الحجة ١٤٠٩/ تموز ١٩٨٩، ل٢١.

ڕۆژی (٢٧ ئاب ١٩٨٨) پێشمەرگەکانی هەر سێ هێزی (حەمزەو سەرکەوتن‌و خالید) لە (قرناقە) بۆسەیەکیان نایەوە، ئۆتۆمبیلێکی سەربازی ڕژێم کەوتە بۆسەکەوەو سووتاو سەرنشینەکانی کوژران. هەروەها (٧) جاش کەوتنە بۆسەکەوەو کوژران. هەر لەو ڕۆژانەدا پێشمەرگەکانی هێزی حەمزە بۆسەیەکیان نایەوەو ئۆتۆمبیلێکی سەربازی ڕژێمیان سووتاندو سەرنشینەکانی کوژران[1].

شێوازێکی تری چالاکی پێشمەرگەکانی بزووتنەوە، هەڵکوتانە سەر مۆڵگەو بارەگاکانی حکومەتی بەعس بوو، بۆ ئەم شێوازی چالاکییەش چەند نموونەیەك دێنینەوە:

ڕۆژی (١٩٨٧/١١/٢) مەفرەزەیەکی هێزی شافعی هێرشیان بردە سەر سەنگەرەکانی جاش لە ناوچەی (بەستۆرە)و تێکڕای جاشەکانی بارەگاکە کوژران‌و دەستکەوتی پێشمەرگەکانیش (٥) کلاشینکۆف‌و (١) ئار بی جی بوو[2].

پێشمەرگەکانی پەل (١، ٢) لقی (٣)ی هێزی سەلاحەددین ڕۆژانی (٢٢ – ١٩٨٧/١١/٢٥) چەند جارێك هێرشیان کردە سەر مۆڵگەکانی حکومەتی عێراق لە (سەرگەت)و تەواوی ڕەبیەکان تێکدران، ئەوەی زانراوە زیانی حکومەت کوژرانی (٣) سەربازو برینداربوونی چەند سەربازی تر بوو[3].

هەروەها ئێوارەی (١٩٨٧/١١/٢٧) جارێکی تر پێشمەرگەکانی هێزی سەلاحەددین هەڵیانکوتایە سەر ڕەبیەکانی (سەرگەت)و جگە لە تێکدانی ڕەبیەکان (٣) سەرباز کوژرا[4].

ڕۆژی (١٩٨٩/٦/٢٣) مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین هێرشیان کردە سەر بارەگایەکی حکومەتی بەعس لە ئەحمەداوا، وێڕای زیانی ماددی چەند سەرباز کوژراوو بریندار بوون[5]. هەروەها مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین ڕۆژی (١٩٨٩/٨/١٣)

---

[1] ئەرشیفی بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی بەرگری، ئا: ئاوات کوێستانی، کۆمەڵ، ژمارە (٦)، ٢٠٠١/٨/١٦.

[2] چالاکیەکانی پێشمەرگە، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل٥٤.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥.

[4] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥.

[5] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٩)، ل٣٨.

هەڵیانکوتایە سەر بارەگایەکی حکومەت لە (خورماڵ)، پێشمەرگەکان دەستیان گرت بەسەر بارەگاکەداو (٢) سەربازیان بە دیل گرتو دەستکەوتە ماددیەکانیش بریتیی بوون لە: (١) هاوەنی (٨٢) ملم، (٤) کلاشینکۆف[١].

شەوی (١٩٨٩/١٠/٧) مەفرەزەیەکی هاوبەشی هێزی سەلاحەددینو خالید هەڵیانکوتایە سەر مۆڵگەیەکی حکومەتی بەعس لە (بانی بنۆك)، وێڕای سووتانی بنکەکە (٥) سەرباز کوژراو (٢) سەربازی تر بریندار بوون[٢].

مەفرەزەیەکی هێزی شەهیدان شەوی (١٩٨٨/١/٩) چوونە سەر مۆڵگەی جاشەکانی فەوجی (١١٦) لە (زەمەقی)و بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك بە چەند جۆرە چەکێك لێیاندانو زیانیان پێگەیاندن[٣].

دەستەیەك پێشمەرگەی هێزی سەرکەوتن بۆ کاروباری بزووتنەوە چوونە ناو شاری هەڵەبجە، شەوی (١٩٨٧/١١/١٨) لە کاتی گەڕانەوەیاندا پەلاماری مۆڵگەی سیخوڕی حزبی بەعسیان لە هەڵەبجە دا، زیانی ماڵیو گیانیان بە هێزەکانی بەعس گەیاند[٤].

ڕۆژی (١٩٨٩/٥/١٣) پێشمەرگەکانی تیپی (١)ی هێزی خالید چوونە ناوچەی شارباژێڕ بە مەبەستی گورزوەشاندن لە حکومەت، دوای چەند شەڕێك ئەم دەستکەوتانەیان هەبوو: (٥٠٠) گوللە ئار بی جی، (١٨٠) گوللە هاوەنی (٦٠) ملم، (٤٠٠٠) فیشەکی کلاشینکۆفو بی کەی سی، (٤٠) ڕومانەی دەستی[٥].

شێوازێکی تری چالاکی سەربازی بەرپەرچدانەوەی هێرشی هێزەکانی حکومەت بوو کە دەیکردە سەر ناوچە ئازادکراوەکانو هێزەکانی بزووتنەوە، لێرەدا چەند نموونەیەك بۆ ئەو شێوازەش دێنینەوە:

---

[١] أخبار النفير، النفير، العدد (٥)، ل٤١.

[٢] چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١٠، ١١)، ل٣٩.

[٣] چالاکیەکانی پێشمەرگە، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل٥٦.

[٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦.

[٥] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٨)، ل٢٧.

ڕۆژی (١٩٨٧/١٠/١) حکومەتی بەعس هێرشێکی گەورەی بە پاڵپشتی (٢٣) فەوجی جاشو (٨) فڕۆکە کردە سەر بنکەکانی پێشمەرگە لە ناوچەی ( زیارەتو بنەباویّو گردەچاڵ)، پێشمەرگەکانی بزووتنەوە بەرپەرچیان دانەوەو هێرشەکەیان تێکشکاند، لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر سەربازو جاش کوژرانو (٣) پێشمەرگەش بریندار بوون[1].

ڕۆژی (١٩٨٧/١١/١٠) حکومەتی بەعس هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر ناوچە ئازادکراوەکانی قەرەداغ، پێشمەرگەکانی هێزی کەرکووکی بزووتنەوە بە هاوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتییو سۆسیالیست، دوای (٩) کاتژمێر شەڕ هێرشەکەیان تێکشکاندو پاشەکشەیان بە هێزی حکومەت کرد، لەو شەڕەدا بەعس چەند کوژراوی لە گۆڕەپانی شەڕدا جێهێشت[2].

ڕۆژی (٢٦ مایس ١٩٨٨) حکومەت هێرشێکی گەورەی کردە سەر بارەگاکانی بزووتنەوە لە (قەڵاتووکان)، پێشمەرگەکانی بزووتنەوە بەرەنگاریان بوونەوەو سەرەنجام هێرشەکەی حکومەت شکاو زیانی مادیی و مرۆیی زۆریان لێکەوت، ئەوەی زانراوە لەو شەڕەدا ڕائیدێكو ئامر سریەیەکی جاشو (١٧) سەرباز کوژرانو چەندینی بریش بریندار بوون، دەستکەوتەکانی پێشمەرگە بریتی بوون لە: (١) هاوەن، (١) ئار بی جی، (١) بی کەی سی، چەند کلاشینکۆفو هەزاران فیشەك[3].

هەروەها لە (٢١ حوزەیرانی ١٩٨٨)، حکومەتی بەعس، دوای (٣) ڕۆژ بۆردومانی بەردەوام، هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر (قەڵاتووکان)، پێشمەرگەکانی بزووتنەوە بەرپەرچیان دانەوەو هێزەکەی حکومەت شکا، پێشمەرگەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی چوار شەهیدیان هەبوو کە بریتی بوون لە: عەبدوڕڕەحمان لۆتەری*،

---

[1] چالاکیەکانی پێشمەرگە، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل٥٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦ ـ ٥٧.

[3] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٢، ٣)، ل٣٧.

* عەبدوڕڕەحمان لۆتەری: عەبدوڕڕەحمان مەحمود، ساڵی (١٩٦٥) لە گوندی (لۆتەر)ی سەر بە شاری ڕانیە، لە دایك بووە، خانەی مامۆستایانی تەواو کردووە، لە (تەمموزی ١٩٨٧) بۆتە پێشمەرگەی

ئەحمەد سەكتانی*، عومەر بۆسكێنی**، تاهیر مەمەنداوایی***[2].

ڕۆژی (٢٠/٨/١٩٨٨) حكومەتی بەعس هێرشێكی بەرفراوانی كردە سەر ناوچەكانی ( سوورە دێ‌و كونە كۆترو قرناقەو پشت ئاشان) پێشمەرگەكانی هێزی (حەمزە، ئازادی، حەسەن بەننا، فاروق، خالید) بەرەنگاری هێرشەكە بوونەوەو شكاندیان[3].

مەفرەزەیەكی هێزی حەسەن بەننا بەرەو سلێمانی بەڕێكەوتن، لە (١٣/٦/١٩٩٠) لە ناوچەی (دۆڵەڕووت) لەگەڵ هێزێكی گەورەی حكومەت بەرنگار بوون، دوای (٣) كاتژمێر شەڕ كە بووە هۆی كوژرانی (١٦) سەربازو ئەفسەرێك‌و (٢) جاش هێزی حكومەت شكا، دواتر فڕۆكە پێشمەرگەكانی بۆردومان كردو تێزابی ڕشت بە سەریانداو (٥) پێشمەرگە شەهید بوون[4].

---

بزووتنەوەی ئیسلامیی، ڕۆژی (٢٢/٧/١٩٨٨) لە قەلاتووكان شەهید بوو. بڕوانە: لەگەڵ شەهیداندا، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٧)، كانونی دووەمی ١٩٨٩، ل٤٢.

* ئەحمەد سەكتانی: ئەحمەد حەمەئەمین عەبدوڵڵا، ساڵی (١٩٦٤) لە گوندی (سەكتان)ی سەر بە شەقڵاوە لە دایك بووە، پەیمانگای پزیشكی تەواوكردووە، لە (تەمموزی ١٩٨٧) بۆتە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامیی، ڕۆژی (٢٢/٧/١٩٨٨) لە گردی ڕەمكان لە قەلاتووكان شەهید بوو. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢ ـ ٤٣.

** عومەر بۆسكێنی: عومەر ئەحمەد خدر، ساڵی (١٩٦٦) لە گوندی (بۆسكێن)ی سەر بە ڕانیە لە دایك بووە، لە نیسانی (١٩٨٨) بۆتە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامیی، ڕۆژی (٢٢/٧/١٩٨٨) لە قەلاتووكان شەهید بوو. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

*** تاهیر مەمەنداوایی: تاهیر عەبدوڵڵا قادر، ساڵی (١٩٧٠) لە گوندی (مەمەنداوا)ی سەر بە ڕانیە لە دایك بووە، تا سێی ناوەندی خوێندووە، لە (مایسی ١٩٨٨) بۆتە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامیی، ڕۆژی (٢٢/٧/١٩٨٨) لە قەلاتووكان شەهید بوو. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣ ـ ٤٤.

[1] هەواڵ‌و چالاكی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٢، ٣)، ل٣٧.

[2] هەواڵ‌و چالاكی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٢، ٣)، ل٣٧.

[3] ئەرشیفی بیرەوەرییەكانی ڕۆژانی بەرگری، كۆمەڵ، ژمارە (٦).

[4] پێشمەرگەكان بریتی بوون لە: (هیدایەت كەریم سەعید، سەلمان مەحمود حسێن، باوەڕ عوسمان ساڵح، ئازاد حەمە تاهیر، نەسرەدین سەعید مەعروف). بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣٣، ٦٨).

دەبێت سەرنج لەوەش بدەین کە هەندێ جار مەفرەزەکانی بزووتنەوە چونەتە ناو شارو شارۆچکەکانو چالاکی جۆراو جۆریان ئەنجامداوە، لەوانە کوشتنی پیاوانی رژێم[1]، ئەمە سەرەڕای بڵاوکردنەوەی پۆستەرو بەیانو نامیلکە[2]. هەموو ئەوەش کە باسکرا نموونەیەك بوو لە چالاکی بزووتنەوە لەو قۆناغەدا.

## سێیەم: بواری ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن

هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، بە مەبەستی چالاکی نواندن لە بواری ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندندا، بیر لە دامەزراندنی چاپخانە کرایەوە، بەرهەمی ئەو هەوڵانە دامەزراندنی چاپخانەی (شەهیدان، بێتوشی، کۆچەران) بوو. لە (تشرینی دووەمی ١٩٨٧) چاپخانەی (شەهید حەسن بەننا) لە ( قەڵاتووکان)ی بناری قەندیل لە لایەن هێزی حەمزە دامەزرێنرا. چاپخانەکە زۆر سادەبوو، پێکهاتبوو لە ڕۆنیۆیەك، ئامێرێکی چاپی دەستی، لەلایەن (عومەری حەمە تاڵو عەبدوڵڵا عەبدولکەریم هەولێریو عەلی دێرەیی) کاری لەسەر دەکرا[3].

دوای داستانی قەڵاتووکان، چاپخانەکە ناوی گۆڕا بۆ چاپخانەی (شەهیدانی گردی ڕەمکان)، ئەمەش وەکو وەفایەك بۆ چوار شەهیدی داستانەکە. دواتریش ناوەکەی کورتکرایەوەو تەنها بە چاپخانەی (شەهیدان) ناوزەد کرا[4].

لە چاپخانەی ناوبراو تا ساڵی (١٩٩٠) گەلێك بەرهەمو نووسراوی جۆراو جۆر بە چاپ گەیەنرا لەوانە:

- ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ) کامەیە؟ نووسینی: عەلی باپیر
- سۆزی نەتەوایەتی نووسینی: عەلی باپیر

---

[1] بۆ نموونە کوشتنی (٣) ئەندامی حزبی بەعس لە هەولێر لە گەڕەکی (سێتاقان) لە بەردەم ئوتێل فەرید. بڕوانە: دەنگی باوەڕ، ژمارە (٩)، ل٣٤؛ أخبار التفير، النفير، العدد (٤)، ل٢١.

[2] لە (١٩٨٩/٥/١٩) مەفرەزەیەکی هێزی سەلاحەددین چوونە ناو شارۆچکەی (عەربەت)و چەند پۆستەرو وێنەو بڵاوکراوەی بزووتنەوەیان بڵاوکردەوە. بڕوانە: هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٩)، ل٣٦.

[3] هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٢٦ ـ ٢٨.

[4] سەرچاوەی پێشو، ل٢٦ ـ ٢٧.

- زنجیرەی (با چاکتر ئیسلام بناسین) نووسینی: عەلی باپیر
- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری تاغوت نووسینی: عەلی باپیر
- مەسەلەی کورد چیەو چۆن‌و بە چی چارەسەر دەکرێ؟و پێناسەی حزبی بەعس نووسینی: عەلی باپیر
- کوردستان بۆ وێران بوو، چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟ نووسینی: عەلی باپیر
- چەند شەڕێکی پارتیزانی نووسینی: موحەممەد زەرزی
- مەشخەڵی بەرەنگاری (شیعر) نووسینی: شەریف وەرزێر[1]
- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی نووسینی: عەلی باپیر
- پەیڕەوو پرۆگرامی ناوخۆی بزووتنەوەی ئیسلامیی
- چەند ژمارەیەکی گۆڤاری دەنگی باوەڕ
- چەند ژمارەیەکی بڵاوکراوەی لەگەڵ موجاهیداندا

هەروەها لەلایەن مەکتەبی ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، چاپخانەی (بێتوشی) لە گوندی (بێتوش) لە ناوچەی ئالانی سەردەشت دامەزرێنرا، چاپخانەکە پێکهاتبوو لە دوو تابیعەی میکانیکی، ڕۆنیۆیەك، فۆتۆ ستێنسڵێك‌و ئامێرێکی کۆپی[2].

بەو پێیەی چاپخانەی بێتوشی بەشێك بووە لە نووسینگەی ڕاگەیاندن، زۆربەی ئیش‌و کارەکانی بزووتنەوە بەو چاپخانەیە ئەنجام دەدران[3]. لەو گۆڤارو بڵاوکراوانەی لە چاپخانەی بێتوشی بە چاپ گەیەنران:

- زۆربەی ژمارەکانی گۆڤاری دەنگی باوەڕ
- زنجیرەی بەندەکانی خوا
- زۆربەی ژمارەکانی بڵاوکراوەی لەگەڵ موجاهیداندا

لە نێوان ساڵانی (١٩٨٧ ـ ١٩٩١) بزووتنەوەی ئیسلامیی ڕۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەی تایبەتی‌و گشتی دەرکرد، لەوانە ڕۆژنامەی (النفیر) بە زمانی عەرەبی کە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨ ـ ٢٩.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

دوای (٣) ژمارە گۆڕا بۆ گۆڤار[١]، گۆڤاری (ڕاپەڕین)[٢]، گۆڤاری (دەنگی باوەڕ)[٣]، گۆڤاری (بانگەوان)[٤]، گۆڤاری (الصف)[٥]، گۆڤاری (لواء صلاح الدین)[٦]، بڵاوکراوەکانی (شاعیرانی ناو سەنگەر، لەگەڵ موجاهیداندا، دەنگی شەهیدان، بەندەکانی خوا)[٧].

---

[١] یەکەم ژمارەی گۆڤاری (النفیر) لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٩) دەرچووە، شایانی باسە لەگەڵ ژمارە (٤)ی ئەم گۆڤارەدا پاشکۆی (فاجعە حلبجە) بڵاوکراوەتەوە کە پاشکۆیەکی بەڵگەنامەیی تایبەتە بە کیمیابارانی هەڵەبجە، ئەو پاشکۆیە لە ڕووی مێژووییەوە گرنگیەکی گەورەی هەیە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی گۆڤاری (النفیر) بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٦٧ ـ ٧٨.

[٢] ڕاپەڕین پاشکۆی گۆڤاری (النفیر) بووە بە زمانی کوردی، یەکەم ژمارەی لە (ئابی ١٩٩٠) دەرچووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٨٦ ـ ٩٦.

[٣] یەکەم ژمارەی گۆڤاری دەنگی باوەڕ لە (جەمادی یەکەمی ١٤٠٨ك/ کانونی دووەمی ١٩٨٨) دەرچووە. بەڵام هێدی گەیلانی دەڵێت: یەکەم ژمارە لە (٨ ئەیلولی ١٩٨٧) دەرچووە. ( هەژار حاتەم)یش لە توێژینەوەکەیدا هەمان زانیاری گواستۆتەوە. پێدەچێت ئەو دوو نووسەرە ژمارە (١)ی گۆڤارەکەیان نەبینیبێت. من ژمارە (١)ی گۆڤارەکەم دەستکەوتو ئەو مێژووەی لەسەرە کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدا. دەربارەی ئەو بۆچوونە بڕوانە: هێدی گەیلانی: لە یادی ١٠٥ ساڵەی دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) دا ئاوڕێك لەو گۆڤارانەی پێش ڕاپەڕین لە لایەن کاروانی جیهادی ئیسلامییەوە دەرچون، کۆمەڵ، ژمارە (٦٩)، ٢٠٠٣/٤/٢٦. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەڕۆك‌و گرنگی گۆڤاری دەنگی باوەڕ بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٥٩ ـ ٦٧.

[٤] یەکەم ژمارەی بەناوی (بانگەوازی ئیسلامی)یەوە دەرچووە، تا ژمارە (٧) لێی نووسراوە لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە دەردەچێت، بەڵام ژمارە (٨) لێی نووسراوە لەلایەن کۆمەڵەی ئیسلامیی کوردستانی عێراقەوە دەردەچێت. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوەڕۆکی گۆڤاری بانگەواز بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل٨٣ ـ ٨٦.

[٥] گۆڤاری (الصف) بە زمانی عەرەبی لەلایەن هێزی (حەسەن بەننا)ی سەر بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە بڵاوکراوەتەوە، یەکەم ژمارەی لە (مایسی ١٩٩٠) دەرچووە. بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١٠٤ ـ ١٠٧.

[٦] گۆڤارە (لواء صلاح الدین) بە زمانی عەرەبی‌و ئینگلیزی لەلایەن (مەکتەبی ئەمریکای باکوور)ی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە بڵاوکراوەتەوە. بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١٥٥ ـ ١٥٩.

[٧] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو بڵاوکراوانە بڕوانە: هەژار حاتەم: هەمان سەرچاوە، ل١٣٧ ـ ١٤٣.

به سەرنجدان لە ناوەڕۆکی ئەو گۆڤارو بڵاوکراوانە، بە تایبەتیش گۆڤارو بڵاوکراوە عەرەبییەکان، دەبینین بەشێکی گەورەی بۆ ناساندنی کێشەی کوردو مەرگەساتەکانی تەرخانکراوە، تێکڕای ئەوەش تێکۆشانو چالاکی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییە لەو قۆناغەدا، لە پێناو پەرەگرتنی بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستان.

بێگومان دەرکردنی گۆڤارو بڵاوکراوەکان تاکە چالاکی بواری ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنی ئەو قۆناغەی خەباتی بزووتنەوەی ئیسلامیی نییە، بەڵکو لە پاڵ ئەوەشدا چالاکی دیکەی نواندووە، زۆر جار ڕابەری گشتیو نووسینگەی ڕاگەیاندنی بزووتنەوە کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسیان سازداوە، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانیان لە کێشەو مەینەتییەکانی کورد بە ئاگا هێناوەتەوە، لەو چوارچێوەدا ڕۆژی (١٩٨٨/٣/٢٠) ڕابەری گشتیی بزووتنەوە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی دەربارەی کارەساتی هەڵەبجە سازدا، لەو کۆنگرەدا پەیامنێری زیاتر لە (١٢) دەزگای ڕاگەیاندن ئامادەبوون، لەوانە: تەلەفزیۆنی (هۆڵەندا، دانیمارك، فەڕەنسا)، پەیامنێری ڕۆژنامەی (سانداى تیلیگراف، گاردیان، تایمز لەندەن)[1].

هەر لەو قۆناغەدا بزووتنەوەی ئیسلامیی گرنگیدا بە بواری هونەری، ڕۆژی (١٩٨٨/١٢/٢٦) بەشی ڕاگەیاندنی هێزی شافعی، پێشانگایەکی وێنەو پۆستەری لە ژێر ناوی ( پێشانگای شەهیدان)دا لە شاری ( پیرانشەهر) کردەوە[2]. هەروەها بە بۆنەی یەکەمین ساڵڕۆژی کارەساتی هەڵەبجە، نووسینگەی ڕاگەیاندنی بزووتنەوە ڕۆژی (١٩٨٩/٣/١٦) لە شاری (سنە)، (پێشانگای هەڵەبجە)ی کردەوە. هەمان پێشانگا ڕۆژی (١٩٨٩/٤/١) گوازرایەوە بۆ شاری (مەریوان)، لەوێش ماوەی (٦) ڕۆژ بەردەوام

---

[1] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٢، ٣)، ل٣٤.

[2] پێشانگای شەهیدان پێکهاتبوو لە: (٦٢) تابلۆ، (٢٠) پۆستەرو وێنەی جۆراو جۆر کە بەشێك بوو لە تاوانەکانی حزبی بەعس بەرامبەر بە کورد، لە کیمیایی بارانو وێرانکردنو سووتانی گوندەکان. بڕوانە: هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٧)، ل٣٢ ـ ٣٣.

بوو، هەروەها پێشانگاکە ڕۆژی (٩/٤/١٩٨٩) گوازرایەوە بۆ شاری (پاوە)، لەوێش (٤) ڕۆژ بەردەوام بوو[١].

## چوارەم: بواری کۆمەڵایەتیو خزمەتگوزاری

بە درێژایی ئەو قۆناغەی خەباتی بزووتنەوەی ئیسلامیی هەوڵیدا لە بواری کۆمەڵایەتیو خزمەتگوزاریدا ڕۆڵی خۆی بگێڕێت، بۆئەو مەبەستە پەیوەندی کرد بە دەزگا بەرپرسەکانی ئێرانو ڕێکخراوە خێرخوازییەکانەوە تا هاوکاریو کۆمەکی ئاوارەو لێقەوماوانی کورد بکەن، هاوکات سندوقی تایبەتی بۆ کۆکردنەوەی کۆمەکی لە ئێرانو پاکستان دانا[٢]. بەمەش بزووتنەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگەی ڕێکخراوە خێرخوازیەکانەوە کۆمەکی ئاوارەکانی کرد[٣].

ڕۆژی (٢٢/١٠/١٩٨٨) ڕابەری گشتی بزووتنەوە سەردانی وەزیری تەندروستی ئێرانی کردو داوای لێکرد خزمەتگوزاری تەندروستی زیاتر پێشکەشی ئاوارەی کورد بکرێت لە ئۆردوگاکاندا[٤]. هەروەها لە سەردانێکی دیکەدا بۆ تاران لە ڕۆژانی (١٦ ـ ١٨/ ٨/١٩٩٠) ڕابەری گشتی بزووتنەوە بە مەبەستی بەدەستهێنانی کۆمەکیو باشترکردنی گوزەرانی ئاوارەکان چەند دیدارو کۆبوونەوەی لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان ئەنجامدا[٥].

---

[١] پێشانگاکە پێکهاتبوو لە: (٧١) وێنەی فۆتۆگرافی دەربارەی هەڵەبجەو وێرانکردنو ڕووخاندنو سووتاندنی گوندەکانی کوردستان، (٦) تابلۆی ڕۆنی، (٦) تابلۆ سەبارەت بە ستەمی بەعس، (٢٧) تابلۆی ئەرشیفی سەبارەت بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە کوردستانو هەواڵەکانی بەکارهێنانی ئەو چەکە لە ڕۆژنامە بێگانەکاندا، (٢) تابلۆ دەربارەی ژیانی ئاوارەکان لە ئۆردوگاکانی تورکیا، (٤) تابلۆ سەبارەت بە ئازاردانی زیندانییەکان لە زیندانەکانی بەعسدا، پێشکەش کردنی فیلمێکی ڤیدیۆیی دەربارەی کارەساتی هەڵەبجە. بڕوانە: لە یادی یەکەمین ساڵی کارەساتی هەڵەبجەدا، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٨)، ل ١٧ ـ ١٩.

[٢] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣٤).

[٣] محمد نوري بازياني: هەمان سەرچاوە، ل٧١.

[٤] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٥، ٦)، تشرینی دووەم ـ کانونی یەکەم ١٩٨٨، ل٤٣.

[٥] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٣)، ساڵی سێیەم، تشرینی یەکەم ١٩٩٠ز، ل٢٩.

هەر لە چوارچێوەی هاوکاری ئاوارەکاندا، لە مانگی (تشرینی یەکەمی ١٩٨٨) وەفدێکی بزووتنەوە سەردانی ئۆردوگای ئاوارەکانی کرد لە ناوچەی دیاربەکر لە کوردستانی تورکیا، دەربارەی باری گوزەرانی ئاوارەکان ڕاپۆرتێکیان ئامادە کرد[1]، دواتریش بڕێکی زۆر کۆمەکیان پێگەیاندن[2]. هەر لەو ماوەدا بڕی (٦٧٢٠٠٠٠) تمەن دابەش کرا بەسەر ئاوارەو لێقەوتاوانی کورد لە ئۆردوگاکانی ئێران[3].

---

[1] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٥، ٦)، تشرینی دووەم ـ کانونی یەکەم ١٩٨٨، ل٤٩.

[2] ئەو کۆمەکانە بریتی بوو لە: (٦٢٥٠) بەتانی، (٤٠٠٠) حەسیر، (٤٠٠٠) فەرش، (١٠٠٠٠) پارچە جلوبەرگ، (٥٠٠٠) مەتر قوماش، (٥) تەن برنج، (٦) تەن شەکر، (٦) تەن ڕۆن، (١) تەن چا، (٨) تەن شیری وشك بۆ منالان، (٦٨٥٠) جوت پێڵاو، (١٥) تەن میوە، (٧٠٠٠٠) دۆلار. بڕوانە: هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٧)، ل٣٢.

[3] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

## باسی سێیەم: پەیوەندییەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی

### یەکەم: لە ئاستی کوردستاندا

#### ١- ئیخوان موسلمین

لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامیدا، سەلاحەددین موحەممەد بەرپرسی ئیخوانەکانی کوردستان لە ئێران، چووە ئیماراتی عەرەبیو نامەیەکی دکتۆر نوعمان عەبدوڕڕەزاق سامەڕائی هێنا بۆ ڕابەری گشتی بزووتنەوە، ناوبراو لەو نامەدا داوای لە شێخ عوسمان عەبدولعەزیز کردبوو دەستبەرداری کاری چەکداری بێت[١]، ئەمە سەرەتای پەیوەندییەکی ئاڵۆزی لە نێوان بزووتنەوەو ئیخوان ڕەنگڕێژ کرد، بە درێژایی ساڵانی دواتر ئەو پەیوەندیانە ئاسایی نەبوونەوە.

ئیخوان بزووتنەوەیان بە ڕکابەری خۆیان دەزانیو بە بوونی دڕدۆنگ بوون، پێیان وابوو جموجۆڵی ئیسلامیی تەنها موڵکی خۆیانە، چونکە ئەوان پێشتر لە گۆڕەپانەکەدا بوون[٢]. ئیخوان لە ئۆردوگاکاندا خەڵکیان لە کاری چەکداریو سارد دەکردەوە[٣]، ئەمەش سەرکردەکانی بزووتنەوەی نیگەران کردبوو، لە بەرامبەردا سەرکردەکانی بزووتنەوە بە ئۆردوگاکاندا دەگەڕانو وتاری ئاگرینیان دەدا[*]، ئەمەش وەکو بەرپەرچدانەوەو بەرگرتن لە هەڵمەتی ئیخوان لە دژی بزووتنەوە[٤].

هادی عەلی یەکێکە لە سەرکردەکانی ئیخوان، دەربارەی بەشداری نەکردنیان لە بزووتنەوەدا دەڵێت: "ئێمە وەك زۆرینەی برایان لە کوردستان بەشداریمان نەکرد لەو بزووتنەوەیەدا لەبەر چەندین هۆکاری گرنگ کە پەیوەست بوو بە مەنهەجیەتی کاری

---

[١] لە بەشی (سێیەم) باسی (سێیەم) بە درێژی باس لە هۆکاری هێنانو دەرەنجامەکانی ئەو نامە کراوە.

[٢] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

[٣] سەرچاوەی پێشوو.

[*] مەلا عەلی عەبدولعەزیز یەکێك بوو لە وتاربێژەکانی بزووتنەوە، ڕۆژێك لە (سەریاس) وتاریداو وتی: " ئەوەی چەکمان لەگەڵ هەڵنەگرێت ڕەوانەی کێوی ئەبو قوبەیسی دەکەم!"، یەکێك لە ئامادەبووان پرسیبووی: مامۆستا کێوی ئەبو قوبەیس لە کوێیە؟، مامۆستا وتبووی: " ئەو شوێنەیە شەیتانی لێدەخەوێ". بڕوانە: هیوا: هەمان سەرچاوە، ل٣٣.

[٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

ئیسلامیو ستراتیژیەتی سیاسیی بزووتنەوەکە"[1]. بەڵام هادی عەلی هیچ دەربارەی ئەو هۆکارانە باس ناکات کە وای لە ئیخوان کرد بەشداری لە ڕاگەیاندنی بزووتنەوەدا نەکەن، بە بڕوای ئێمە هۆکاری ڕاستەقینە بریتی بوو لە:

١. سەلاحەددین موحەممەدو سەرکردەکانی ئیخوان پێشتر کۆمەڵی ئەنسارییان دامەزراند، ئێران هیچ هاوکاریو کۆمەکی نەکردن، هەر بۆیە گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کاری چەکداری لە سایەی ئێراندا ئاکامێکی ئەوتۆی نابێتو ناتوانێت ئامانجەکانی بێنێتەدی.

٢. ئیخوان لە دیدو تێڕوانینیاندا بڕوایان بە کاری چەکداریو جیهادی نییەو ئەو شێوازەی خەبات ڕەتدەکەنەوە.

٣. سەرانی ئیخوان پێیان وابوو شێخ عوسمان عەبدولعەزیزو سەرکردەکانی بزووتنەوە، شیاوی ئەوە نین ڕێبەرایەتی ئەو کارە بگرنە دەست.

٤. سەلاحەددین موحەممەد لە ساڵی (١٩٨٥) بە فەرمی مۆڵەتی کارکردنی لە سەرکردایەتی ئیخوان وەرگرتبوو، خۆیان بە شایستەی سەرکردایەتی کاری ئیسلامیی دەزانی، هەر بۆیە ئامادەنەبوون جارێکی تر بچنە ژێر سەرکردایەتی کەسێکی ترەوە.

٥. لەو کاتەدا ئیخوانی دەوڵی پەیوەندی لەگەڵ عێراق باش بوو، بەڵام لەگەڵ ئێران پەیوەندییان ئاڵۆز بوو، هەر بۆیە دژی هەر چالاکییەکی چەکداری بوون کە دژ بە حکومەتی عێراق بکرێت.

هەڵوێستی توندی ئیخوان بە تەواوی بزووتنەوەی ناڕەحەت کردبوو، شێخ عوسمان باس لەو دۆخە دەکات کە لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا دروست بوو، ژمارەیەکی زۆر لە کادیرانی ئیخوان دەستبەرداری بزووتنەوە بوون، ناوبراو لەو بارەوە دەڵێت:" لە سەر فەرمانی - وشاورهم في الأمر- ڕاوێژم کرد بە زۆربەی ئەو برایانەی کە هاوفیکرو هاوکارو هاوسەنگەر بووینو دوای نیشاندانی کۆمەڵە بەڵگەیەکی

[1] یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، ل٧.

شەرعیو واقیعی، بەڵام بە داخەوە ئەوانیش بە کۆمەڵە تەئویلاتێکی دەستکردو خۆدزینەوە لە حەق، دوای نەفسو داوی کۆمەڵە شتێکی داتاشراوی تر کەوتن"[1].

شێخ موحەممەد بەرزنجی یەکێ بوو لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەو کاتەدا، پێدەچێت ئازاری زۆری بەدەست ئیخوانەوە چەشتبێت، بۆیە لە باسی ئەو حاڵەتەدا دەڵێت: " لە هەمووی ناخۆشتر هەندێك تەیاری ئیسلامیش بە هەر هۆیەك بوو زۆر ئازاریان دەدایـن، تەنانـەت موجاهیدەکانیـان کە لوتکەی عیـزەتـی ئیـسلامـی پیرۆزە سارد دەکردەوە"[2]. لەو دوو دەقەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت هەڵوێستی ئیخوان، سەرکردەکانی بزووتنەوەی تەواو نیگەران کردووە.

**٢- پارتە کوردستانییەکان**

هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنییەوە، بزووتنەوەی ئیسلامیی، پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، حزبی سۆسیالیستی کوردستان توندو تۆڵو لە ئاستێکی باشدا بووە.

سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەو یەکێتیی، لە نێوان هەردوولادا ئەم ڕێکەوتننامە واژۆ کرا:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**لە ڕۆژانی ١١ ـ ١٢ی زی الحجەی ساڵی ١٤٠٧ک دا ڕێکەوتی ٦ ـ ٧ی ئابی ١٩٨٧ وەفدێکی بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا سەردانی بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کرد.**

**بە هاتنیان زنجیرە کۆبونەوەیەک ئەنجام درا باسی باری کوردستانو عێراقو ناوچەکەو جیهان کرا. بۆچونی هەردوولا سەبارەت بە زۆربەی مەسەلەکان لێک نزیک بوو. هەردوولا پێخۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بەرامبەر بە سیاسەتی ئاشت بوونەوەی گشتیو پێک هێنانی بەرەی کوردستانی کە سەرکردایەتی خەباتی گەلی کوردستان بکاتو ببێتە لایەنێکی گرنگ لە هاوپەیمانیەکی فراوانی عێراقیدا کە هێزە**

---

[1] لە: باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی یەکەم، جەماوەر، ژمارە (٣٦)، ٤ ئاب ١٩٩٥، ل١٣.

[2] لە: باوکی ئوسامە: هەمان سەرچاوە، بەشی سێیەم، ل١٦.

ئیسلامیەکان بەشێک بن تیایدا بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی عەفلەقی بەغداو هێنانەکایەی ڕژێمێکی دڵسۆز بۆ وڵاتو گونجاو لەگەڵ ویستو خواستی گەلی عێراقداو بتوانێت بە ئەرکەکانی هەستێت لە ڕاگرتنی جەنگی عێراقو ئێرانو صوڵحێکی عادلانە بەرقەرار بکاتو مافو یەکێتی خاکی هەردوولا بپارێزێ بناغەی دۆستایەتی گەلانی هەردوولا دابڕێژێو مافی چارەنوسی گەلی کوردی مسڵمان مسۆگەر بکاتو دژایەتی ڕاستەوخۆی ویستو دەسەڵاتی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپەرستی ناوچەکە بکات.

هەردوولا بەڕێزەوە تەماشای هاوکاریو یارمەتیو کۆمەکی جمهوری ئیسلامی ئێرانیان کرد بەرامبەر بە گەلی کوردو عێراق کە دەستێکی باڵای هەیە لە بەهێزکردنی زەمینەی خەباتو پەیوەندی دوارۆژی هەردوو وڵاتدا.

کۆبونەوەکە بێزاریو نارەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر دەست تێوەردانی ئیمپریالیزمو ڕژێمە کۆنەپەرستەکانی کەنداو لە پێشیانەوە ئیمپریالیزمی ئەمریکا لە کاروباری ناوچەکەو عێراقداو پشتگیری کردنیان لە ڕژێمی صەدامی خوێن ڕێژو کۆکردنەوەی هێزەکانیان لە کەنداودا، کە نەک هەڕەشەیە لە گەلی عێراقو سەربەخۆیی بەڵکو هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە لە گەلانی ناوچەکە. بۆیەش پێویستە هەموو هێزە شۆڕشگێڕەکانو گەلانی ناوچەکە یەکگرن بۆ بەرهەڵستی ئەو مەترسیە گەورەیە.

هەردوولا ڕێکەوتن لەسەر هاوکاری سیاسیو عسکریو اعلامی لە کوردستانی عێراقداو ڕێکەوتننامەیان مۆر کرد. ئەمەش هەنگاوێکە لە ڕێگای یەک خستنی دەزگاکانی شۆڕش لە کوردستاندا بە تایبەتی یەکخستنی هێزی پێشمەرگە.

هەردوولا داوا لە دۆستانی گەلی کوردو عێراق دەکەن کە بە پیر دەنگی شۆڕشگێڕانی خەڵکی مسڵمانی کوردو عێراقەوە بێنو هاوکاریو پشتگیریان لێ بکەن لە پێناوی ڕوخاندنی ڕژێمی عەفلەقیەکان دا. تا لەم ڕۆژە پڕ مەینەتیەی کوردستاندا کە وێران کردنو کوشتنی بە کۆمەڵ بە کیمیاویو ڕاگوێزانو تەعریبو تەبعیس سیمای وولاتەکەمانە بە دەست عەفلەقیەکانی بەغداوە کە دروشمی جەنگی لەناوبردنی ڕەگەزپەرستانەیان هەڵگرتووە بەرامبەرمان. بەم بۆنەیەوە یەکێتی

نیشتمانی کوردستان‌و بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا داوا لە چەکدارە هەڵخەڵەتاوەکانی سەر بە ڕژێم دەکەن چی تر نەبنە داردەستی دوژمنانی گەلەکەمان دەرگا ئاواڵەیەو بێنەوە باوەشی گەلەکەیانەوەو پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بکەن کە عەفوی کردوون.[1]

هەرچەندە هەندێ جار بارگرژی‌و ناکۆکی کەوتۆتە نێوان یەکێتیی‌و بزووتنەوە، بەتایبەتیش کە یەکێتیی هەستی بە چالاکی بزووتنەوە دەکرد نیگەران دەبوو، تەنانەت کار گەیشتە سەنگەر لەیەکتر گرتن*، بەڵام ئەو بارگرژیە نەگەیشتە تەقەکردن لە یەکترو

---

[1] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣٥).

* لە هاوینی (١٩٨٩) بارگرژی کەوتە نێوان هێزی حەمزەی بزووتنەوە بە لێپرسراوێتی (حەسەن بابەکر)و هێزێکی یەکێتیی بە لێپرسراوێتی (حەسەن کوێستانی)، ڕۆژی (١٩٨٩/٩/٤ن) حەسەن کوێستانی نامەیەك بۆ فەرماندەی هێزی حەمزە دەنێرێت‌و داوای لێدەکات لە ناوچەی (قووڵە هەرمێ) بنکە دروست نەکەن. لە وەڵامدا نووسینگەی سکرتاریەتی بزووتنەوە نووسراوی ژمارە (٥١)ی ڕۆژی (٦ سەفەر ١٤١٠ك – ١٩٨٩/٩/٧) ئاراستەی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی دەکات‌و لە کۆتاییدا ئایەتی (والسلام علی من اتبع الهدی) نووسراوە. ئەم ئایەتە جەلال تاڵەبانی توڕە دەکات‌و لەسەر هەمان نامەی سکرتاریەتی بزووتنەوە وەڵام دەداتەوەو دەنووسێت: "بێ ڕەزامەندی ئێمەش ناتوانن لە ناوچەی ئێمە بن". دواتریش ناوبراو لە ڕێگەی شێخ مستەفا نەقشبەندییەوە نامەیەك بۆ شێخ عوسمان دەنێرێت‌و وێڕای ئەوەی (عەلی باپیر) بە پیاوێکی داخ لە دڵ‌و قین لە دڵ ناودەبات، نیگەرانی خۆی لە ڕستەی (والسلام علی من اتبع الهدی) دەردەبڕێت، هەر لەو نامەدا ناوبراو پێشنیاز دەکات کە کەسێك بنێرێتە ناوچەکە تا چارەسەری ناکۆکی هەردوولا بکات. لە وەڵامی ئەم نامەدا، ڕۆژی (١٩٨٩/٩/١١) شێخ عوسمان نامەیەك دەنێرێت بۆ جەلال تاڵەبانی‌و بەڵێنی پێدەدات کە کارێك بکات مایەی ڕەزامەندی هەردوولا بێت. هەروەها ڕۆژی (١٠ سەفەر ١٤١٠ك – ١٩٨٩/٩/١١ن) عەلی باپیر نامەیەکی بۆ ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی ناردووەو چەند تێبینی‌و ڕونکردنەوەیەکی دەربارەی نووسراوەکەی نووسینگەی سکرتاریەت نووسیوە. دوو ڕۆژیش بەر لەو مێژووە لە نامەیەکیدا شێخ عوسمان لە بارگرژی‌و پێشهاتەکانی ناوچەکە ئاگادار دەکاتەوە. هەروەها عەلی باپیر لە نامەی دووەمیدا کە ڕۆژی (٩ سەفەر ١٤١٠ك – ١٩٨٩/٩/١٠ن) بۆ شێخ عوسمان عەبدولعەزیزی ناردووە، سەرنجی خۆی دەربارەی بۆچوونی شێخ عوسمان لەمەڕ چارەسەری ناکۆکییەکانی نێوان بزووتنەوەو یەکێتیی دەخاتەڕوو، کە بە بڕوای ئەو بەو شێوازانە چارەی گرفتەکە ناکرێت‌و ڕێگەچارەی تر دەخاتەڕوو.

بارگرژیەکانی قوڵەهەرمێ وردە وردە خاوبوویەوە، لە نامەیەکی عەلی باپیردا کە ڕۆژی (٢١ سەفەر ١٤١٠ك – ١٩٨٩/٩/٢٢ن) نووسیویەتی و پێدەچێت بۆ شوراو مەکتەبی سیاسیی ناردبێت، بە گوتەی ناوبراو بە

به هەوڵی ڕابەری گشتی بزووتنەوەو سکرتێری گشتی یەکێتیی بارودۆخەکە ئاسایی بوویەوە[1].

بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی نێوان یەکێتییو بزووتنەوە لە ئاستێکی باشدا بووە، وێڕای ڕێکەوتنی نێوانیان، گەلێك جار سەرکردەکانیان سەردانی یەکتریان کردووەو پەیوەندییەکانیان توندوتۆڵ کردۆتەوە، لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٧) جەلال تاڵەبانی سەردانی بارەگای بزووتنەوەی ئیسلامیی کردو چەند دانیشتنی لەگەڵ ئەندامانی شووراو مەکتەبی ئیرشادی بزووتنەوەدا ئەنجامدا[2]. هەروەها ڕۆژی (١٩٨٩/٣/٦) سکرتێری گشتی یەکێتیی سەردانی ڕابەری گشتی بزووتنەوەی کرد[3]، هەر سەبارەت بە پەیوەندییەکانی هەردوو پارتی ناوبراو، جەلال تاڵەبانی دەڵێت: بزووتنەوە هاوپەیمانی یەکێتیی نیشتمانییە،... ڕێکەوتنی توندوتۆڵ لە نێوانماندا هەیە[4].

بە هەمان شێوە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، پەیوەندییەکانیان توندوتۆڵ بووە، ساڵی (١٩٨٨) وەفدی بزووتنەوە چووە (ڕاژان) ڕێکەوتنیان لەگەڵ پارتی واژۆ کرد[5]. هەروەها مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی ڕۆژی (١٩٨٨/١١/٨) سەردانی شێخ عوسمان عەبدولعەزیزی کردوەو دیدارو گفتوگۆیان سازداوە[6].

---

مەبەستی پەندوەرگرتن لەو ڕووداوە سەرجەم بەڵگەنامەی پەیوەست بەو ڕووداوەی بۆ ناردوون، هەر لەوێدا ناوبراو نامەکەی شێخ عوسمان بۆ جەلال تاڵەبانی بە لاواز بەرانبەر هەڕەشەو گوڕەشەکانی جەلال تاڵەبانی ناوزەد دەکات. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو ڕوداوە بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (٤٤، ٤٥، ٤٦، ٤٧، ٤٨، ٤٩، ٥٠).

[1] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

[2] هەواڵەکان، دەنگی باوەڕ، ژمارە (١)، ل٥١.

[3] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٨)، ل٢٦.

[4] حوار مع الاستاذ جلال الطالباني السكرتير العام للإتحاد الوطني الكردستاني، القسم الثاني والأخير، النفير، العدد (٧)، شباط ١٩٩١، ل٢٢.

[5] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (ئەحمەد کاکە مەحمود)، هەڵەبجە، ٢٠٠٤/١٢/٨"

[6] هەواڵو چالاکی، دەنگی باوەڕ، ژمارە (٥، ٦)، تشرینی دووەم ـ کانونی یەکەم ١٩٨٨، ل٤٣.

هەروەها لەگەڵ حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لە ساڵی (١٩٨٧) لە (کاولان) ڕێکەوتننامە لە نێوان بزووتنەوەو سۆسیالیست واژۆ کراو پەیوەندییەکانیان لە ئاستێکی باشدا بووە [1].

ساڵی (١٩٨٨) لە چوارچێوەی ئاشتبوونەوەی گشتیدا لە نێوان پارتە کوردستانییەکاندا بەرەی کوردستانی پێکهێنرا، هەرچەند بزووتنەوە ڕێکەوتننامەی لەگەڵ (٣) پارتی ناو بەرەی کوردستانی هەبوو، بەڵام نەچووە ناو بەرەوە، عەلی باپیر هۆکاری بەشدارنەبوونی بزووتنەوە لە بەرەدا دەگێڕێتەوە بۆ بوونی کۆمەڵێك پرەنسیپی ناکۆك لەگەڵ دیدو تێڕوانینی بزووتنەوە، ئەگەر بزووتنەوە بچوایەتە بەرەوە دەبوو پابەند بێت بەو پرەنسیپانەوە، هەر بۆیە بەشدارینەکردنی لە بەرەدا بە گونجاوتر زانیوە [2]. لەو بڕوایەدام ئەوە هەڵەیەکی سیاسیی بزووتنەوەیە لەو قۆناغەدا، لە کاتێکدا بزووتنەوە لەگەڵ (٣) پارتی ناو بەرەی کوردستانی ڕێکەوتنی هەبوو، دەیتوانی لەسەر بنەمای ئەو ڕێکەوتنانەو بە دانانی چەند مەرجێك کە لەگەڵ دیدو تێڕوانینەکانی خۆیدا بگونجێت بەشداری ئەو بەرەیە بکات، ئەمەش دەبووە دەستکەوتێکی تری بزووتنەوە لەو قۆناغەدا.

## دووەم: لە ئاستی دەرەوەدا

### ١- ئێران

بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کاتێکدا ڕاگەیەنرا کە شەڕی عێراق - ئێران حەوت ساڵ بوو بەردەوام بوو، لێرەوە کارێکی سروشتی بوو کە هەر نەیارێکی حکومەتی عێراق لەسەر بنەمای دوژمنی هاوبەش ببێتە دۆستی ئێران، بە تایبەتیش پارتە ئیسلامییەکان، دەبێت ئەوەش لەبەر چاو بگرین کە بزووتنەوەی پەیوەندی ئەندامی (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی لە عێراق) بوو، لەگەڵ ڕاگەیاندنی بزووتنەوەش ئەو ئەندامانە نەکشانەوە، لە لایەکی ترەوە بزووتنەوە لەسەر خاکی ئێران ڕاگەیەنرا،

---

[1] حوسێن محەمەد عەزیز: هەمان سەرچاوە، ل٥٤؛ محمد حاجی محمود: ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەك، بەرگی سێیەم، چاپخانەی تیشك، سلێمانی ٢٠٠١، ل٥٣.

[2] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ ناوبراو، سلێمانی، ٢٠٠٥/٧/١٨

ئەمەش سەرەتای پەیوەندیەکی باشی نێوان هەردوولا بوو، ئێران هاوکاری‌و کۆمەکی مادی‌و مەعنەوی بزووتنەوەی ئیسلامیی کرد، ڕێگەی دا لەناو خاکەکەیدا بنکەو بارەگا دابنێ‌و مەشق بە پێشمەرگەکانی بکات‌و بە خاکی ئەودا بیانگوێزێتەوەو لەناو خاکی ئەوەوە چالاکی دژی ڕژێمی بەعس ئەنجام بدات[1].

دوای وەستانی جەنگی عێراق - ئێران، بۆ سەرجەم پارتە کوردستانیەکان ئێران بووە باشترین پەناگە تا چالاکی سیاسیی تیا ئەنجام بدەن، بە هەمان شێوەش بزووتنەوە لەویٚ کەوتە نواندنی چالاکی ڕێکخراوەیی‌و سیاسیی‌و ڕۆشنبیری‌و ڕاگەیاندن، وەفدی بزووتنەوە بەشداری کرد لە زۆربەی ئەو کۆڕو کۆنگرانەی لە تارانی پایتەختی ئێران دەبەستران‌و نوێنەری وڵات‌و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان‌و کەسایەتییە ناسراوەکان بەشداریان تێدا دەکرد. هەر لە خاکی ئێرانەوە بزووتنەوە توانیبووی پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە بکات‌و نووسینگەی پەیوەندییەکانی لە چەند وڵاتی ناوچەکەو ڕۆژئاوا کردەوە[2].

دەبێت ئەوەشمان لەبەر چاو بێت، ئێران هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو بزووتنەوە بەو ئاراستەدا بەرێت کە بەرژەوەنییەکانی ئێران دێنێتەدی، بۆ ئەو مەبەستە سوودی لە ناکۆکی‌و پێکهاتەی ناجۆری بزووتنەوە وەرگرتبوو، هەندێ جاریش دنەی ئەو ناکۆکیەی دەدا[3]. هەر چەند ئەم هەوڵەی ئێران کاریگەری ڕێژەیی هەبوو، بەڵام بە درێژایی ئەو قۆناغە بزووتنەوەی ئیسلامیی توانیی پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆی بکات[4].

**٢- جیهانی ئیسلامیی**

بزووتنەوەی ئیسلامیی هەر لە سەرەتای ڕاگەیاندنییەوە هەوڵیدا پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ پارتە ئیسلامییەکان‌و کەسایەتییە ناسراوەکان‌و ڕێکخراوە ناحکومییەکاندا دروست بکات، ئەمەش بە مەبەستی ناساندنی کێشەی کوردو

---

[1] محمد نوری بازیانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦ - ٦٧.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٦٧.

[3] چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (ئەحمەد کاکە مەحمود)، هەڵەبجە، ٢٠٠٤/١٢/٨.

[4] سەرچاوەی پێشوو؛ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (عەلی باپیر)، سلێمانی، ٢٠٠٥/٨/١٧.

بزووتنەوەی ئیسلامیی بە جیهانی ئیسلامیی‌و دەرەوە، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجەش بزووتنەوەی ئیسلامیی سوودی لەو کۆنگرانە دەبینی کە لە تاران سازدەدران، لە پەراوێزی کۆنگرەو کۆنفراسەکاندا نوێنەری بزووتنەوە کۆبوونەوەو دیداری لەگەڵ بەشداربووانی کۆنگرە سازدەدا[1].

بزووتنەوە توانیبووی پەیوەندی لەگەڵ زۆرێك پارت‌و کەسایەتیی ئیسلامیی دروست بکات، بە تایبەتیش سەرکردەکانی ئەفغانستان، کە پەیوەندی نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا هەبوو، لە بۆنەو ڕوداوەکاندا نامەیان بۆ یەکتر ناردووە[2].

بەڵام سەبارەت بە وڵاتە عەرەبییەکان ئەوە دوای داگیرکردنی کوەیت لە لایەن حکومەتی عێراقەوە، بزووتنەوە توانی پەیوەندییان لەگەڵ دروست بکات، وەفدی بزووتنەوە سەردانی وڵاتانی کەنداوی کردو بەشداری کۆڕو کۆبوونەوەکانی کردووە[3]، ئەمەش بۆتە سەرەتایەك بۆ دروستکردنی پەیوەندی نێوان هەردوولا.

---

[1] لە باسی دووەمی ئەم بەشەدا باس لە بەشداری بزووتنەوە لە هەندێ لەو کۆنگرەو کۆنفرانسانە کراوە.

[2] بڕوانە بەلگەنامەکانی ژمارە ( ٢٠، ٢١، ٣٦، ٣٧، ٣٨).

[3] وەفدی بزووتنەوە بەشداری کرد لە (کۆنگرەی خوێندکارانی ئیسلامیی جیهانی پشتگیری لە کوەیت) کە لە (٢٥ ـ ٢٨ تشرینی دووەمی ١٩٩٠) لە (شارقە) بەسترا. بڕوانە بەلگەنامەی ژمارە (٢٢).

# دەرەنجام

لەم توێژینەوەدا، کە تایبەتە بە مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان (١٩٤٦ ـ ١٩٩١) توێژەر بە چەند ئەنجامێك گەیشتووە، گرنگترینیان لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەخەینەڕوو:

١. ڕەوتی ئیسلامیی لە باشووری کوردستان ڕەگێکی مێژوویی قووڵتر لەو ماوەی هەیە کە لەم توێژینەوەدا خراوەتەڕوو، ئەمەش دەخوازێت توێژینەوە لە بارەی ئەو قۆناغەوە بکرێت.

٢. ڕەوتی ئیسلامیی درێژکراوەی هەوڵی چاکسازەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمی ناوخۆو دەرەوەی کوردستانە.

٣. ڕەوتی ئیسلامیی باشووری کوردستان لە بنەڕەتدا هەڵقوڵاوی واقیعی ئایینیو سیاسییو کۆمەڵایەتییو ئابووریی کوردستانە، هاوکات بە کارتێکراوە دەرەکییەکانیش کاریگەر بووە.

٤. ڕەوتی ئیخوان موسلمین لە نێوان ساڵانی (١٩٤٦ ـ ١٩٧١) بە شێوازی جۆراوجۆر لە باشووری کوردستان چالاکی نواندووە، بەڵام سەرکەوتنو دەستکەوتی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە.

٥. ڕەوتی ئیسلامیی لە نێوان ساڵانی (١٩٧٨ ـ ١٩٩١) دەرەنجامی هۆکارگەلێکی ناوخۆییو دەرەکی بە شێوەیەکی بەرفراوانترو چالاکتر لە چاو ساڵانی پێشتر دەرکەوتووە.

٦. ڕەوتی ئیسلامیی لە ناو خودی خۆیدا بەسەر چەند باڵو تەوژمو پارتێکدا دابەش دەبێت، هەریەك لەوانە خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی، هاوکات کۆمەڵێك خەسڵەتی هاوبەش لە نێوان هەموویاندا هەیە.

٧. دوای وەستانی کاری ئیخوان لە عێراق، ئەو ڕەوتە بە شێوەیەکی سەربەخۆو خۆجێی لە باشووری کوردستان کاری کردووەو تا ساڵی (١٩٨٥) تەنها بە فکر ئیخوان بووە، بەڵام لەو مێژووە بەدواوە بە شێوەیەکی ئۆرگانی بە ئیخوان موسلمینی عێراقەوە پەیوەست بووە.

**پەلگەنامەی ژمارە (٥٠)**

**دەقی نامەی عەلی باپیر بۆ ئەنجومەنی شورای بزووتنەوەی ئیسلامیی لە (٢١ سەفەر ١٤١٠ك).**

بسم الله الرحمن الرحيم

برایانی بەڕێزو خۆشەویستو بۆ ئیسلام بەپەرۆش

السلام عليكم ورحمة الله

دوای سڵاوو ڕێزی زۆرم بۆ هەموو لایەکتانو داوای سەرکەوتنو پشوودرێژیو خۆڕاگری زیاترتان لەخوای بەرزو مەزن.

بەڕێزان!

لەم بەینەی پێشوودا لەنێوان ئێمەو جلالیەکان دا ڕووداوێك ڕووی دا، حەزمان کرد لێی ئاگادار بن و زۆر چاك سەرنجی بدەنو پەندی لێ وەربگرن!!

جا ئەوە هەموو ئەو نامەو بەڵگەو (مستمسك)انەی کە پەیوەندیان بە ڕووداوی گۆڕینەوەیە، بۆمان ناردن هیوادارین سوودیان لێ وەربگرنو پیشانی دۆستو برایانی دڵسۆزیشتانیان بدەن.

نامەکانیش ریز (ترتیب)یان بەم شێوەیەیە:

یەکەم: نامەیەکی نووسینگەی سکرتاریەتی بزووتنەوەی ئیسلامی کە من نووسیومەو، وەڵامی نامەیەکی (حسن کوێستانی)یە وە لە پەراوێزی نامەکەی ئێمەدا (جلال طالبانی) سێ چوار ریزی بێ ئەدەبانەی لەوەلام دا نووسیونەوە.

دووەم: دووەمین نامەی ئێمە کە من نووسیومە لە وەڵامی قسەو هەڕەشەو گوڕەشەی جلال طالبانیداو چوار لاپەڕەیە، بەڵام مامۆستا ملا عثمان رازی نەبوو بۆی بنێرین و وتی پێویستە بە حیکمەتەوە قسەیان لەگەڵ بکەین!!!

سێیەم: نامەیەکی پڕ قسەی ناشیرینی جلال طالبانی لەبارەی منەوە بۆ مامۆستا ملا عثمان!!

چوارەم: نامەی ژمارە (١)ی من بۆ مامۆستا ملا عثمان دەربارەی ڕووداوی ناوبراو.

پێنجەم: نامەی ژمارە (٢)ی من بۆ مامۆستاو ئاگادارکردنەوەی لەفێڵو فەرەجی جلال تاکو فریو نەخوات بەڵام حەیفیّ..

شەشەم: نامەیەکی نەرمو نیانو لاوازی مامۆستا بۆ جلال طالبانی لەبەردەم ئەو هەموو هەڕەشەوگوڕەشەو قسە بیّ ئەدەبو ناشیرینانەیدا!!

ئەمانە نامەو بەڵگەکانی ئەو ڕووداوەن برایانیش دەتوانن زیاتر ڕووداوەکەو ئەنجامەکەشتان لیّ حاڵی بکەن، ئێوەش خۆتانو غیرەتو ویژدانی ئیسلامیيانەتان!!

والسلام عليكم

براتان

علی باپیر

٢١ صفر ١٤١٠

بەڵگەنامەی ژمارە (٥١)

دەقی پەیامێك کە بە ناوی (کۆمەڵە موسڵمانێکی خەمخۆرو دڵسۆزو پەرۆش بۆ ئیسلام) لە (١٩٨٨/٩/٢٧) بڵاوکراوەتەوە.

بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا                ١٥ صفر ١٤٠٩

٢٧ ١٩٨٨/٩

پەیامێکی دڵسۆزانە بۆ رابەرایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی

بسم الله الرحمن الرحيم

إنْ أُرِيدُ إلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ

بەڕێزان رابەرو مشورخۆرانی بزووتنەوەی ئیسلامی

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

پاش سەلام و ڕێزو هەواڵپرسین و داوای ڕێڕوونیو یارمەتی لە خوای بێ هاوتا

هیوادارین ئەم چەند دێرەی خوارێ بەوپەڕی سینگ فراوانی و نیازچاکی وەربگرن و بەگەش بینیەوە بیان خوێننەوە:

١) پێشەکی پێتان رادەگەیەنین کە ئێمە خۆمان بەبەشێك لە بزووتنەوە دەزانینو بەکەمو کوڕیو شکستی بزووتنەوە دڵتەنگ و بە گەشەکردنو بەرەوپێش چوونی سەربەرزو خۆشحاڵین.

٢) گومانی تێدانیە کە بەرەوپێش چوونی بزووتنەوەی ئیسلامیش پەیوەستە بە ئەندازەی پابەندیی ئەندامانی بەئیسلامەوەو تێشکانو بەرەو پاش چوونیش ئەنجامی حەتمی فەرامۆش کردنی یاسو دەستوورەکانی ئیسلامە.

٣) جائێمە پێمان وایە کە بزووتنەوەکەمان لە سۆنگەی گوێ پێ نەدانی ئەندامەکانیەوە بە تایبەتی سەرانیو براگەورانی بە زۆربەی یاساکانی ئیسلام، کەلێنو کونی زۆری تێدا پەیدابوون و پێمان وایە ئەگەر بێتو هەر لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بێ تەمەنی زۆر کورت دەبێ.

٤) جا وەك برايەكی دڵسۆزو بەپەرۆش داواكارین كە بە زووترین كات لە چارەسەركردنی گیروگرفتەكانی بزووتنەوە وەخۆ بكەون، دەنا هەموومان تاوانبار دەبین‌و پشكی گەورەش وەبەرئێوە دەكەوێ.

٥) چاكترین رێی چارەسەریش بەبۆچوونی ئێمە ئەوەیە كە ئەم خاڵانە رەچاو بكەن:

یەكەم: بەیەك چاو سەیری مسوڵمانان بكەن‌و تەقواو ئیخلاص‌و خزمەت كردن بكەنە تەرازووی هەڵسەنگاندن نەك خزمایەتی و بنەماڵەو سینگ هێنانە پێش و .. هتد.

دووەم: هەركەسێك لە مەیدانی ئیش كردن‌و واقیع دا بە پەرێز سەلماندی كە كارێكی پێ ناكرێ كارەكەی لێ وەربگرنەوەو بەیەكێكی شیاوی بسپێرن، چونكە (أمرنا ان ننزل الناس منازلهم).

سێیەم: گوێ بۆ رەخنەو تێبینی خەڵكی بگرن‌و نەچن هەركەسێك عەیب‌و ناتەواوی‌یەكانتانی خستنەوە بەرچاوتان لێی تووڕە بن‌و بە ناحەزی بزانن، چونكە دۆست ئەو كەسەیە كە یارمەتیت دەدات بۆ چاك كردنی عەیب‌و ناتەواوی‌یەكانت.

چوارەم: گۆڕانێكی ریشەیی بەسەر ئەم وەزعە ناهەموارەی ئێستادا بێنن‌و رێز بۆ راو بۆچوونی برایانی ئەندام‌و پێشمەرگە دابنێن، چونكە زۆربەی هەرە زۆری خەڵكی لەم وەزعە بێزارەو ئەگەر هەست نەكەن گۆڕانێكی (بنچینەیی) دروست دەبێ پتر بێزارو دڵسارد دەبن.

پێنجەم: هەڵبەتە لەكاتێك دا باوك خێزانەكەی پشت گوێ دەخات‌و ئەندامانی خێزانەكەی پرژو بڵاوی‌و بێ سەرەوبەرەیی‌یان دەكەوێتە نێوو هەریەكەیان بەناچاری خەمی خۆی دەخوات، باوك بۆی نیە جگە لە خۆی رووی گلەیی لەكەس بكات.

شەشەم: جا هیواداریین ئێوەی بەڕێز بەشێوەیەك سەرپەرشتی‌مان بكەن‌و خەممان بخۆن كە هەست بەبێ لێپرسراوی نەكەین‌و خۆمانمان بێ‌كەس نەیەتە بەرچاوو بەناچاری نەكەوینە خەمی خۆمان.

جا بەڕێزان!

ئەوە لەبەر خواو بۆ ( اتمام الحجة) ئەمجارەش وەك چەندان جاری دیكەی بێ بەرهەم كەم‌و كووڕی‌و ناتەواویەكانتانما خستە بەرچاوتان، جا هیواداریین ئامۆژگاری‌و

بێدارکردنەوەی ئەمجارەشمان وەك ئی جارەکانی پێشوو بێ بەرهەمو بێ وەڵام نەبێت، وە هیواداریین بەم عەیب خستەڕوو و هەڵە ڕاست کردنەوەیە قەڵسو تووڕە نەبن و دڵخۆش بن، چونکە ئەوانەی بەهەڵە بۆ ڕاست کردنەوەو ئامۆژگاری کردن توڕە دەبن خودا ئاوا پێناسەی کردوون (...وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ ..).

ئیدی هیواداریین ئەم قسانەمان جێ بگرنو گوێیان بۆ بگرن، بشزانن کە (جام پڕ بوو لەسەرییەوە دەڕژێ)و (بەڕە لای تەنکییەوە دەدڕێ)و (گوریسی زوڵمیش لە ئەستوورییەدا دەپچڕێ).

لە کۆتاییدا

لەخوا داواکاریین هەموولایەکمان وا لێ بکات کە گوێ بۆ ئەوانە بگرین کە لەبەر خوا ئامۆژگاریمان دەکەن و عەیبو هەڵەکانمان دەخەنە بەرچاوو پڕ بەدڵ سوپاسیان بکەین، چونکە خودا فەرموویەتی (الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ).

نووسەر: کۆمەڵە موسڵمانێکی خەمخۆرو دڵسۆزو پەرۆش بۆ ئیسلام.

تێبینی:

لەچەند سەرچاوەیەکەوە گوێ بیست بووین کە گوایە ڕۆژی ١٩٨٨/٩/٢٧ لە شاری سەقز کۆبوونەوەیەك هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەهیچ سەرچاوەیەکی باڵاوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئێمە ئاگادار نەکراینەوە، دڵنیا نەبووین کە ئەو هەواڵانە ڕاستن بۆیە بەپێویستمان نەزانی بچین بۆسەقز.

بەڵگەنامەی ژمارە (٥٣)

دەقی بەیاننامەی ژمارە (٨)ی کۆڕی ڕاوێژی یەککگرتوو لە (٣ ڕەجەب ١٤١٠ك).

بزوتنەوەی ئیسلامی بسم الله الرحمن الرحیم ژمارە/ ٨

لە کوردستانی عێراق دا بەروار/ ٣ رجب ١٤١٠

(وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ)

ب/ ئاگاداری

دوای ئەوەی مەفرەزەیەکی (١٠) کەسی لە هێزی (خالد) جیا کرانەوەو هەموو یارمەتی‌یەکی تایبەتی دران‌و هاوکاری یان کرا لەلایەن دروست کەری مەفرەزەی ناوبراوەوە، ماوەیەکی زۆری نەخایاند (٥) کەسیان بە چەکەکانیانەوە چوونەوە باوەشی ڕژێمی بەعس و لەوێش بوونە مەفرەزەی تایبەتی دوژمن. وە لە پێناو سود گەیاندن بە ڕژێمی کافر دەیانەوێ زیان بگەیەنن بە بزووتنەوەی ئیسلامی بە گشتی و ئەندامانی لێهاتوو بە تایبەتی.

بۆیە ئێمەی کۆڕی ڕاوێژی یەککگرتوو ڕایدەگەیەنین لە هەر شوێنێك ئەو ناپاکانە بەرچاو کەوتن بە سزای خۆیان بگەیەنرێن. ئەو ناپاکانەش ئەمانەن (١ـ احمد قادر کریم/ عبدالعزیز. ٢ـ هادی صالح محمد/ عبدالمجید. ٣ـ نامق محمد احمد/جلال. ٤ـ محمود صالح محمد/ عبدالوهاب. ٥ـ عثمان صالح محمد/ بخاری[1]. وە پەڕی دووەم بڕیاری دروست کرانی مەفرەزەی ناوبراوە.

تێبینی

(١) تاقە ئامانج و مەبەستی پێکهاتنی کۆڕی ڕاوێژی یەکگرتوو چاککردن‌و هێنانە سەرخەتی بزووتنەوەی ئیسلامی ولابردنی دەردو گیرو گرفتەکانی‌یەتی کەواتە با هیچ کەس تفەنگ بە تاریکی‌یەوە نەنێ و لەخۆیەوە ناوی جیا بوونەوەمان بەدوا نەخات.

[1] ناوی پێنجەم لە لیستی ئاگاداریەکەی کۆڕی ڕاوێژی یەککگرتوو (عثمان صالح محمد/بخاری) لەناوی لیستی مەفرەزەکەدا نیە پێدەچێت ئەوناوە بەهەڵە نوسرابێت یان (غفور صالح) بێت. سیوەیلی

(٢) بۆ هەر مەسەلەیەکی گرنگ یەکدەنگ هەڵوێستی خۆمان رادەگەیەنین.

(١) م علی باپیر

(٢) م محمد رازی

(٣) م عبدالله عبدالعزیز

(٤) عبدالقادر برایەتی

(٥) سلمان یاسین

(٦) شریف حسین

(٧) حسن بابکر

(٨) امین طه

(٩) عمر محمد هومر

(١٠) محمد عزیز

(١١) مسعود صدیق

(١٢) یاسین صادق

(١٣) حاجی سعید

(١٤) ابو هدی

(١٥) کمال محمد

(١٦) مجاهد اشرف

(١٧) عبدالحمید صالح

(١٨) عمر نصرالله حبیب

(١٩) عمر مصطفی

(٢٠) عبدالستار مجید

(٢١) جمال احمد

(٢٢) شريف سليم

(٢٣) فؤاد رضا

(٢٤) عثمان رسول

(٢٥) فاروق معروف ابراهيم

(٢٦) محمد ياسين

بسم الله الرحمن الرحيم

الله أكبر

نوسینگەی رابەری گشتی

بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی ژمارە/

عێراق رۆژ/

بۆ ئاگاداری

بە پێی بەرژەوەندی تایبەتی بزوتنەوەی ئیسلامی و بە مەبەستی ئەنجامی چالاکی تایبەتی ((نوسینگەی رابەری گشتی)) مەفرەزەیەکی دیکە پێك دێت لەم دە (١٠) برایەی خوارەوە بۆ هەمان مەبەستی سەرەوە لەبەر ئەوە داوام وایە لە هەموو برایان یارمەتی‌یان بدەن

والسلام عليكم ورحمة الله

رابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامی لە

کوردستانی عێراق

ناوەکان

١ـ احمد قادر كريم/ عبدالعزيز

٢ـ هادی صالح/ عبدالمجيد

٣ـ نامق محمد احمد/جلال

٤ـ محمود صالح/عبدالوهاب

٥ـ ابراهيم رشيد/

٦ـ غفور صالح/ مسلم

٧ـ احمد حمه كريم/ عبدالحكيم

٨ـ محمد صالح/ عبدالصمد

٩ـ صديق محمد على/ وريا

١٠ـ عبدالله صالح/ نجم الدين

**بەڵگەنامەی ژمارە (٥٤)**

**دەقی بەیاننامەی ژمارە (٩)ی کۆڕی راوێژی یەکگرتوو لە (٢١ رەجەب ١٤١٠ك).**

بسم الله الرحمن الرحيم

ربنا عليك توكلنا واليك انبنا واليك المصير

ژمارە/٩

بەروار/ ٢١ رجب ١٤١٠

ب/ ئاگاداری یەکی گرنگ

مسوڵمانانی دڵسۆزو بەپەرۆش بۆ ئیسلام!

ئێمە - کۆڕی راوێژی یەککگرتوو - دوای ئەوەی پاش هەوڵدان و خۆماندووکرنێکی زۆر بۆ راست کردنەوەی هەڵەو ناتەواوی یە زلەکانی کەسانێك کە خۆیان بە چاوساغ و مشوورخۆری یەکەمی بزووتنەوەی ئیسلامی دەزانن، بیّ هیوا بووین و گەیشتینە (بن بەست). بیروباوەڕی ئیسلامی و بەتەنگەوەبوونی ئابڕووی ئیسلامو ترسانمان لە رۆژی سزاو پاداشت پاڵیان پێوەناین، کە بۆ هێنانەدی و دابین کردنی ئامانجی ناوبراو - واتە راست کردنەوەو هێنانە سەرخەتی بزووتنەوەی ئیسلامی - (کۆڕی راوێژی یەککگرتو) پێك بێنین و دڵ و بیرو بۆچوونو دەنگو هەڵوێستمان بکەینە یەكو لەسەر چەند یاساو بنچینەیەکی شەرعی رێك بکەوین کە کاتی خۆی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلمو خەلیفە راشیدەکان رضى الله عنهم لەسەریان بەرێوە چوون، جا داواتان لیّ دەکەین کە ئێوەش بەپێی فەرمانی خوا (وتعاونوا على البر والتقوى..) رەفتار بکەن و، با هەموومان یەك دڵو یەك زمان دەست لەنێو دەستی یەك بنێین و بۆ چەسپاندنی هەق و دادگەری ولابردنی (ناشەرعی) گەرمترو زیاتر دەست بەکار بین.

ئنجا شایانی باسە کە لەم ماوەیەدا مەسەلەیەکی گرنگ لە ئارادایە. بە پێویستمان زانی ئێوەی بەرێزی لیّ ئاگار بکەینەوەو هەڵوێستی ئێمەش بە روونی بزانن. ئیدی خۆتان و ویژدانی ئیسلامیتان:

یەکەم:

هەموو لایەك ئاگادارن کە ماوەی (٧ — ٨) مانگە پێشمەرگە رەش و رووتو نەدارەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی یارمەتی‌یان وەرنەگرتووەو، مەگەر بە دەگمەن دەنا تێیان دا نیە کە قەرزدار نەبێت، جا لەم ماوەیەدا یارمەتی درا بە هەموو هێزەکانی بزووتنەوە، بەلاّم هێزی (حمزة) "رضی الله عنه" و هێزی (شافیعی)"رحمە الله" لە یاسای یارمەتی وەرگرتن لەلایەن (رابەری گشتی)یەوە ریزپەڕ کران! بۆخۆشتان دەزانن کە پێشمەرگە فیداکارو بە هەڵمەتەکانی ئەو دوو هێزە هیچیان لە پێشمەرگەی هێزەکانی دیکە کەمتر نیە!!!

دووەم:

جا بێگومان بە دەردی پێشینان دەڵێن ( ئەم ماستە بێ موو نیە) و ئەم هەڵوێستەش ئاڵقەیەکی دیکەیە لەو زنجیرە هەڵوێستەی کە لە مێژە لە بەرانبەری ئێمەدا پێشان دەدرێن بە مەبەستی ناچارکردنمان بۆ پێشاندانی هەڵوێستێك کە ئاوات و ئامانجی لەمێژینەی دوژمن و ناحەزانی ئیسلام و بزووتنەوەیە کە بریتیە لە جیابوونەوەو (تفرقة).

بەڵێ ئەم هەڵوێستەش هەر دووبارەکردنەوەیەکی کردەیی (فعلی) ئەو هەڵوێستانەیە کە بەرەو روو و پاش ملە چەند جارێك لە بەرانبەرمان دا خراونەڕوو و بێ پێچوپەنا پێمان گوتراوە: (ئەگەر بەم وەزعە رازین چاکە، دەنا خوا حافیزتان بێت، بۆکوێ دەچن بچن)!

سێیەم:

بەڵێ بەڕێزان! ئێمە ئەگەر لەبەر خاتری خواو بەرژەوەندی و عیزەتو ئابڕووی ئیسلامو موسڵمانانو پێ خۆش نەبوونی ناحەزانی ئیسلام دانمان بەجەرگی خۆمان دا نەگرتباو خۆمان مەرزەم نەکردبا، دەبوو لەمێژبا - بە قسەی رابەرو دەوورویەرەکەی - بزووتنەوەی ئیسلامی مان لەتوپەت کردباو دڵی ناحەزانمان خۆش کردبا، بەلاّم ئاگادارتان دەکەینەوەو دڵنیاتان دەکەین کە خوا پشتیوان بێ هیچ هێزێك و هیچ وەسیلەیەکی ناشەرعی ناتوانێ ناچارمان بکات هەڵوێستێك بنوێنین کە بە زیانی ئیسلامو قازانجی ناحەزان تەواو بێت.

چوارەم:

بەڵام دڵنیاشتان دەکەین کە ئێمە هەروەك چۆن هەڵوێستی چەوتو ناشەرعی‌یانەی (دەنگ دان) و (برسیی کردن - تجویع) ناتوانێ ناچاری جیابوونەوەو پەرتەوازەیی‌مان بکات، ناشتوانێ یەك (بست)یش پاشەکشەمان پێ بکات لە بەئەنجام گەیاندنی ئەرکی مسوڵمانانەی سەرشانمان و راست کردنەوەو لە بێژنگ دانی (رابەرایەتی) و هێنانە سەر خەتی بزووتنەوەی ئیسلامی، بەڵکو خوا یار بێ هەتا زیاتر تەنگمان پێ هەڵچنرێ و پتر برسی بکرێین، لەسەر هەڵوێستی ئیصلاحی‌یانەی خۆمان سوورترو لەبڕشت تر دەبین، چونکە دیتنی ئەو هەڵوێستو رەفتارە ناشەرعی یانە زیاتر قەناعەتمان پێ پەیدا دەکات کە دەردی بزووتنەوەکەمان چەندە گرانو بێڕەزایەو، چەندە حەوجێی بە چارەسەرو خەم لێ خواردن دەکات!!

لەکۆتایی دا دەڵێین:

پێشمەرگەی ئیسلام (شێری نێچیرگر)ە نەك (گاجووتی جووتکەر)، هەڵبەتە گاجووت کە برسی بوو جووتی پێ ناکرێ، بەڵام شێر هەتا برسی تر بێت چاکتر بەدوای نێچیر دەگەڕێو زووتریش تێکی دەشکێنێ، ئەوانەش کە پێیان وایە جیهاد بە زگی برسی و گیرفانی خاڵی ناکرێ، دیارە بە ژیانی پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم هاوەڵە رووتو نەدارەکانی ئاشنا نین.

کەواتە:

با هەموو کەس بزانێ کە ترسانو برسیەتی ناتوانن ڕێگەی جیهادو خەبات لە پێشمەرگە رەسەنەکانی ئیسلام بگرن، بەڵام هیچ مسوڵمانێکیش رازی نابێ بە سیاسەتی چەوتی: (برسی کردن و زار چەور کردن) (سیاسة التجویع والتطمیع) رەفتاری لەگەڵ بکرێ.

تێبینی:

شایانی باسە کە جگە لەو ئەندامانەی کە هەتا ئێستا لە کۆڕی راوێژی یەککرتوودا کۆبوونەوە، کەسانێکی دیکەی دڵسۆزو مسوڵمان هەن کە هاوبیرو هاوهەڵوێستن لەگەڵ کۆڕی ناوبراودا، بەڵام جارێ بەپێویست نەزانراوە بەئاشکرا هەڵوێستی خۆیان بخەنەڕوو.

والسلام علینا وعلی عبادالله الصالحین

کۆڕی راوێژی یەککرتوو

بەڵگەنامەی ژمارە (٥٥)

دەقی سەروتاری ژمارە (١)ی گۆڤاری ئاڵای ئیسلام لە (تەمموزی ١٩٨٦).

بسم الله الرحمن الرحيم

المحررون: ئازاد كرميانى

كولالة ئاسنكر

## لماذا ئالاى ئيسلام

ان كل حركة سياسية او طلابية تحتاج الى جريدة او مذياع او مجلة تعبر عنها فان (ئالاى ئيسلام) هي الناطق رسمي لرابطتنا ان هناك ثلاثة اهداف اساسية تسعى دوريتنا الى تحقيقها:

١- ستسعى نشرتنا الى الاهتمام بالفكر الاسلامي الاصيل وبث التوعية الاسلامية بين الشباب الكردى ليكونوا قادرين على حل المشكلات السياسية والاقتصادية والاجتماعية التى تواجه شعبنا في كردستان حلا اسلاميا.

٢- ان معظم الدوريات التى تصدرها الحركات الاسلامية في اوربا وامريكا الشمالية تتجاهل الدور الذى لعبه شعبنا في خدمة الاسلام وان هذه الدوريات لا تعطى الالمام الكافي لقضية (٢٠) عشرين مليون مسلم كردي لذا تنوى نشرتنا جلب اهتمام الحركات واالشخصيات الاسلامية الى مظلومية شعبنا ضمن اطار الاسلامي.

٣- رغم تقديرينا للدور الذي تلعبه النشريات الكردية الاخرى في تعريف راى العام العالمي بالقضية الكردية الا اننا نشعر بان معظم النشريات باستثناء "الزيملة جودى" تحاول اما اغفال التراث والوجه الاسلامي للتاريخ الكردي او تقديمه بطريقة غير موضوعية وذلك لاستعمالهم نظريات (دنيوية) علمانية كالقومية الليبرالية او الماركسية — اللينينية التي هي نظريات ظهرت في الغرب الاوروبي ونتيجة ظروف حضارية وتاريخية خاصة بواقعها. نحن نشعر بان هذه النظريات غير ملائمة ولاهي قابلة لتحليل واقع شعبنا المسلم في كردستان. فنامل بأن ئالاى ئيسلام سيصحح هذا المسار.

نحب ان يعرف الاخوة جيمعا، خاصة قرائنا من الكرد، باننا نطمح ان نجعل من نشرتنا منبرا حرا لتبادل الاراء بين اصحاب الاتجاهات المختلفة ضمن باب الحوار التي ستشغل قسما من دوريتنا في المستقبل ولكننا نرجوا من الاخوة ان يضعوا في الاعتبار بان الحوار العلمي الهادف لا يتحقق الا بالموضوعية في الطرح والبعد عن التشنج والانفعال، كما نود ان نبين للجميع باننا اذ لا نلزم احدا بقبول حركتنا كبديل لجميع الحركات الطلابية الكردية الا اننا نقول باننا ستسعى الى تقديم الوجه الاسلامي الصحيح لنضال شعبنا الكردي. ونود ان نؤكد ايضا باننا نقدر نضال كل الاطراف الكردية ونرفض ان تكون نشرتنا منبرا للتهجم على اى طرف. اضافة الى ذلك حين نكتب عن الاسلام فكرا وتاريخا وعقيدة فاننا ننطلق من القران والسنة النبوية الشريفة وناخذ من تاريخ الرسول الاعظم (ص) وال بيته الطاهرين ودور خلفاء الراشدين نماذج عملية لدعم فكرنا ولا نعتبر انفسنا ملزمين للدفاع عن تصرفات ومواقف دول وحركات اسلامية قامت في الماضي او القائمة حاليا على الساحة الاسلامية.

ولا يعني بذلك باننا ننكر اسلامية اي طرف ولكن لتاكيد استقلاليتنا كحركة اسلامية طلابية كردية.

كان بودنا، ولا نزال نطمح، بان يكون قسم الاعظم من نشرتنا بلغتنا الكردية الغنية ولكن لقلة الكفاءات وصعوبة الحصول على الة طابعة الكردية اضطررنا ان نخرج هذا العدد وربما الاعداد القادمة ايضا باللغة العربية والانكليزية ونرجو من الاخوة عدم التردد في الكتابة الينا عن تراث وتاريخ المسيرة الكردية باللغة الكردية حيث نظمن الترجمة الامينة لهم او ننشرها مع النشرة كما هي.

(( وقل اعملوا فسيرا الله عملكم ورسوله والمؤمنون)).

بەڵگەنامەی ژمارە (٥٦)

دەقی بەیاننامەی مەکتەبی ئیرشادی بزووتنەوەی ئیسلامیی سەبارەت بە پتەوکردنی ریزەکانی ناوخۆی بزووتنەوە لە (٨ جەمادی یەکەمی ١٤٠٨ك).

بسم الله الرحمن الرحيم

(( الا ان حزب الله هم المفلحون))

بەیاننامەی بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق

بە هەوڵ و کۆششی دڵسۆزانی ئیسلام لە کوردستانی عێراق داو پاش چەند ساڵ جیهادو کۆچ کردن رووبەرووبوونەوەی تەنگ و چەڵەمەی جۆربەجۆر کە هاتە رێگەی بزوتنەوە موجاهیدیەکەی کوردستانی عێراق ((بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق)) ئەندامانی ئەم بزوتنەوەیە بەسەبرو ئارامو خۆڕاگری توانیان کە ئاستی جووڵانەوەی ئیسلامی بگەیننە مەڵبەندو ئاسۆی فراوان کردن و گەورەبوون بە شێوەیەك چەتری بزوتنەوەکە توانی ژمارەیەکی زۆر لە گەورەپیاوانی کوردستان تێکڕا لە مامۆستایانی پایە بڵندو موجاهید و خاوەن مێژووی جیهادی لەژێر سایەی دا جێی بکاتەوە، بە کورتی جوغزی بزوتنەوەی پەیوەندی گەیشتە ئەو رادە جەماوەریە بە جورئەتە کە ئەتوانرێ پێی بوترێ قۆناغی پەیوەندیکردنی بە خەڵکی موسڵمانەوە کۆتایی پێ هاتو بە هاتنە دەرەوەی مامۆستای پایە بەرز مامۆستا ((مەلا عوسمان عبدالعزیز)) وە وەرگرتنی ئەرك و بەرپرسیاری جڵەوداری و رابەری بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی قۆناغی جیهادی لە پەیوەندیکردنەوە چووە قۆناغێکی زۆر بەرفراوان و گەورەترەوە، بۆیە بە پێویست زانرا کەلەگەڵ ئەم ئاڵو گۆڕە گەورەیەی کە کوردستانی عێراق لە مێژووی ئەمڕۆی دا بەخۆیەوە بینی ناوی بزوتنەوەکەش لەگەڵ ئەو جۆش خواردنە جەماوەریەی ئەمڕۆی سەرجەمی جوڵانەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق بگۆڕدرێ بۆ بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، بۆیە رابەرایەتی پەیوەندی ئیسلامی کوردستانی عێراق و ئەندامانی

مەکتەبی سیاسی و سەربازی بە نوێنەرایەتی جەماوەری پەیوەندی ئیسلام لە (دار الهجره) تێکڕا بڕیاری جۆش خواردنێکی نوێ بزوتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی یان دا بە بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق و سەرجەم بەیعەت درا بە مامۆستای رابەر مامۆستا ((مەلا عوسمان عبدالعزیز)). لەم رووەوە ئاگاداری هەموو ئەندامان و دڵسۆزانی موسڵمان دەکەین بە تایبەت ئەندامانی پەیوەندی ئیسلامی کوردستانی عێراق کە دەبێت لەمەولا بەردەوام بن لە ئەنجام دانی چالاکیەکانیاندا وەریزەکانیان پتەوترو ووزەیان بەتین تر بکەن لەژێر ناونیشانی ((بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق)) وە بە پێویست دەزانرێ ئەوە دەست نیشان بکرێ کە بزوتنەوەی ئیسلامی دەستکەوت و ئامانجی جەماوەری موسڵمانە بە هەموو توێژو چینەکانیەوە بێ جیاوازی لەوشتانەی کە لە ئایینی ئیسلام دا نابنە هۆی دووبەرەکی و جیاوازی وە تیرەو رەگەزو میللەت و نەژاد وەرێبازی مەزهەبی ئیسلامی.

بە کورتی بزوتنەوەی ئیسلامی لانەی چالاکی جیهادی هەر موسڵمانێکی خاوەن باوەڕە بە جیهاد و رووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی ئیسلام و رزگارکردنی گەلە موسڵمانەکەمان لە عێراق دا لە دەست رژێمی بەعسی خوێن ڕێژ بە تایبەت گەلی کوردی موسڵمان حوکمی خودایە لە وولاتدا بۆیە لێرەوە بە هەموو جەماوەری موسڵمانی عێراقی رادەگەیەنین کە دروستکردنی زومرەی بچکۆلە بچکۆلە و بۆیەکردنی بە رەنگ و شیعاری ئیسلامی لەلایەن ئێمەوە رەت دەکرێتەوە چونکە یەکێتی و هاوکاری لە بۆتەی جیهادێکی یەك رەنگ دا خەڵکی موسڵمانی وولاتمان دەگەیەنێتە ئاوات وە بە پێچەوانەشەوە دوبەرەکی نەگونجاو زیاتر خەڵکی لە هەڵوەشان و نابودی نزیك دەکاتەوە بۆیە جەماوەری موسڵمانیش لەم گۆشەیەوە دەبێت بۆ پاراستن و پتەوی موسڵمانان هەموو ئەو جۆرە بۆچوونانەی کە بە رەنگ و بەرگی خودپەسەندی و خودویستی و خەڵك کۆکردنەوە لە دەوری تاکەکەس دەپۆشن هەمووی رەت دەکاتەوە چونکە کۆبوونەوەی یەك دڵ و یەك رەنگ لە دەوری بەرنامە پیرۆزەکەی خودا یەکێکە لە خواستە گرنگەکانی پەروەردگار کە بە دەق لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ ((وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُوا)) و هەروەك دەفەرموێ ((وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ

وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ)) ئيتر به هيواى سەركەوتن لە ژێر ئاڵاى قورئان دا.

((وَقُلِ اعْمَلُواْ فَسَيَرَى اللّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ))

**مەكتەبى ئيرشادى**

**بزوتنەوەى ئيسلامى لە كوردستانى عێراق**

**٦/جمادى اول/١٤٠٨**

وێنەيەك بۆ :ـ

١ـ دەفتەرى بەرێز رابەرى گشتى.

٢ـ بەشى راگەياندن.

٣ـ ادارە و توجە.

بەڵگەنامەی ژمارە (٥٧)

دەقی نامەی شێخ عوسمان عەبدولعەزیز بۆ مەلا عەلی عەبدولعەزیز سەبارەت بە بەشداری نەکردن لە هێرشی سەر هەڵەبجە لە (١٩٨٨/٣/١٢).

بسم الله الرحمن الرحیم

٢٤ /رجب/

١٩٨٨/٣/١٢

برای خۆشەویست مەلا علی .. سەلام و دوعام هەیە بۆ هەموو برایانی موجاهید بە تایبەتی کاك مەلا احمد .. سەبارەت بە بەشداری ئێمە لە هجوم بۆ سەر هەڵەبجە دوێنێ بۆتانم نووسیبوو لەم بارەیەوە جارێکی تر دەینووسمەوەو ئەڵێم: ئەم کارە مەکەن و بەشداری تیا مەکەن من مەسئوولیەتی بەشداری نەکردنەکە ئەگرمە ئەستۆ لای ئێرانی‌یەکان و ئەوانی تر. بە هەموو برایان بڵێ بەشداری کردنەکە ئاساری خراپو ئەنجامی نا بەدڵی تیایە. راستە سەیتەرە کردن لەسەر هەڵەبجە زۆر ئاسانە بەڵام ئێوە ئەزانن کە حیزبی بەعسی کافر چۆنەو چەند رقیشی لە هەڵەبجەیەو شكو گومانی تیا نی‌یە کە بە هەموو چەکێك لێی ئەداو وێرانی ئەکا. ئێمە بەردەوام هەوڵمان داوە لەگەڵ ئێران کە هەڵەبجە لە تۆپباران بپارێزن. هەڵەبجەو دەروبەری مەرکەزی هێزی ئێمەن .. ئەگەر وێران کرا دەورمان چی ئەبێت؟

لەگەڵ ئەم نامەیەم دا شێخ عبداللطیف قسەت بۆئەکا و پێت رائەگەیەنێ کە ئێمە لەم هجومەدا بە هیچ شێوەیەك بەشداری ناکەین جارێکی تر ئەڵێمەوە ئەبێ بەشداری تیا نەکەینو من ئەم مەسئوولیەتە هەڵ ئەگرم.

بە خواتان ئەسپێرم والسلام علیکم

براتان

عثمان عبدالعزیز

بەڵگەنامەی ژمارە (٥٨)

دەقی بەیاننامەی بزووتنەوەی ئیسلامیی سەبارەت بە کیمیابیبارانی هەڵەبجە لە (٤ شەعبان ١٤٠٨ ك).

(بەیاننامە)

بە بۆنەی رووداوە دڵ تەزینەکانی ئەم دواییەی هەڵەبجەو شارەزوور

بسم الله الرحمن الرحيم

(( ان فرعون علا في الارض وجعل اهلها شيعا يستضعف طائفة منهم يذبح ابناءهم ويستحي نساءهم انه كان من المفسدين. ونريد ان نمن على الذين استضعفوا في الارض ونجعلهم ائمة ونجعلهم الوارثين))

(من لم يهتم بامر المسلمين فليس منهم) (پێغەمبەری مەزن)

ئەی گەلی کوردی موسڵمان، ئەی گەلی عێراقی موسڵمان:

ئەمڕۆ لەسەر رووی زەمینا وە لە هەموو کۆمەڵگەکانی جیهانا هیچ گەلێك نییە وەکو ئێوە رۆڵەکانی چەوسێنراوەو ستەم لێکراوو قوربەسەر بن، وە هیچ وڵاتێك نییە لە جیهانا رژێمێك فەرمانڕەوایەتی بکا پیس ترو دڕندانەتر و گاورتر بێ لە رژێمی بەعسی غەفلەقی، ئەو رژێمەی بە بێ هیچ هۆیەك‌و بە ناڕەوایی سەرتاسەری وڵاتی کردوە بە قەساب خانە بۆ رۆڵەکانی عێراق بە گشتی و گەلی کوردی موسڵمانی بێ تاوان بە تایبەتی، بەڵێ رژێمی بەعسی خوێن ڕێژی رەگەزپەرست هەموو هێزو تواناو بەروبوومی عێراقی خستۆتە کایەوە بۆ قەلاچۆکردنی ئەم گەلە هەژارە، وە بەوپەڕی بێ شەرمی و بێ حەیاییەوە وە بە نیازی کاری نامرۆڤایەتییەوە خەریکە ناوەکەشی لە لاپەڕەکانی مێژوودا بسڕێتەوە. ئەوەتا بۆ چەندەمین جار شارو دێهاتەکانی کوردستان لە لایەن ئەم رژێمە رەگەز پەرستەوە بۆمبارانی کیمیایی دەکرێ بە جۆرەها گازی ژەهراوی و خەردەل و —اعصاب — و —خانق — هتد، ئەمە سەرەڕای بەکارهێنانی تازەترین‌و کوشندەترین فڕۆکەی جەنگی‌و موشەکی زەمین بە زەمین‌و جۆرەها تانك‌و تۆپی قورس کەوا شەوو رۆژ ناوچەرگەی ناوچە جێ نشینەکانی کوردستان تیر باران‌و ئاگر باران دەکەن‌و هەزارەها ئافرەت‌و پیرو منالی بێ تاوان دەکوژرێن و دەربەدەر دەکرێن.

ئەی گەلی کوردی موسڵمان ئەی گەلی عێراقی موسڵمان:

لە خەوی غەفلەت و ترسنۆکی راپەڕەو چاوی عیبرەت بکەوەو ببینە خوشك و براکانی ئاین و نەتەوەکەت بەدەس سەددامی حەرام زادەوە چ رۆژە رەشێکیان بەسەردا هاتووە. لە (٢٨/ رەجەب) واتە چەند رۆژێك لەمەوبەر رژێمی دڕندانەی بەعس دەیان فڕۆکەی جەنگی ناردە سەر شارە شیرینەکەی هەڵەبجەو دێهاتەکانی شارەزوورو بە توندی ئەم شارو دێهاتانەیان بۆردوومان کرد، بەڵام چ جۆرە بۆردومانێك؟ بێ گومان ئەم بۆردومانە تەنها لە ڕێگەی موشەکی ئاگرین و زەمین بە زەمین نەبوو، بەڵکو لە ناکاو بە سەدان بۆمبای کیمیایی یان بەسەر ئەم شوێنە کوردنشینەدا باراند کە بریتی بوو لە: گازی خەردەل و — اعصاب — و — خانق — و ژەهراوی، وە هەر دەس بە جێ جادە و کووچەکان پڕبوون لە لاشەی بێ گیان و سووتاوی پیرو منداڵ و ئافرەت، وە بە هەزارەهای تریش کەڕو کوێرو زامدارو شەلەل بوون، دوای ئەم ڕووداوە سامناکە دانیشتووانی ئەم شارو دێهاتانە ماڵ و ئاوایی خۆیان بە جێ هێشت و بەم شێوەی خوارەوە دەربەدەرو ئاوارەبوون:

١- بەسەدان دایکی جگەرگوشیوو ئافرەتی بێهێز و دڵناسك بە دەست و پێی سوتاوەوە ئێستاکە لەناو کەژو کێوە ساردەکانی کوردستان لەژێر بەردێکا دەس لە ئەژنۆ کەوتوون دوای ئەوەی مێردو چوار یا شەش منداڵی گۆشەی جگەریان کوژراون و بە بۆمبا کیمیایی یەکانی سەددام و بونەتە خەڵووز و لەسەر شەقامەکانی هەڵەبجە وا بێ خاوەن کەوتوون.

٢- بە سەدان ئافرەت و پیاوی پیری زامدار بە تەنیا لەناو دۆڵ و کەژو کێوەکاندا بێکەس و بێ داوو دەرمان ماونەتەوە دوای کوژراتی هەموو کەس و کاریان.

٣- بە سەدان عائلە بە شێوەیەکی وا پەرت و بڵاو بونەتەوە کەوا بوونەتە چوار یا پێنج بەش دایك لە ژێر بەردێك و باوك لە شارێك و منداڵێك لە شوێنێك و کچێك لە شوێنێکی تر.

٤- بە سەدان لە زامدارو کوێر و لەش سوتاوە ئاوارەکان ناتوانن خۆیان بگەیەننە هیچ ئاوەدانی یەك ، وە بێگومان هیچ جۆرە دەواو دەرمانێك بۆ زامدارە کیمیایی یەکانی

کوردستان نی‌یه تاوەکو بەچەند رۆژێك خۆیان ئەگەیەننە ئێران بە پیادەیی یا بە سواری ولاخ ئەویش ئەگەر لە هەزاری یەك كەس دەس كەوێ. بەڵێ ئەی گەلی كوردستان‌و عێراق ئاوارەكان نەك هەر دەوایان دەس ناكەوێ بۆ زامدارە كیمیاییەكان بەڵكو تەنانەت نانی وشكیان دەس ناكەوێ بۆ سكی برسی پیرو منداڵەكانیان، جا لەبەر ئەوە ئەبینی تەرمە جێماوە بێ گیانەكانی كورد كەن‌و كێوەكانی پڕ كردووە.

٥- لەم ئافرەتە ئاوارانەدا هەن كەوا لەسەر كێوێكی بەرزو بەبێ مامان و داو دەرمان منداڵیان بووە.

ئیتر هەتا كەی ئەی میللەتی عێراق، هەتاكەی ئەی میللەتی كورد؟ ئەمە هەمووی نرخ‌و باجی سەرشۆڕی و بێ غیرەتی‌یە، ئەگەر موسڵمان موسڵمانی هەرگیز سەرشۆڕی قبووڵ ناكاو لە مردن ناترسێ، ئەگەر كوردی ئازایەتی‌و مەردایەتی گەلی كورد لە جیهانا ناوی داوەتەوە.

هەڵسە ئازاو مەردانە بێرە مەیدانی خەبات‌و ئازادی، وە دڵ نیا بە لەوەی نرخی ئازادی لە نرخی سەرشۆڕی و ژێردەستی زۆرترو گران تر نیە، سەرەڕای ئەو جیاوازی‌یەی لە نێوان ژیانی ئازادی‌و سەرشۆڕی دا هەیە كەوا ئەویان بەهەشت‌و ئەویان دۆزەخە.

ئەی جەماوەری موسڵمانی كوردستان و عێراق: میللەتانی دنیا سەریان سوڕماوە لە بێ دەنگی ئێوە بەرامبەر ئەو هەموو تاوان‌و دڕندایەتی‌یەی رژێمی بەعس بەرپای ئەكا. وە بێ گومان بزانن كەوا ئەگەر بەدەستی خۆتان ئەم رژێمە لەناو نەبەن رۆژ لە دوای رۆژ بارو دۆختان ناخۆش ئەبێ هەروەكو پەروەردگار هەوڵ‌و خەبات‌و تێكۆشانی كردووە بە یاسای بەردەوام بوونی ژیان‌و فەرموویەتی ((وان لیس للانسان الا ما سعى وان سعيه سوف يرى)) وە (( ان الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بانفسهم)).

ئەی جەماوەری كوردستان ئەوەی شایانی باسە لە رووداوەكانی هەڵەبجەو شارەزوور بزووتنەوەی ئیسلامی كوردستانی عێراق بە هەموو هەوڵ‌و توانایەوە بەرەو هاواری لێقەوماوە ئاوارەكان رۆیشت و ئەركی سەرشانی خۆی بەجێ گەیاند و جۆرەها یارمەتی پێش كەش كردن كە بریتی یە لە:

١- ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگە موجاهیدەکانی بزوتنەوە بە سەرکردایەتی فەرماندەی گشتی سەربازی بەڕێز مامۆستا مەلا عەلی چوونە ناو شاری هەڵەبجە و دڵی جەماوەریان دایەوە و دڵنیایان کردن لە سەرکەوتن‌و پشتیوانی خوا.

٢- موجاهیدانی بزوتنەوە گەلێ لە بێ هێز و بێ دەسەڵات و زامدارەکانی رزگار کرد و گەیانیانە نەخۆشخانەکانی جمهوری ئیسلامی. وە لەگەڵ برایانی تەنزیمی داخیلی لاشەی پاکی شەهیدەکانیان ناشت.

٣- ئێستاکەش بەردەوام مەفرەزەکانی (پ . م) موجاهیدەکان بەرەو شارەزوور و هەڵەبجە بەڕێ دەکەون و یارمەتی زامدارو ئاوارەکان ئەدەن.

٤- بەڕێز رابەری گشتی‌و مامۆستایان نەخۆشخانەی تایبەتی‌یان بۆ زامدارەکان دابین کردووە ومالّو پێ خەف‌و خواردەمەنی و پێویستی یەکانی ژیانیان بۆ ئاوارەکان ئامادە کردووە بەردەوامن لە پێش وازی کردن‌و خزمەت گوزاری زیاتر بە پشتیوانی خوا.

بەڵی بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق پەیمانی داوەتە خوا کەوا هەمیشە خەم خۆرو دڵسۆزی گەلی کوردی موسڵمان بێ‌و لە پێناوی مافە رەواکانی دا بجەنگێ، چونکە بزوتنەوەی ئیسلامی بەرووبومی بیروباوەڕو ئامانجەکانی ئەم گەلەیە و بێ گومان هەر بۆ ئەم گەلەشە.

ئیتر بۆ پێشەوە لەژێر ئالاّی ئیسلام تا سەرکەوتن یا شەهید بوون.

(( وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله))

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق

نوسینگەی رۆشنبیری و راگەیاندن

(٤/ شعبان/ ١٤٠٨ هیجری)

بەڵگەنامەی ژمارە (٥٩)

دەقــی بەیانامــەی بزووتنــەوەی ئیســلامیی دەربــارەی بڕیــاری (٥٩٨)ی نەتــەوە یەككگرتووەكان لە(٢٤ تەمموز ١٩٨٨).

بڕیارنامەی (٥٩٨)و هەڵوێستی بزوتنەوەی ئیسلامی لە كوردستانی عێراق

جەماوەری ستەم لێكراوی عێراق

گەلی كوردی موسڵمانو ماف خوراوی كورد

ئێمە وەكوو بزوتنەوەی ئیسلامی لە كوردستانی عێراق و بەڵكوو زۆربەی گەلانی جیهان لەگەڵ ئەوەی دڵنیایی تەواومان هەیە كە بڕیارەكانی ڕێكخراوی نەتەوە یەككگرتووەكان هەر لە یەكەمین بڕیاریانەوە تا ئەم بڕیارەو لەمەولاش هیچیان سوودی گەلانی چەوساوەی جیهان نین‌و تا ئێستاش كێشەیەكی ناوچەیی‌و جیهانی یان چارەسەر نەكردووەوو ناشی كەن چونكە لە بنەڕەتا ئەم ڕێكخراوو سازمانانە بۆ ئامانجی یارمەتی دانی گەلان دروست نەكراوەو بە دەست هێزە جیهان خۆرەكانەوە هەڵدەسوڕێن و تەنیا لە تەك سەرانی دەوڵەتان دا مامەڵەیان هەیەو ئاشكراشە سەرانی دەوڵەتانیش زۆربەی زۆریان نوێنەری گەلەكانیان نین ئەگەر بكوژو بڕیان نەبن.

بزوتنەوەی ئیسلامی لە كوردستانی عێراق دا بە پێویستی زانی لەم قۆناغەداو پاش ئەوەی كۆمای ئیسلامی ئێران بڕیاری دا بڕیارنامەی (٥٩٨) ی ئەنجوومەنی ئاسایشی جیهانی قبوڵ بكات و كۆتایی بهێنرێت بە جەنگی (٨) ساڵەی كاول كەر كە هەزاران پیرو جوان‌و ژن و منداڵ و چەندین شارو گوندو ئاوەدانی و دارایی هەردوو وولات بۆتە سووتەمەنی و خۆراكی ئەم جەنگە بە پێویستی زانی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئاراستەی ئەندامان‌و لایەنگران و دۆستانی بزوتنەوەو جەماوەر بكات.

١ـ هۆی دەست پیێ كردنی جیهادی چەكداری و تێكۆشانمان و شەرعیەت‌و رەوایی بۆ بەرەنگاری زوڵم‌و زۆری ڕژێمی بەعس بوو كەواتە تا ئەوان هەبن‌و زوڵم‌و زۆر هەبێ و مافی گەلی موسڵمانی كورد پیێ شێل بكرێت جیهادو تێكۆشان هەر بەردەوامە.

٢- لەم قۆناغەدا هەر ڕێکەوتنێك لە نێوان کۆماری ئیسلامی ئێرانو عێراق دا مۆر بکرێت پێویستە چارەنووسی جەماوەری عێراق و گەلی موسڵمانی کورد لەبەرچاو بگیرێت.

٣- ڕژێمی داگیرکەری بەعس دەست پێ کەری ئەم جەنگەو هەموو ئاڵۆزیو ئاشووبێکەو پێویستە بە هەموو لایەکەوە دیاری بکرێتو بناسێنرێت بە جیهانو سزای جەنگ نانەوەو دەست درێژی خۆی وەربگرێت و ئاشتی و ئاسایش ناوچەکە بگرێتەوە دیارە ئەمەش بە لابردنی صدامو ڕژێمە دڕندەکەیەتی.

٤- بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق وێڕای ڕێز بۆ ئەو ڕێکەوتننامانەی کۆماری ئیسلامی ئێران لەم ڕووەوە دەیبەستێ هاوسەنگەر لە تەك هەموو پارتو ڕێکخراوە نەیارەکانی عێراق دا درێژە دەدات بە جیهادو خەباتی ڕەوای خۆی بە شێوازو ستراتیژی یەکی نوێ کە لە تەك بارودۆخی ئەمڕۆی تێکۆشانمان دا بگونجێ.

وما النصر الا من عند الله العزيز الحكيم

بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی

عێراق

(٩) ی ذی الحجة ١٤٠٨

(٢٤) ی تەموز ١٩٨٨

بەڵگەنامەی ژمارە (٦١)

دەقی بانگەوازێکی ئەحمەد بن بلە سەرۆکی پێشووتری جەزائیر سەبارەت بە کێشەی کورد (٢ ئەیلول ١٩٨٨).

بسم الله الرحمن الرحيم

نداء

اصبحت الحرب العراقية – الايرانية على مشارف النهاية، والامة العربية والشعوب الاسلامية رحبت ببارقة الامل في سلام دائم بين الشعبين العراقي والايراني، فالحرب استنزفت على مدى ثمان سنوات طاقات وامكانيات البلدين وكلفت حوالي مليون ضحية، كما كانت عاملا في اضعاف الاوبك، واضعاف كفاح ووحدة الشعوب الاسلامية، وفي تكريس عوامل التبعية بل والحضور الاجنبي المباشر في المنطقة، وفي ظل العرب، تسنى للعدو الصهيوني شن الحرب العدوانية علي لبنان وضرب معاقل الثورة الفلسطينية والحركة الوطنية اللبنانية، فأشغال دول المنطقة بالحرب العراقية الايرانية والاستقطاب الحاد الناجم عنها اطلق يد الكيان الصهيوني، كما مكن القوى الاستعمارية من اعادة تثبيت مواقعها في بلادنا.

ولكن الاخبار الاخيرة تأييد بأن الحرب داخل العراق مازال مستمرة، فهناك هجوم عسكري في كردستان العراق، تعرض فيه المدنيون، مرة اخرى بعد مأساة حلبجة، لدمار الاسلحة الكيمياوية، وهناك عشرات الالوف من المواطنين الاكراد وقعوا بين فكي كماشة، يجبرون ترك قراهم واراضيهم وابواب النجاة مسدودة امامهم، مما يذكر بظروف ما بعد اتفاقية الجزائر السيئة عام ١٩٧٥.

ان السلام المنشود،هو سلام تنعم في ظله الشعوب بالامن والحرية، وليس مصالحة الانظمة وعقد صفقات على حساب الشعوب، يمكن الحكومات من تثبيت سلطتها وتسفية خصومها والقوى الوطنية المعارضة في بلدها، ولا يمكن للاستقرار ان يترسخ في المنطقة دون ان يرتبط باحلال السلام على جبهة الحرب ضد حركة التحررية الكردية، ودون ان يشعر المواطن في العراق وايران بالامان وبأبسط حقوق الانسان والمواطنة.

اذا كانت حكومتا العراق وايران تريدان حقا الاستفادة من الدرس المرير لحرب الثماني اعوام فالنبدء بارساء اسس سلام الداخلي، وتحقيق وحدة وطنية صلدة، واحترام حقوق الانسان، وحق الشعوب من تقرير المصير، وتوفير الحريات الديمقراطية التي وحدها كفيلة باطلاق طاقات الشعب في مرحلة اعادة البناء الصعبة، وتجميع كل القوى لدعم انتفاضة الشعب الفلسطيني وتوفير ظروف افضل للكفاح المشترك لشعوب المنطقة ضد الاستعمار والصهيونية.

انني ادعو حكومة الجمهورية العراقية للكف عن حرب الابادة ضد الشعب الكردي، وادعو الحكومات والقوى السياسية في الوطن العربي والعالم الاسلامي لخروج من صمتها وممارسة الضغط من اجل اقاف المجازر.

ان ابناء الشعب الكردي، احفاد نورالدين وصلاح الدين الايوبي، وقفوا منذ مئات السنين، ومنذ ان جمعتهم راية الاسلام بجانب العرب، وقد نظم الشعب الكردي المظاهرات الضخمة احتجاجا على العدوان الثلاثي ضد مصر عام ١٩٥٦، ونظم شعرائه وادباءه بعض اجمل نتاجاتهم حول ثورة الجزائر، وقاتل مئات منهم في صفوف الثورة الفلسطينية، ان هذا الشعب وهو في محنته اليوم، يستحق من اخوانه العرب والمسلمين ان يرفعوا اصواتهم لحمايته من الابادة، وهو اضعف الايمان، لكي لا يسجل التاريخ بأننا علمنا وشهدنا وسكتنا.

أحمد بن بله

٢ سبتمبر ١٩٨٨

بەڵگەنامەی ژمارە (٦٣)

دەقی بەیاننامەی بزووتنەوەی ئیسلامیی دەربارەی داگیرکردنی کوەیت لە (١٢ موحەڕڕەم ١٤١١ك).

بسم الله الرحمن الرحيم

الحركة الاسلامية
في
كردستان العراق

العدد/١١/٢
التاريخ/١٢/محرم/١٤١١ ه

– بيان –

(وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ) صدق الله العظيم

بمناسبة الغزو البعثي لدولة الكويت واحتلال اراضيها وقتل ابنائها ونهب اموالها وثرواتها وتشريد اهلها وهتك حرماتها من قبل شراذمة البعث العفلقي الصليبى العميل نود ان نوضح موقف حركتنا من تلك الاحداث المؤسفة وما قد ينجم عنها وتعريض المنطقة للخطر رغم ان الاخوة المسلمين والعرب بوجه خاص قد ساندوا البعث او سكتوا حينما قامت القوات البعثية بتدمير كردستان وقتل وتشريد الشعب الكردي المسلم احفاد صلاح الدين الايوبي انتقاما منهم على قيام جدهم (صلاح الدين) بتحرير القدس من رجس الصليبية الحاقدة على الاسلام والاسف الشديد فان البعث الصليبى بدعم حكام العرب ولاموالهم تمكن من مقاومة الثورة الداخلية في العراق وتمكن من ادامة حربه الظالمة على ايران الاسلامية وتدمير كردستان المسلمة وحرقها، فبالرغم من ذلك فاننا نحدد موقفنا تجاه الاحداث فيما يلي:

١- نستنكر قيام صدام الدكتاتور المجرم بتلك الاعمال الاجرامية وتعريض العراق والمنطقة كلها الى الخطر والتدخل الاجنبي، وتعتبر جميع اعمال البعث وصدام ووجود حكمهم خدمة لصهيونية والاستعمار ووسيلتها لتدمير الامة العربية وتخريب البلاد، فلذلك يجب على الامة العربية وشعوبها وحكومتها ان تتخذ موقفا موحدا وصارما لازالة هذا المجرم الطاغية عن الحكم ومكافحة حزبه العميل بجميع الوسائل وبكل شدة وقسوة لانه

اخطر من السرطان في جسم الامة العربية والاسلامية وهو السبب في دخول الاجنبى في الخليج، ونعلن بأن قواتنا في حالة الانذار القصوى وعلى اهبة الاستعداد للقيام بالواجب حسب متطلبات الظروف.

٢- نطالب بسحب الاعتراف والسفارات واعتبار حكومة صدام عصابات لاشرعية لها وطرد ممثليه من جميع الدول والعواصم وغلق سفاراته الى ان يتم تشكيل حكومة شرعية تقيم العدل وتتعامل بالقوانين والانظمة بعيدة عن الحزبية الهدامة.

٣- دعم واسناد الثوار المعارضة العراقية ماديا ومعنويا وخاصة الحركة الاسلامية في الداخل والخارج لكي تتمكن بمساعدة الجيش العراقي من ازالة ذلك الحكم الجائر المستبد الذي تسبب دخول الاجنبية في المنطقة، علما بان كل مسلم غيور لايرضى ولايقبل بتدخل الاجنبى في شؤن الاقطار الاسلامية.

٥- استمرار الحصار الاقتصادي والعسكري بحرا وبرا وجوا ومقاطعة الحكومة البعثية اللاشرعية واستعمال وسائل النشر والاذاعة لبيان قبائح صدام وحزبه العميل وتوجيه النداء من جميع العواصم العربية والاسلامية بمختلف اللغات الى الشعب والجيش العراقي للتحرك والثورة على صدام وحزبه الكافر وحشد القوات العربية والاسلامية حول العراق لمساندة الثوار اذا دعت الحاجة للتدخل المباشر السريع ضد حكم البعث.

٥- المسارعة لطرد حكومة البعث من الجامعة العربية ومن المؤتمر الاسلامي ومن جميع المنظمات الدولية.

٦- بذل الاموال والمواد التي اعطيت لصدام او صرفت في امور لاتنفع ولاتفيد، تعطى وتصرف في ترفيه الشعوب الاسلامية والمشاريع الخيرية ولابناء الشعب العراقي المسلم المشرد المنكوب الذي يعيش في الغربة والهجرة ولم يجدوا حاميا يحميهم ولا ملجأ يلجؤن اليه ولا مأوى يأوون اليه سوى الجمهورية الاسلامية القريبة المجاورة والمحاربة مع البعث في العراق وهي السبب اثار الحرب والزلزال لاتتمكن من القيام بما هو مطلوب وان كانت احسن بكثير من غيرها وتخدم بما تجود به يدها قدر المستطاع، ولكن حال المهاجرين في تركيا اسوأ بكثير وهم في ضيق أشد واقسى.

٧- واخيرا نناشد المسلمين في العالم والغرب بوجه خاص بأنه آن الاوان لكي يلتفتوا الى مظلومية الشعب الكردي المسلم في العراق الذي شرده الحكم العفلقي وصادر وطنه واراضيه وضربه بشتى الانواع من الاسلحة الفتاكة والمحرمة دوليا وخاصة الغازات السامة وجعلوا اراضي كردستان محرمة على شعبه، وأي شعب، شعب انجب الكثير من العلماء والفقهاء والقادة الذين قدموا اوفر الخدمات الى الامة الاسلامية وساندوا اخوانهم العرب في السراء والضراء، وقد حان الوقت للاعتراف بحقهم في العيش بحرية في ديارهم واعتبارهم جزءا من الامة الاسلامية واخواننا يستحقون الدعم والمساندة ويجب كسبهم ليكونوا اعمدة في بناء الاسلام الشامخ وعضوا في الاسرة الاسلامية الموحدة القوية لا طردهم لكي يركضوا وراء السراب والاوهام لان الغريق يتشبث بكل حشيش، هذا ما عرضناه وقدمناه الى الذين لهم آذان صاغية وقلوب واعية وابصار شاهدة ونقول لهم:

(إِلاَّ تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ).

والسلام على المجاهدين في كل مكان

المكتب السياسي للحركة الاسلامية

في

كردستان العراق

ئامادەیی ڕەوتی ئیسلامیی تایبەت نییە بە گۆڕەپانی کوردستان، بەڵکو ئەو دیاردەیە کۆمەڵگە ئیسلامییەکانی تێپەڕاندووەو تەواوی جیهانی گرتۆتەوە، لە سەرانسەری جیهاندا دەیان زانکۆو پەیمانگاو دامەزراوەی ئەکادیمی گرنگی تایبەت بەو دیاردەیە دەدەن‌و توێژینەوەی لەبارەوە دەکەن، بەڵام لە کوردستان تا ئێستا گرنگی بەو دیاردەیە نەدراوە، دامەزراوەی ئەکادیمی تایبەت بەو بوارە نەکراوەتەوە، توێژینەوەی بابەتیی‌و زانستیی لەبارەوە ئەنجامنەدراوە، ئەمەش ئەوە دەخوازێت ناوەندە زانستییەکان چیدی ئەو بوارە پشتگوێ نەخەن‌و ئاوڕی لێبدەنەوە، ئەم توێژینەوە هەوڵێکە لەو بوارەدا، تێیدا بە پشتبەستن بە دەیان بەڵگەنامەو سەرچاوەو دواندنی کەسایەتییە ئیسلامییەکان لە نزیکەوە، باس لە قۆناغێکی هەستیاری مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی دەکات‌و دەگونجێت بکرێتە سەرەتایەك بۆ ئاوڕدانەوە لەو بوارە.

